# كاروان

گۆڤارێكی ڕۆشنبیریی مانگانەیە ئەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان بە زمانی كوردیی و عەرەبی دەری دەكا .

سەرنووسەر
محمدامین محمد أحمد

جێگری سەرنووسەر:
حسین رشوانی

٦٩
تشرینی یەكەم و دووەمی
١٩٨٨
ساڵی حەوتەم

ئەدرەس
هەولێر : ئەمیندارێتیی
گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری « كاروان » : ٢٠٨٨٢

نرخی « ٤٠٠ » فلسە

لەم ژمارەیەدا



لەكتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە ، ٤٨٣ ، ی ساڵی ١٩٨٢ ی دراوەتێ .

لە چاپخانەی ، دار الحریة للطباعة ، چاپكراوە

لەیادی نەمراندا



# شێخ مەحموودی حەفید

## قارەمانێکی بە وەفاو جگەر سۆز بوو

● لەتیف بەرزنجی ●

● تێبینی :

١ـ لەبەر ئەوەی لە ژمارە «٢٦»ی گۆڤاری «کاروان»ی ساڵی «١٩٨٤»دا لە وتارێکی دیکەدا بە دوورو درێژی دەربارەی شێخ مەحموودی نەمرو شۆڕشەکانی دواین ، بۆیە بە پێویستمان نەزانی لەم وتارەماندا دووبارەی بکەینەوە ، چونکە ئەمجارەیان تەنها مەبەستمان یادکردنەوەی شێخی نەمرە و بەس .

٢ـ هەربەم بۆنەیەشەوە بەهەموو لایەکی ڕادەگەیەنم ، کە باسێکی دوورو درێژم دەربارەی شێخ مەحموودی حەفید ئامادەکردووە بەنیازی ئەوەی لە دەرفەتێکی نزیکدا لە دووتوێی بەرگی کتێبێکدا بڵاوی بکەمەوە ، جا بۆ ئەوەی کتێبەکە بە شێوەیەکی تێروتەسەل بکەوێتە بەردەستی خوێنەرانەوە ، وای بەچاك دەزانم هەموو ئەو کەسانەی زانیاریو بابەتی مێژووییان دەربارەی شێخی نەمر لا پارێزراوەو مەبەستیانە لەم بوارەدا خزمەتێك بە مێژووی گەل و نەتەوەکەیان بکەن ، خوشحاڵ دەبم گەر بەهۆی گۆڤاری «کاروان»ەوە بۆمی بنێرن ، تاوەکو بە هاوکاری هەموو لایەك بتوانین ئەم پڕۆژەیە بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدەین و ، پێشەکیش سوپاسی هەموو هەوڵێکی دڵسۆزانەی ئەو کەسانە دەکەین ، کە بەدەنگمانەوە دێن ..

لەتیف

پێشەوای گەلی کورد ، مەلیك و سەرداری کوردستان ، « شێخ مەحموودی حەفید » کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی کاکە ئەحمەدی شێخی سلێمانی‌یە . دایکیشی « ئامینە خان » ە ، کچی شێخ بابە ڕەسوڵە . .

شێخی نەمر لە گەڕەکی « کانی ئاسکان » ی شاری سلێمانی ، شاری هەڵەت و قوربانی‌یەوە هاتۆتە دونیا . هەر لە تەمەنی منداڵی دا زور ژیرو ئازاو وورد بووە ، وەك زوربەی زاناو ڕەوشەنبیرانی کورد لە مزگەوت خوێندوویەتی ، بە تایبەتیش لە

مزگەوتی گەورە ، کە قوتابخانەیەکی ئایینی ئەو سەردەم بووە و ، دەورێکی باڵای بووە لە بڵاوکردنەوەی ئایین و ڕەوشنبیری لە نێو ڕۆڵەکانی گەلی کوردا ، بۆ نموونە لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا فەقێی بۆ هاتووە و، تیایدا دەرسی ئایینیان خوێندووە و ، بوونەتە زاناو شارەزاو مەلای لێهاتوو و بەناوبانگ ، ئەم هەوارە بارەگایەکی بەناوبانگی بنەماڵەی کاکە ئەحمەدی شێخ بووە ، بەردەوامیش شوێنی پیاو چاك و زاناو ئاوارەو لێ قەوماوان بووە ، لە نێو دڵی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانیشدا شوێنی شیاوو پیرۆزی خۆی بووە .

گومان لەوەدا نی‌یە کە بنەماڵەی کاکە ئەحمەد هەمیشە مایەی ڕێزو خۆشەویستی بوونەو ، بە چاوی گەورەیی و سەرداری کوردستان سەیر کراون ، چونکە لە مەیدانی کوردایەتی و ، لەبواری خەبات و تێکۆشان و زانیاری دا ئەوەی بۆیان کرابێ کردوویانەو ، دریغیان نەکردووە . لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی گەلی عیراق و کوردیشدا قوربانی‌ی زۆریان داوە . ئەوەتا پێشەوای نەبەزی کورد ، شێخ مەحموودی حەفید ، بۆتە میوانی بەندیخانەو ، ڕووبەڕووی دەربەدەری و ، شاخ و کێوو ، ئاوارەیی وولاتان و ، دەست بەسەری بۆتەوە ، ئازارو ڕۆژی ڕەش و خەم و پەژارەی زۆری دیووە .

دژی دوژمنان و داگیرکەرانی وولات بێ سڵەمینەوە تێکۆشاوە ، تاوەکو لە ساڵی « ١٩١٩ » ی ـ ز دا لە شەڕی بەناوبانگی دەربەندی بازیاندا کە تیایدا ڕووبەڕووی سوپای ئینگلیزە داگیرکەرەکان بۆتەوەو ، لە ئەنجامدا لە پاڵ « بەردە قارەمان » بە برینداری کەوتۆتە دەست لە شکری ئینگلیزەوە .

● بەردە قارەمان ●

بەردە . قارەمان لای کورد پیرۆزە
لانەی پێشەوای ئەم گەل و هۆزە
بۆیە لاوانی ئەم دەورو بەرە
ئاهەنگ دەگێڕن لای ئەم سەنگەرە

●★●★●

ئیتر کار بەدەستانی سوپای ئینگلیز دوای ئەوەی شێخ دەستگیر دەکەن بەپەلەو بە برینداری ڕەوانەی نەخۆشخانەی بەغدای دەکەن ، بەڵام دوای ئەوەی چاك دەبێتەوەو ، لە نەخۆشخانە دەردەچێ حەواڵەی مەحکەمەی عورفی دەکەن و ،

● پێشەوای کورد شێخ مەحموودی نەمر لە ساڵی ١٩٢٢ لەکاتی حوکمدارێتی شاری سلێمانی .



● سالی /١٩٤٨ ـز ، ئلوایی داریکەلی
١ـ شێخ طاهری هەڵەبجەیی .
٢ـ شێخ مەحموودی حەفید .
٣ـ شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما .
٤ـ کاك سەیدی هەڵەبجەیی .

مەحکەمەیش فەرمانی لە سێدارەدانی دەدات ؛ پاش ماوەیەك ئینگلیزەکان حوکمەکەی دەگۆڕن و ڕەوانەی بەندیخانەی هیندستانی دەکەن ، ئیتر تا سالّی ١٩٢٢ لەوێ دەمێنێتەوە . هەر لەو بەندیخانەیەدا لەگەڵ « شێخ حەمە غەریبی قازانقایەیی » دادەبێ کە ئەویش «٥» ساڵ حوکم دراوە . لەوە بەدوا لە هیندستانەوە ڕەوانەی « کوێت » یان دەکەن و ، بۆ ماوەی شەش مانگیش لەوی دا دەست بەسەر دەبن .
پاش ئەو ماوەیە گەڕاونەتەوە بەغدا ، لە بەغداش ڕەوانەی کوردستان کراونەتەوە ، هەر لەگەڵ گەڕانەوەیشیاندا کۆمەڵ کۆمەڵ شۆرە سواران پیشوازی یان لە سەرۆك « حوکمداری » کوردستان کردووە و ، تاوەکو گەیشتوونەتەوە شاری سلێمانی :

لە ١٤ ی ئەیلوولی سالّی ١٩٢٢ دا دووبارە شێخ کراوەتەوە بە حوکمداری وولات تاوەکو سالّی ١٩٢٤ لە شاری سلێمانیدا فەرمانڕەوایی کردووە ؛ بەلّام لە سالّی ١٩٢٤ دا جارێکی دیکە لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیز نەگونجاوەو نیوانیان تێك چۆتەوەو ، دووبارە شەڕو شۆر هەڵگیرساوەتەوەو شاری سلێمانی یان چۆڵ کردووە بەرەو دۆڵی سووورداش وکەژو کێوەکانی ڕۆیشتوون .

وەکو ئاشکرایە شێخ مەحموودی نەمرو ، سوپای کورد تاوەکو سالّی ١٩٣١ بەردەوام لە سەر سنووورو ناوچە شاخاوی یەکانی نیشتماندا خەریکی جمو جووڵ و شەڕی پارتیزانی بوونەو ، لەو ساڵە بەدوا شێخ و سوپاکەی بەرەو ناوچەی قەرەداغ وگەرمیان ڕۆیشتوون و ، بۆ ماوەیەك لە بناری « گل » و دەوروبەری « قادر کەرەم »و« خورماتو » ماونەتەوە ، تاوەکو شەڕی ئاوباریك بەرپا بووە .

● ئاوباریك ●

لە شکری کورد ، هێزی گەرمیان
لە ئاوباریك هاتنە مەیدان
لەگەڵ شێخدا ، وەك پاڵەوان
مەرگیان بۆ دوژمن ئەباران

دوا بە دوای ئەو شەڕە گەورەیە حکومەتی ئەوسا دان بەوەدا دەنێ کە جولانەوەکە بە ئاسانی کۆتایی نایەت و ، شۆرشەکەیش نابڕێتەوە ، بۆیە بە ناچاری دەکەوێتە هەوڵدان بۆ ئەوەی کۆتایی بە گیرو گرفتەکان بهێنێ و ، بەڵێنی ئەوەیش دەدا کە دان بە مافی نەتەوایەتی گەلی کوردلە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عیراقدا بنێ ؛ بەلّام بە پێچەوانەی بەڵێنەکەی دەوڵەت ، هەر دوای گەڕانەوەی شێخ و سوپاکەی بۆ ناوچەی سلێمانی و دێهاتەکانی ، کاربەدەستانی ئەوسا دەکەونە پیلان نانەوە دژی شێخ و ناودارانی کورد ، لە ئەنجامدا شێخی پێشەوا دەگرن و ، ڕەوانەی « ناصریە »ی دەکەن ، دوای ئەوەی ماوەیەك لەوێ بەسەر دەبا ، دەی گەڕێننەوە بۆ بەغدا ، ئیتر تاوەکو سالّی ١٩٤١ لە گەڕەکی « راغبە خاتوون » جێگیر دەبێ ، زۆری پێناچێ و هەر لەو ساڵەدا شەڕی « ڕەشید عالی گەیلانی » هەڵدەگیرسێ ، شێخیش ئەو هەلە لە دەست خۆی نادا و لەگەڵ « فەقێ عەزیز » ی جافی میکائیلی بەغدا جێ دێڵن و ، ڕوو دەکەنە شاری « کفری » و ، لەوێ دەچنە ماڵی « سەید عومەر ئاغا » ، کە پیاوێکی ناودارو ، دۆستی شێخ دەبێ ؛ لەوێشەوە دەچنە ماڵی « ابراهیم خانی دەلۆ » ، ئینجا ڕوو دەکەنە نێو تیرەی « ڕوغزایی جاف » و ، لە ماڵی « عەزیزی سلێمانی » دا دادەبەزن .

دوای ئەوەی دەسەلّات دارانی میری هەواڵی ڕزگار بوونی « شێخ » یان پێ دەگا ، هێزێکی پۆلیس بە سەرۆکایەتی « جارالله » ناوێك دەنێرن ، بۆ ئەوەی بیانگرن ، ئەو هێزە دەچنە دێی «تەپە گەڕوس» و ، لەوێ تووشیان بە تووشی شێخ دەبێ ، شێخ بە چەکدارەکانی خۆی دەڵێ : « **پۆلیس مەکوژن ؛ بەلّام ئەگەر هێرشیان هێنایە سەرمان ، ئەسپەکانیان بکوژن** » . ئیتر لەو دێیەدا دەبێتە تەقەو شەڕێکی بچووك ڕوو دەدات ؛

بەلّام لەبەر ئەوەی ژمارەی پۆلیسەکان کەم دەبێ ـ یەك مەفرەزە ـ دەبن ، لە ئەنجامدا سێ ئەسپ دەکوژرێن و ، پۆلیسێکیش زامدار دەبێ ، ئیتر مەفرەزەکە بە شکاوی بەرەو کفری دەگەڕێتەوە ..
دوای ئەو کورتە شەڕە شێخ و چەکدارەکانی دەچنە دێی « بانی مورد » ی شێخ مستەفای شێخ عەبدولقادری گوللە نەبڕ ، جا هەرکە دانیشتوانی ئەو دێهاتانەی دەوروبەر بە گەڕانەوەی شێخ دەزانن ، پەیتا پەیتا سوارو چەکداری ئەو



ناوچانـەی لێ کۆدەبنەوە ، لەوێشەوە بەرەو ناوچەی قەرەداغ بەرێ دەکەون ، لەو کاتەدا دەوڵەتیش لەشکرێکی زۆر ئامادە دەکـاو ، برووسکـەیەکیان بۆ دەنێرێ تاوەکو پەنا بەرنەوە بەر میری ، بەڵام شێـخ بەم رەفتـارە رازی نابێ‌و ، نامـەیەك بۆ « متصرف » ی « سلێمانی و ، کەرکوك » ی ئەوسەردەم دەنێرێ‌و پێ‌ی رادەگـەیەنێ کە ئەو شەری ناوێ بەڵکو بە ئاواتەوەیە خۆی‌و رۆڵەکانی نەتەوەکەی بە ئاشتی و هێمنی‌و دوور لە شەر، شۆرو ، گیروگرفت و سەر ئێشە لە شوێنی خۆیاندا دانیشن و خەریکی کشتوکاڵ بن و ، سەرۆکیش واتە شێخ مەحموود ـ دێی « داری کەلی » دەستنیشان دەکا بۆ دانیشتنی خۆی ؛ لە نامەکەشیدا بەتوندی هەرەشە لە کاربەدەستانی دوڵەتی ئەوسا دەکـاو ، پێـیان رادەگـەیەنێ و ، دەڵێ :« **ئەگەر وازمان لێ نەهێنن و هێرشمان بۆ بێنن ، ئەوا ناچارین شەری مان و نەمـانتـان لەگـەڵدا بکەین و ، بەڵێنیش بە گەلی خۆمان دەدەین و پشت ئەستـوورین بە رۆڵە دڵسـۆزەکانی بۆ پاراستنی خاك و نیشتمـان دژی ئێوەی داگیرکەر ، تاکو مردنیش هەرگیز لە خەبات و تێکۆشان دابێن** » .

دوا بەدوای ئەم یاداشتـەی شێخی نەمـر دەوڵەت لە هێریش بردن دەوەستێ و ، وازیـان لێ دەهێنێ و ئەوانیش لە ئاوایی « داری کەلی » لە ناوچەی بازیان دادەنیشن تاوەکو ساڵی ١٩٥٦ ، بەڵام لەوسـاڵەدا شێخ تووشی نەخۆشی دەبێ و ، بۆ شاری بەغدای دەبەن ، بۆ نەخۆشخانەی « حەیدەری » ، ئیتر مەرگ لەوەزیاتر مۆڵەتی نادا و ، لەشەوی « ٩/١٠/١٩٥٦» دا کۆچی دوایی دەکـاو ، تەرمـە پیرۆزەکەی بۆ شاری سلێمانی دەهێننـەوە ، ئەم کۆستـە مەزنەی گەلی کورد لەسەرتا سەری کوردستاندا دەنگ دەداتەوەو ، لە هەموو شارو دێهاتەکانەوە خەڵکی بە ئاڵای رەش و بە دڵی پر غەمەوە بەرەو شاری سلێمانی بەرێ دەکـەون ، بۆ ئەوەی پێشوازی تەرمە پیرۆزەکەی شێخ مەحموودی هەمیشە زیندوو بکەن و ، بۆ دواجار ماڵ ئاوایی لەو پێشەوا مەزنە بکەن و ، تەرمەکەیشی بە خاکی پاکی نیشتمان بسپێرن .

● **بازیان** ●

**بازیـان رەشـپـۆشـە ، تەمـە بەجـارێ**
**لە ـ داری کەلی ـ هەر خەم ئەبـارێ**
**کورد لە شیـوەنـە ، دێـهـات و شاری**
**بۆ شێـخـی نەمـر ؛ ئاقـە شاسـواری**

شێخ مەحموودی نەمر ، چوار برای هەبووە ، ئەمری خوایان کردووە ، کە ئەمانەن :

**١ـ شێخ محەمەد.** **٣ـ شێخ ئەحمەد.**
**٢ـ شێخ قادر.** **٤ـ سەید برایم.**

منداڵەکانی شێخیش ئەمانەن :

**١ـ شێخ رەئووف.** **٣ـ شێخ لەتیف.**
**٢ـ شێخ بابە عەلی.** **٤ـ حەلاوەخان.**

لەمنـداڵەکانی شێخی نەمر ئێستا تەنها ئەم دوو زاتە ماون :

١ـ شێخ بابە عەلی .
٢ـ حەلاوەخان .

دەبێ ئەوەیشمان لەبیر نەچێ کە شێخ بابە عەلی ئێستا لەشاری «لەندەن» دادەنیشێ‌و ، پیاوێکی تابڵێ‌ی زاناو ژیرو شارەزاو لێوەشاوەیە .

گۆری ئەو مرۆڤـە ناودارو مەزنـە ئێستـا لە بارەگـای « کاکە ئەحمەدی شێخ » ە ، لە شاری سلێمانی دا ..

بەم جۆرە ئەم قارەمانەی گەلی کورد ماڵ ئاوایی لەگەل و نیشتمان کردو ، هەموو هیواو ئاواتەکانی بردە ژێر گڵ ؛ بەڵام تاوەکو گەلی کورد بمێنێ ئەم قارەمانە جگەر سۆزە هەر زیندوو دەبێ و ، هەرگیز لەبیر ناچێتەوە ..

● **سەرچاوە :**

**بۆ نووسینی ئەم باسـە سوودم لەم پیـاوە ناودارو شارەزایـانـە وەرگرتووە :**
**١ـ شێخ عبدالکریم ، ی دارە خورما .**
**٢ـ ، شێخ حسێن ، ی خانەقا.**
**٣ـ ، شێخ شەهاب ، ی خاوێ .**
**٤ـ ، شێخ سمایل شێخ عبدالکریم ، ی قادر کەرەم .**
**٥ـ ، شێخ مستەفا ، ی قەڵبەزە.**
**٦ـ ، شێخ عبدالقادر ، ی هەشەزینی .**
**٧ـ ، شێخ محي الدین ، ی هەولێر .**




# مه سه‌یدایێ هشیار وه‌نداکر

**به‌رهه‌ڤکرنا [ عبدالسلام علي ميرزا ]**

ئه‌گه‌ر ئه‌م بێن و پچه‌كێ رووپه‌لێن رۆژناما رۆژا نوو ١٩٤٣ ـ ١٩٤٦و كۆڤارێن ستێر ١٩٤٣، هاوار ١٩٣٢ ـ ١٩٤٥و رۆناهی ١٩٤٢ ـ ١٩٤٥ . یێن كو بنه‌مالا به‌درخان پاشایێ جزیرا بۆتا ل بێرووتێو شامێ ده‌ردئێخستن . دێ ناڤێ گه‌له‌ك نڤیسكارو هۆزانڤانێن شه‌هسوار، هه‌لكه‌فتیو گران بها تێده بینن ، مینا سه‌بری سه‌رهه‌دی، عه‌بدولهادی محه‌مه‌د، براهیمێ مه‌تینی، بشارێ سه‌گمان، ئیحسان نووری پاشا، ئه‌حمه‌د نامی، ئلهو بێدوهی، سالح ره‌شید، سمائینێ سه‌رحه‌دی....هود ،ب ده‌ها گۆتارو هۆزان یێن د وان دا وه‌شاندین، ئه‌و هه‌می به‌لگه‌نه‌و شاهدن ژبۆ شه‌هره‌زاییو زانینا وان یا موكم . ئه‌ڤ نڤیسكارو هۆزانڤان ئه‌و بوون یێن د ده‌ستپێكا ژیانا ره‌وشنبیریا كوردان ده رۆله‌كی مه‌زن لستی بوون . به‌لێ هزار جار حه‌یف و مخابن ناڤ و ده‌نگی گه‌له‌ك ژ وان یێ مایی دبن تاری و تاریستانێ، كێم جارا تێن هزرو بیرێن گه‌لێ مه، ل سه‌ر ده‌ڤێ نڤیسه‌ڤان و زانه‌یێن مه . به‌رهه‌مێن وان یێن كو ژیانا خوه هه‌موو ترخان كربوون ژ بۆ نڤیساندنا وان ، یێ هاتیه ونداكرن و بزر بوون،به‌لێ ئه‌م هێڤیدارن دێ ئه‌و رۆژ بێ، مێرخاسێن مله‌تێ مه دێ رابن ب كۆمكرن و به‌لاڤكرنا به‌رهه‌مێن وان ، دێ وان دنه ناسین بۆ هه‌موو جهانێ .

وماموستا مه‌لا حه‌سه‌نێ هشیار ئێكه ژ ڤان به‌ركه‌تیا، یێ ناڤ و ده‌نگێ وی كێم كه‌سا ژ مه بهستیه .

مامۆستێ تێكۆشه‌رو مێرخاس ، هشیارو بیره‌وه‌ر مه‌لا حه‌سه‌نێ كوردی [هشیار]د ١٤ێ مه‌ها ئیلۆنا ١٩٨٥ ئان ده‌ل كوردستانا سووریێ ﴿٧٨ سالیا خوه ده چاڤێن خوه گرت و ژ ناڤ مه باركر، چوو ل سه‌ر حه‌قیا خوه . م حه‌سه‌نێ كوردی د گۆرستانا [[ دوگر ]] ده هاته ڤه‌شارتن [ دوگرد ناڤبه‌را قامشلیو تربه‌سپیێ ده‌جهه‌كێ موقه‌ده‌سه . شۆره‌شگه‌رێر كو ژ وه‌لاتێ خوه ب دوور كه‌تنه پری جاران ل ورتێنه ڤه‌شارتن ].

ستێركه‌كه كوردو كوردانیێ ژ ئه‌سمانێ كوردستانێ خورجی . ب مرنا سه‌یداییمه ئه‌م گه‌له‌كی خه‌مگین و دل ب كولن . كوردستانێ لاوه‌كێ خوه یێ رۆناكبیرو قه‌له‌م شۆر وه‌نداكر . ئه‌و یه‌ك ژ رێبه‌رو پۆشاوایێ خه‌باتا رزگاریخوازێ گه‌لی كورد بوو، بێوه‌خت و ڤێن پۆلا بوو، ئه‌و دلاشێ كوردانییێ ده له‌باته‌ك بوو . خوه توجاری ژوارێ خه‌باتا كورد وكوردستانێ نه‌ددا ئالی، تم ل ره‌فێن پێش بوو . هشیار ژ بۆنا دۆزا كوردستانێ گه‌له‌ك ئێش و جه‌فا كشاندبوو، دیتبوو، ژیابووو له‌ورا ژ دزانی بوو، گه‌ر كورد ده‌ست نه‌ده‌ن هه‌ڤ، نه‌بن یه‌ك وجوود، زاناو خوه‌ندا نه‌بن، دێ هه‌ر تێكبچن ، بته‌رپلن، ببن مه‌شكا ده‌ستێن نه‌یاراو هه‌ر وه‌ها ژی ژارو بنده‌ست بمینن .

سه‌یدا بریارا خوه دابوو كو ب شێوه‌یه‌كی خه‌باتێ یێ نوو، ئانكۆ ب نڤیساندنێ، سه‌ر پێهاتنێن خوه، ژیان و دیرۆكا كوردستانێ ته‌ڤی به‌لگه‌و وێنه ژ نڤشێن داهاتووره دیاری به‌رده‌دا كو ئه‌و ژ ڤان فێرینا بده‌رخینن و نه‌كه‌ڤن ناڤ ڤێ

سەرگێژی و گەرمولا لەو ئەم ئیرۆ تێدە دژین .[1]

## ● ژیانا هشیار ●

**سەیدا سالا ١٩٠٧ ئان دە ل گوندێ سەرێ [ دناڤبەرا هێنەو لیچە ـ کوردستانا ترکی‌یی ] ژ دایکا خوە بوویە . سەردێ گوندەکێ پر جوانە ، ب ئاف و باخچەیە . سەرەکانیا رۆباری** دجلێ ژ باکورێ وی دەرتێ ژ بن چیایێ برقەلینێ .

دەما شۆرەشا شێخ سەعیدێ پیران ل سالا ١٩٢٥ ئان دە دەست پێکر ئەو خۆرت بوو . هشیارێ کورد ب چەکداری بەشداری تەڤگەرا شێخ سەعید دبوو . د سالا ١٩٢٧ ئان دە هێسیر [ دیل ] دکەڤە دەستێ ترکان . د [[مەحکەمێن ئستقلالێ ]] دە حکم ددنێ و وی سرگوونی باژارێ نگدەیێ Niĝdeyê باژارەکی ترکان دکن .

سەیدا دسالا ١٩٢٨ ئان دە ب دەرخستنا عەفویا گشتی تێ بەردان و ڤەدگەرێ کوردستانێ جهدە خوە دگەهینە شۆرەشا ئاگری [ئارارات ] و دناڤ هێزێن وەلاتپارێزدە دیسان ب چەکداری هەمبەری کۆلۆنیا لیستێن ترک دتێکۆشە . پەی تێکچوونا سەری ـ هلدانا ئاگری دەرباسی کوردستانا سووریێ دبە .

سەیدا زەوجی‌و باڤێ [ سێ زدەە ] زاروان بوو ، پێنج لاو و هەشت کەچێن وی هەبوون . لێ هەموو گریفتارێن ژیانێ نەدکاری بوون . زۆرا ئارمانجا سەیدا ئانشتمانپەروەری ببرانا . سەیدا خەباتا کوردو کوردستانێ دسەر هەر تشتی‌رە دگرت ، شەڤ و رۆژێن خوە ، رەحەتیا جانێ خوەو مالباتا خوە د دۆزا کورستانێ دە فەدا کری‌بوو . مالباتا وی بوو بوو دوجی ، هن زارۆیێن وی ل سەر ـ خەتێ [ کوردستانا ترکیێ] و ئێن مایی ل بن ـ خەتێ

[ کوردستانا سووریێ ] دژیان . سەیدا چارەسەرکرنا پێسیرتەنگی و گەلشەیێن خوەد رزگاریا کوردستانێ دە ددیت . لەورا ژی دگۆت

١

[[ هەتا کوردستانا مە بندەست بە ، دل شاهی‌و رەحەتیامە دێ نینبە ]] هێڤی دکر کو رۆژەکی ڤەگەرە وارێ باف و کالێن خوە . لێ سەد جار مخابن ئەڤ داخوازاها ب سەیدا چووگۆرێ [2] .

## ●خەباتێن وی ●

مەلا حەسەنێ کوردی دژیانا خوەدا ژ بۆ دۆزا کوردستانێ خەباتەکە هێژا کر . ئەو وەك هەموو رۆناکبیرو وەلاتپارێزێن کورد ئێن وی دەمی ئەندامێ رێخستنا [[ خۆیبوون]] ئێو دناڤ گەلێ وەلاتپارێزێن کوردە ب رێخستنی د خەبتیان . سەیدا ل سەر زمان ، چاند ، دیرۆك و جوغرافیا کووردستانێ ژی خەباتێن هێژا دکرن ، دکۆڤارا هاوار ، رۆناهی ، چیا ، رۆناهی یا بەغداو رۆژناما رۆژانوو دە پر نڤیس و هەلبەستێن وی دەرکەت . دکۆڤارا هاوارێ [3] دە [[ کوردو کوردستان ]] ،

[[ کوردستانا باکور]] ، [[ ئاڤایێ ئەوینێ ]] و درۆناهی یێ [4] دە ژ [[ تشتێن راست ، هەژمار ١٢ ، سال ١٩٤٣ ، رووپەلێ ١٧]] ، [[ بانگێ کوردان ، ە ١٣ ، ١٩٤٣ . رووپ ١٠ ]] ، [[ جڤاتا بێ دەنگ ، ە ١٤ ، ١٩٤٣ ، رووپ ١٦]] ، [[ هالان ، ە ١٦ ، ١٩٤٣ ، رووپ ٣ ]] ، [[ یێن کو دزانن ، ە ١٦ ، ١٩٤٣ ، رووپ ٣]] ، [[ جەژنا کوردان ، ە ١٦ ، ١٩٤٣ ، رووپ ١٣ ]] ، [[ عەشیرا زرکان ، ە ١٧ ، ١٩٤٣ ، رووپ ١٩ ـ ٢٠ ]] ، [[ نمیژا مشکان ، ە ٢٠ ، ١٩٤٣ ، رووپ ١٨ ]] ، [[ چەند تێدەرخستەك ، ە ٢٥ ، ١٩٤٤ ، رووپ ١٧]] ، [[ کوسی و رۆڤی ، ە ٢٦ ، ١٩٤٤ ، رووپ ٢١ ]] . و درۆژناما رۆژا [5] نوودە [[ پیرۆزنامە ، ە ١٠،١٩٤٣ ، رووپ ٢ ]] ، [[ پەرگالا رۆژا نوو ، ە ١٠ ، ١٩٤٣ ، رووپ ٢ ]] ، [[ کوردستان ـ یەکتیا کوردان چی‌یەو ب چ پێك تێ ، ە ٤٨ ، ١٩٤٤ ، رووپ ١ ]] . و دگۆڤارا رۆناهی یا بەغدادە [[ ملەتم رابە بنیرە ، ە ٢، ١٩٦٠ ، رووپ ٢٩ ]] ، ...... هود . ب ناڤێ حەسەنێ هشیار نڤیساند .

سەیدا دسالێن ١٩٥٦ ـ ١٩٥٧ ئان دە کۆمەلا زانستی و ئالیکاری‌یا کوردی [6] دگەل چەند هەڤالێن خوە مینا ؛ د ٨ محەمەد نووری دەرسیمی ، رەوشەن بەدرخان ، ئەحمەد جەعفەر شەنگاری ، مام هوستە زاگرۆز ، سەگمان ، مووپێزان ل کوردستانا سووریێ دامەزراند . وار گەهێ ڤێ کومەلێ ل

**بێرووتێ بوو . وئارمانجا کۆمەلێ ئا بنگە هین ئەڤەبوون :ـ**

**١ـ رامانا کۆمەلێ :ـ**

**اـ پێکـانینـا خوەنـدەن و زانستی یی ـ زمانێ کورد پەلاندو ناسکرنا وەلاتێ کوردا ب ـ پێك ئانینا پەرگالا وانا مادەری ئا سەرمەیەو مانەوی ، پێشڤەبرن و پارزتن .**

**جـ ژ بۆنا داخوازێن ژۆرین ب هەر ئاوایی خەبات و بەلاڤکرنا نڤیساران .**

**٢ـ ئەڤ کۆمەلە جڤاتەکی ئینسانی‌یە .**

**٣ـ د گرێکـا کۆمـەلێ دە تشتـەکی سیيـاسی‌و توجاری تونە . بەرهـەمـێن ڤێ کۆمەلێ وەشاندنا دو پرتووکێن هێژاو خەباتێن فۆلکلوری بوون . پرتووکا د . محەمەد نووری دەرسیمی** [٧] **ب زمـانێ ترکی ب ناڤێ [[ کوردستان تاریخندە دەرسیم ]] کوردستان و دیرۆکا دەرسیمێ وەشاندن . پەرتووکا دن ژی ب ناڤێ [ب ریا قاچاخ چیان ] بوو و ئەڤ پرتووك ل کوردستانا ترکیێ دهاتنە بەلاڤکرن . دیسان ب ناڤێ [[ *Jenosit* ]] پرتووکە ب سێ زمانێ [ترکی ـ ئینگلیزی‌و فرانسزی ] ل سەر عەشیرا [[ جوانروو ]] [ ل کوردستانا ئیرانێ ]] هاتیە نڤیسـانـدن ، دڤێ پرتـووکێ دە هلوەشاندا جە و وارێن ڤێ عەشیرێ وقرکرنا شێنیێن وی تێتەکرن . ئەڤ پرتووك کامووران بە درخـان ل فرنسـايێ دەرخست بوو و بەلاڤکـرنـا وێ ل کوردستانێ ڤێ کۆمەلێ گرت بوو سەرخوە .**

مەلە حەسەنێ کوردی ، م . نووری دەرسیمی ، رەوشەن بەدرخان و هنێن دن ب هەڤرە ب ناڤێ [[ وژدان ]] رۆژنامەکێ دەردخن ، دوورە ناڤێ رۆژنامێ دکن [[ ئەلحوریە ]] ، ئەڤ رۆژنـامە ب ئالیکاریا رێخستنا [[ EOKA ]] ل بێرووتێ دهاتە وەشاندن [ EOKA ] رێخستنەکە قبرسی بووو ژبۆ ئازادیا قبرسێ ل دژی ئنگلیزان تێکۆشین ددان ] . دڤێ کۆڤارێ‌دە ڤاناتێ کوردۆ ود .عسمـەت شەریف وانـلی ژی نڤیس د نڤیساندن . سەیدا سالێ جارەکێ کۆڤارا [[ ئاگاهی ]] ژی دەردخست وهەتا سالا ١٩٨٥ ل سەر هەڤ ١٩ هەژمار دەرکەتن .

مەلە حەسـەنێ کوردی د ناڤا گەلێ خوە دە پر گەریا بووو دەردێ نەزانینێ‌و نەخوەندنێ باش زان بوو .د نڤیسەکێ خوەدە هشیارێ کورد وەها دبێژە : [[ گەر ئەم نەخوینن دێ عەورێن رەش و تاری، مژو دوومان هەر ل سەر ئەسمانێ کوردستانێ بن ،وئەمی رۆژێن خوەش نەبینن ،وهەر ل بن لنگێ نەیاران بن گێرك و مری . لێ دیرۆك سەرخوە ـ بوون و سەرفرازیێ دخوازن و ژبۆ پێکانینا ڤێ ئەم خوەدی دەست و لنگ ، چاڤ و گاڤن . کێماسیێن مە نەزانینا مەیە . ]]

مەلە حەسـەنێ کوردی ناڤا گەلێ کورد دە ود ئەورووپایێ هات بوو ناسکرن . شۆرەشگەرو ودلاتپارێزێن کوردو مەرڤێن پێشڤـەرووو دەمـوکـرات ئێن ئەورووپایێ وی باش دناسیان ئانترۆپۆلۆگەکی هۆلاندایی م.مارتن ڤان برونەسەن [[ Martin Van Buinessen ]] ژب ناڤـێ [[ Agha shaikh, and state ]] پرتووکەك د دەربارا تەڤگرێدانا جڤاکی‌و سیاسی ئا کوردستانێ ڤەدکۆلینەو دوێ پرتووکا خوەدە سالیخی وئاگاهداریا شۆرەشا شێخ سەعید ژ سەیدا دگرە .

مەلە حەسـەنێ کوردی ل سەر جڤاك ـ ئابۆریا گەلێ کورد پر پرتووك نڤیساندیە ، [[ ١٨ ]] پرتووکێن وی هەتانی نها ژ بەر بێ ئمکـانیـێن ئابـۆری نەهـاتنـە چاپکرن و وەشاندن . ئەم هێڤیـدارن کو رۆژەکی بەرێ پرتـووکـێن وی دەرکەڤن و ژبۆ نفشـێن پێشـەنـدە بین چاڤکانی‌و رێچە ژبۆ گەلێ مە ، وژ بۆ تێگهشتن ، ڤەکۆلین و داهووراندنا جڤاك ـ ئابۆریا گەلێ کورد بەر پێش بکە [٨] .

سەیدایێ هشیار وێ هەر تم د دلێ گەلێ کورد دە بژی‌و گەلێ کوردی وی ژ بیر نەکە .

و ئەڤـەژی دوو نمـوونـە ژ ئەفـراندنێن مەلا حەسەنێ هشیارن، زانین و شەهرەزاییێ‌یا وی تێدەتێت دیارکرن :ـ

## ● چەند تێدەرخستەك [٩] ●

گولا خوەنـدەڤـانـان ، برایێ خویـین ،مـیرزا ئۆسمان سەبری [١٠] ،ئەزبەنی ،ڤا چەند تێدەرخستەکان ژبۆنا گەشبوونا دلێتە ،ب دیاری ژ کەکێ خوەئێ دلوون رە ،پێش ـ کێش دکم . هەکە زەمان دەستوورا بەرسڤێ نەدە ژی ، داخوازو بەرسڤا من دهێلینا دلێ مەدمیە . هەکە دڤایێ چاپی ژی نەبە ، بلا دتاسا سەری‌وچاپا هەشێ مە دەبە .

د وارێ گەلپەرستی
ریا دوورو پر درێژ
ب هزاران زیڤاری
بەلەنگازیو ژاری
دستپێکا وی چی‌یە؟
پۆستێ کووزێ رەش و مار
ئەو شکەفتا هرچێ سۆر
ناتۆرێ رمزو بەستان
ئاسێگەهێ دارستان
نیچیرڤانێن ب تاژی
هاویر دۆرێن وی تژی
کارێچگەرین ل کوویە؟
ئەزو تو ئەم بوون مێڤان
ل مالا پیرێ جیهان
وارگەهێ مارو تەیران
تەگو ، کالۆ دژوارە
دلخوازو چاك هەڤالە
شارگەها تە ل کوویە؟
کەرێ پەزێ ناڤ داران
قەساب گرتن سەد بەران
جها نینە بەرف پرە
بەهارا وان باکورە .
شڤان دبێ وی خێرە
بهار تمی ل ژێرە
ئەزو شڤان وەك کێ‌یە؟
پشتی تاڤ و بارانان
گاڤا کول تێن ئەیوانان
هەرتێ دەستێن خامەگیر
دشینن پێ بەگ و میر
پرسامەو تە چی‌یە
دلخوازە تە ل کوویە .

## ● عەشیرا زرکان[11] ●

زرکان ل کوردستانا باکور دبە پێنج کەری .
زرکانێ وەلاتێ سەر هەدی ، ل باکورێ کەلا خنوسی و دنافبەرا هەزارۆمێ دمیە . ژێ رە تەکمانا ژۆرین نەحیا مەدراگێ‌یە .

ئەو بر [۲۵] گوندن و پانزدە گۆمێن بانەکی یانی جهێ پەزوجۆت. ل ڤر کارا خوێ هەیە ، ژێ رە دبێژن [ کارا ـ سپی ]. ل نیڤرۆیێ داشکەسانێ ، ب سەعەتەکی پێترۆلا گازێ هەیە

تەکمانا ژێرین : ناحیا وی سۆیلەمەزە . ئەڤ ژی گرێدایی خنووسێ‌یە ، ۳۰ گوندو ۱۵ گۆمن .

زرکانێ گۆگس : ناحیا وێ گۆگسێ‌یە ، ل باکورێ رۆژهەلاتێ خنووسێ . مەزن و سەرداریێ وان مالا [[ قولاخسی ]]یە .کەرەمی قولاخسی د شەرێ سەرخوە بوونێ دە گاڤا چو ئێرانێ عەجەمان ئەوو ۲۹ پەیایێن دن کوشتن .

### پەرگال و عادەت و هاتنێن وان :

هاتن پەزو زادو هەسپن .پەزی سەر هەدی ئێ ب ناڤ و دەنگە . داوا میو بەرانان ژبۆ کۆ هلنە قەتن قاییش دکن . کەرێن فرۆتنێ د بەحرا ـ رەش دە دەرباسی ستەنبۆلێ دکن . روونێ هەزارۆمێ تەڤایا کوردستان و ئانادولیێ تێر دکە ، بەرێ دهات شامێ ژی .
هەسب : ل سەرهەدێ ئاخلێ هەسپان وەك پەزێ کۆڤی تمی ل مێرگان دچێرن و دزێن . هەیا کۆ تاجر ژ دیاریەکریێو هن دەرێن دن تێن کرینێ .
هێـژ نوو دەرن سەرو دۆر ل وان دگرن و ل ناڤ گوندان دقەلبین . هن ب هن دگرن . تینن فرۆتنێ دگەل جانوویان .
زادو گەنم :
ئۆلجەك هەیا [ ۲۰ ـ ۲۵ ] داڤێژە .سالا کو پایزخێر زوو بکەڤە پێرە ناکهینن کوتا بکن ، گوشینێ گەنم دخن خانیان . نانێ وان گەلەکی تامدارە .

پەرگالا وان :
عەشیرتی‌یە راژێریێ سەرداری خوەنە ، تمی هەوەسکارێ شەرو پێڤچوونێنە توجاران ژرۆمیان رە بندەستی نەکشاندنەو خوە ئازا دیتنە . ژبەر کۆ رۆمیان نکاری بوو وان بن سی‌بکن ، ب سەد دەك و بەرگەر بوو بوون حەمیدی . لێ

نزانی بوون چی‌یه، دمالا خوەدە ماشێ کاپتێنان دخوارن . هنێ دن عەمری خوە ب فراری دبهارتن . پرانی‌یا سترانێن وان شەری رۆمیانە .

عادەتێن وان :
مێر شال و شەپك ، کەژی‌و کولوس و پشتێن عەجەمی‌نە . ژن ب شاهرو کوف ، فستان و خەفتان ، زێرو کەمبەرن .
سترانێن کوردی پری وان ژ سەرهەدی‌نە .بێ خوە رەقس و دیلانێ دزانن . گەچ و خورت ددەستێن هەڤ دە دلەیزن . کەچ و خورتێن سەرهەدێ بەژن درێژو چاڤ رەشن . ل وی وەلاتی قیزو خورت د ١٢ سالان دە بالق دبن .

زرکانێ دیاربەکری ئان ئەنتاخێ :
رۆهەلات و رۆئاڤا پاسوورێ هەیا هێنێ ، نیڤرۆ دەشتا دیاربەکری‌یە . درێژاهی ژپاسوورێ هەیا هێنێ [ ٦٠ ] کیلۆمێترن . تێ دە هەیە سەدگوند . چاردۆرێ وێ عەشیرێن ژێرنن :

رۆهەلات : بادیکان ، خیان ، سلێڤان.
رۆئاڤا : تێرکان و عەشیرا مێربێ [ زازانە ] .
باکور : عەشیرێن زاز . ژ رۆهەلات هەیا بگێهە رۆئاڤا ، ب زێزێڤە : کاڤار ، مەستان ، بۆتیان ، تاوس ، سەیوان .
نیڤرۆ : زرکانێ ـ هەزرۆو دەشتا دیاربەکرێ .
دئەردێ ڤێ عەشیرێ ، د نیڤرۆ باکوردە دو چیایێن درێژو بێ داوی هەنە . ناڤبەرا هەردو چیان ناڤ ـ دەشتەکە ب جۆت و جەبارەو هەوا وێ گەلەکی خوەشە .
هاتنێن وان جە . گەنم ، کونجی ، پەمبوو ، نۆك ، نیسك ، گارسێن گەورەو زەرو ستەنبولی ، کارتول ، فاسوولی ، ریز ، هەڤرمیش . پەزی وان ب پرانی بزنن .
عەشیر دتفەنگێ‌دە پر خاسووگ یانی ماهرن .هەما هەر خورت نێچیرڤان و بلوورڤانە . مەروڤێ رەشکال چەل سالی نابە کو چەند سال مەحکوومی ئان زیندان نەدیت بە . ژسواری‌و ئامانجان زەحف حەز دکن . وەرگتنا وان ژی وەك ئێن دنە . ب تەنێ مێر شەروالێ دیاربەکری ل خوە دکن .
چیایێن ڤر گەلەك ب دار شکەفت و نەوال و بانی‌و تەڤ کانی‌یە .

هەر تەور فرەکەو حەیوانێن کوڤی ل ڤر هەنە .نەمازە پەز کوڤی ، بەراز هەماوەك پزن .
چیایێن ڤر ژ هەڤکەتی‌و تیڤلن . د تەڤاییا وەلێت دە فەدایی ل ڤر کوم دبن .لەورە جهێ شەرەو هەر خوارن لێ‌پەیدا دبە . درڤستانێ دە دگەل بەرفا پر مەرۆڤ دکارە لێ بدەبرە . هنگی لات و زنارو شکەفت زەحفن . ئەم ب خوە سێ سالان تێدە دەرکەتی مانە .
دناڤ ڤێ عەشیرێ دە دو باژار هەنە : لیچێ‌و هێنێ .ئەڤ هەر دوویان ژ زرکان عەشیر ناهەسبین .ناڤێ وان ب باژارێ وان ڤەنە . ناڤێ کەڤنارە وەلاتێ ئەنتاخێ دگوتنێ .ژبەر کو نها ئەنتاخ بوویە گوندو لیچێ بوویە قەزا وەلاتێ لیچێ دبێژن .

مەزنەکی خوەسەر تێدە نینە : ریسپی دبێژن . بەرێ سەعدلا بەگێ لیچێ مەزنێ ڤان زرکان بووپشتی هاتنا عەبدرەحمان پاشایێ رۆمی ، مێر ژی بوو راژێرێ رۆم .
گوندی من ب خوە دناڤبەرا لیچێ‌و هێنێ دەگوندەکی ب ئاڤ و باخچەیە . سەرەکانیا دجلێ ژ باکورێ سە دەرتێ : ژبن چیایێ برقەلینێ . کارا خوێ ژی دبەردەیە . زرکانێن هەزرۆ :

زرکانێن هەزرۆ ل نیڤرۆیێ رۆهەلاتێ زرکانێ ئەنتاخێ‌نەو هەردو ب هەڤ ڤەنە . ب تەنێ چیایێ دێرتۆپان دناڤ وان دەیە . رۆهەلات سلێڤانە . د ناڤبەرا وان دە چەمێ سەلا ـ تێ هەیە . پشتا ڤان چیان و نیڤرۆ دەشتا دیاربەکرێ‌یە. وەلاتەکی فرەهو جهێ زادو بخوەدی کرنا پەزو دەوێرە . چیایێن وی تەڤ دەرەزو فەکی‌نە . دەشتا وان تەڤ دە مەدرەبێن پرنجی‌نە .دەڤێن چەمان مەخەلێن گامێشانن . پەزێ وان هەمی مهێن گەورو چاڤ رەشن .

پێنجی گوند هەنە . ب جارەکی عەشیرن . راژێرێ مالا رەجەب بەگێ‌نە ، مالەکە زەحف مەزن و کێرهاتی‌یە . هەرزۆ ب خوە ناحیەیە. ژهەرزوییێ بەرب نیڤرۆ دەشتا دیاربەکری‌یە .

پەرگالا دەشتێ :
دەشتێ دەعەشیرەکە خوەنان نینە . تەڤاییا گوندان یێن خەلکێ دیار بەکرێ نە . ب پرانی گوندێن مالا جەمیل پاشانە . ئێن دن هەر چەند گوند یێن هنانن .

جوغرافیا ڤی وەلاتی :

هەر وەکی مەگۆت باکور چیاو نیڤرۆ چیایە ئەڤ هەردو چیا رۆهەلات و رۆئاڤاقە بێ بەلکەت درێژن . ژ بەر ڤێ یەکێ ناڤەکی خوەسەر لێ نەهاتیە کرن .

چیایێ باکور تشتێ کۆ من دی ژ چیایێ تالۆرکێ . گەلیێ گوزان و قەزما مووشێ بەر ب رۆئاڤێ تێ چیایێ کاڤارێو بەرقەلین ، کانیا دجلێ دەرباسی چیایێ نێربێو ئەرغەنێو مادەن وکێزینا بنێ خاربیتێو کەمرخان بەر ب پرا هێزول و فەرات ومەلەتیێ . قەنج نایەتە بیرا من ، لێ باوەر بکن چیایێ حەکیمانێ ژی پێڤەیە .

چیایێ نیڤرۆ : رۆهەلات ژپرا باتمانێ، یانی پێنج سەعەت رۆهەلاتێ فەرقینێ دەرتێو ب رۆئاڤا ڤەدورو درێژ دبە ، ژپرا باتمانێ تێ چیایێ پشتا فارقینێ . ژێرە دبێژن چیایێ نارکێ ئان مقورێو دەرێ ـ کور نەقەبەکە گەلەك ئاسیە ئەڤ چیاتێ تخووبێن زرك و سلیڤان و تێ چیایێ دێرتۆپانێ ، باکورێ هەزرۆیێو ژێ تێ دەداش و ئەیندارێ . چیایێ محەمەدیان دکەڤە چەمێ ئەنبارێو چیایێ تێرکان و چیایێ باسراڤێ ، نیڤرۆیێ پیرانێو چیایێ ئەگل و ئەرغەنێو پرا قەلەندەران . دیسا تەڤی چیایێمە گۆتیە باکور دبە ،یانی چیایێ مانێ .

ئەردێ وێ ناڤ دەشتەکە . گوندێن ئاڤێ گەلەکن . گوندین ب ئاش و مەدرەب سارم . گرێ دادمێ ، سسی ، دابلۆ ، خوێلین ، جومەلاش، هێنێ ، لیچێ ، سەردی .

ژ تەڤان چاڤێن هێنێو سەردێ مەزنن .ژ قاوین وڤێکێن ڤان هەردو قەسەبان ل کوردستانا زۆر ب ناڤ و دەنگن .

چەمێ ئەنبەرێ ، سەرچاڤیا وێ ژ هێنێو سەردێ یە ئەڤ چەم چیایێ میرۆ دقەتینەو دکەڤە دەشتا دیاربەکرێ . بێقەدەر مەدرەبێن برنجێ ل بەر ڤێ ئاڤێ هەنە .

## مەسەلا گاوەستیان :

ب ڤێ هنجەتێ من ژی خوەست چەند پرسان ل سەر مەسەلا گاوەستیان ببێژم .

مەسەلا گاوەستیان دکوردستانێدە پرسەکە درستە . لێ بەلێ نەب تەنێ ب ڤی ئاوایی بوونە کەری . هن گاوەستیایێ کۆچێنە . لێ هنێن دن راژێریا رۆمیان قەبوول نەکریەو ل بەر وان رابوونە . ب سەتما لەشکەرەکی پر ژ هەڤ دەکەتنە ؛ بوونە فەرمانلوو . ئان د درێژاهیا زەمانان دە زێدە بوونەو ژهەڤ جهێ بوونە . هەر کورد ل با خوە ئان د عەشیران د مالباتا خوەدە کۆ ژ مالەکە کەڤنارە خەلکێ وێ مالێ ب رێڤا بوونە بوونە دە ە مال .

زرکانی ژێرو ژور درەخ هەڤ دە دژین .ئەڤ زێداهیێن هەڤن . ئێن دوور گاوەستینە .

•

ژێدەرو فەروز :ـ

١ـ هێڤی ، کۆڤارا چاندی ـ گشتی ، هەژمارا ٥ ، گۆلان ، ١٩٨٦. رووپەلێ ١٦ .ژ وەشانێن ئەنستیتویا کوردی ل پاریسی .
٢ـ هەر ئەو ژێدەر .رووپەلێن ١٦ ـ ١٧ .
٣ـ مخابن مەنکاری بوو هەموو هەژمارێن کۆڤارا هاوارێ ب دەست خوە بێخن .
٤ـ کۆڤارا رۆناهی [ ١٩٤٢ ـ ١٩٤٥ ] ، [ بەرهەڤوك ] ، چاپخانا ژینا نوو ، سوێد ، ئۆپسالا ١٩٨٥ .
یا هەژی گۆتنێیە کو هەموو هەژمارێن کۆڤارا [[ رۆناهی ]]یێ یێن دڤێ بەرهەڤوکێدە هاتنە بەلاڤکرن . بنێرە کۆڤارا کاروان ، هەژمار ٥٧ ، تەمووزی ١٩٨٧ .رووپەلێن ٧٥ ـ ٨٠ .
٥ـ رۆژناما رۆژا نوو [ ١٩٤٣ ـ ١٩٤٦ ] ، [ بەرهەڤوك ] وەشانێن ژینا نوو ، چاپا یەکەم ، سوێد ، ئۆپسالا ١٩٨٦ .
یا ژ هەژی گۆتنێیە کو ئەم جارەکا دن بێژن کو هەموو هەژمارێن ڤێ رۆژنامێ یێن دڤێ بەرهەڤوکێ دەهاتنە وەشاندن .
٦ـ رێ ئۆلا [ منهاج ] کۆمەلا زانستێو ئالیکارییا کورد ، ١ـ٥ـ١٩٥٦ ،چاپخانا ؟ . رووپەلێن ٤ ـ ٥ .
D.M Nuri Dersim , Kurdistan Tarihinde Dersim , Halap 342S. ـV
ژبوو چێتر زانینا ژیان و خەباتا د . محەمەد نووری دەرسیمی . بنێرە کۆڤارا کاروان ، هەژمار ٣٧ ، تشرینی یەکەم ـ١٩٨٥ـ رووپەلێن ١٢٠ ـ ١٢٢ .
٨ـ کۆڤارا هێڤی ، ژێدەری ب ناڤ کری ، رووپ ١٧ ـ ١٨ .
٩ـ کۆڤارا رۆناهی [ شام ] ، هەژمار ٢٥، سال ١٩٤٤ ، رووپ ١٧ .
١٠ـ ئۆسمان سەبری هۆزانڤان و نڤیسکاری ب ناڤ و دەنگێ کورد ل سالا ١٩٠٥ ل کوردستانا ترکیێ دە ژ دایك بوویە بنێرە بروفیسۆر قاناتێ کوردو ، تاریخا ئەدەبیەتا کوردی ـ١ـ چاپخانا رۆژا نوو ، سوێد ، ستۆکهۆلم ١٩٨٣ .رووپەلێن ١٦٦ ـ ١٧٦ .
١١ـ کۆڤارا رۆناهی [ شام ] ، هەژمار ١٧ ٨سال ١٩٤٣ ، رووپەلێن ١٩ ـ ٢٠ .

# له فەرهەنگی زاراوە ئەدەبییەکانەوە

دانا رۆوف

**سەرەتا**

گومان لەوەدا نیە کە زاراوە ئەدەبیەکان[1] رۆڵێکی فرە گەورەیان گێراوە لە دیاری کردنی زۆر لە رێبازو شێوازە ئەدەبیو هونەریەکانداو ، ئەمرۆکە هەریەکە لەو زاراوانە خاوەن سیماو قوتابخانەو ریبازی تایبەت مەندن . هەر بەهۆی ئەم زاراوانەوە ، یان بە مانایەکی تر لە رێگاو دیاری کردنی سیما فیکریو ئەدەبیو فەلسەفیەکانی ئەم زاراوانەوە ئەگەینە راستی زۆر لە دیاردەو تەوژمە فیکریو ئەدەبیەکانەوە . ئاشکراشە ئەم زاراوانە زنجیرەیەکی لەیەك نەپچراوی بەردەوام پێك دێنیٚ کە لە یەکەم تەقەلاکانی شارستانیەتی یونانەوە دەست پیٚی ئەکاتو بەردەوامی لەگەڵ بەرەوپێش چوونو بەرز بوونەوەی رادەی رۆشنبیریو هۆشمەندی روژ ئاوادا وەرگرتووەو ، هەر سەدەو سەردەمێل ئەم زاراوانە رۆڵو کاریگەری تایبەت مەندی خۆیان لەسەر هەموو ئاستەکان تیا گێراوەو ، بوونەتە دیاردەی سەردەمو ، رابەرانو قوتابخانەو قوتابیانی خۆیان هەبووە .. هەر چەندە ئەم زاراوانە لەسەرەتاوە وەك (رێباز ، یان تەوژم ، قوتابخانە) وەدیار نەکەوتوون ، بەڵام دوای قۆناخێکی ترو ، لەسەر دەستی تیۆرستو لێکۆڵەرەوەو رەخنەگرەکانەوە سیماو شێوازی فیکریو ئەدەبیو فەلسەفیو ئیستاتیکی وەرگرتووە .

شتێکی روونو ئاشکراشە کە ئەم زاراوانە کاریگەرییەکی راستەوخۆگشتگری بەسەر سەراپای فیکرو ئەدەبو هونەری کوردیەوە هەیە ، لەبەر ئەوە وام بە پێویست زانی گەشتێکی زانستی بکەم بە ناو هەندێ لەو زاراوانەداو ، سیماو شێوازی فیکریو هونەریان روون بکەمەوە ، بەو نیازەی توانیی بێتم سوودێکي بچوك بگەیەنم .

**ریالیزم**

دوای ئەو گۆرانکاریانەی بەسەر بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیانی ئەوروپادا هاتو قۆناخێکی نویٚی لەژیانو پەیوەندیو گوزەرانی خەڵکی بریو ، ئامێر بە شێوەیەکی زیاتر فروان بڵاوبووەوەو ، دەسەڵاتی بەسەر هێزی خەڵکیدا زاڵ بوو و زۆر لەلایەنە نزیکەکانی ژیانی گرتەوەو ، رۆڵی چینی بۆرژوا بە شێوەیەکی بەهێزتر وەدەرکەوت ، ئەمە جگە لە رەنگدانەوەی سەدەی بوژانەوەو ؛ شۆرشی فەرەنسیو جووڵانەوە ئازادی خوازییەکانی تری رۆژئاوا ، ژیانو کۆمەڵ جۆرە وەتیرەو ریگایەکی تری گرتو پەیوەندی نێوان خەڵکی کەوتە ژێر کاریگەری ئەم گۆرانکاریانەوە و ژیان بەشێوەیەکی گشتی ئاڵۆزاو پێداویستیەکانی زیاتر بوو و زیاتررووە بە رووی خۆیو چۆنیەتی

گوزەرانو دەوروبەرەکەیو چۆنیەتی ژیانی بۆتەوە . هەر لەم ڕوانگەیەوە لەناو جوولانەوە ئەدەبیە ڕۆمانسیەکەدا هەندێ لە شیعرەکانی (بایرونو بوشکینو ڕۆمانەکای هیگۆو جۆرج‌ساند) ڕابەرانی ڕۆمانسیەت بەرەو ئاسۆگەیەکی زیاتر تریگث لە واقعیەت بەرێ کەوتوونو دەروازەیەکیان بۆ ئەو ڕێبازە کە بە (ڕیالیزم) ناسرا ، ناوەتە سەرپشت .

شتێکی بەڵگە نەویستە لەناو ئەو ژیانە ئاڵۆزو بەیەکاچووەی کۆمەڵگاو گۆرانکاریە گەورەکانی‌دا ووردە ووردە ئەدەبو هونەری ڕومانسیەت لە ترۆیکی تەنیایی‌و خودی تا کەسی‌و جیهانی خەونو خەیاڵ بێتە خوارەوەو تێکەڵ بە خەڵکی‌و واقع بێت‌و .. جیهانێکی (موضوعی) بەرجەستەبکەن ، بەو شێوەیە نا کە خۆیان ویستویانە ، بەڵکو بەو شێوەیەی لەواقع‌دا هەیە .

بەو چەشنەلە ناوەڕاستەکانی چاخی نۆزدەدا ڕیالیزم لە فەرەنسا سەری هەڵداوە ، هەرچەندە هەندێ لێکۆڵینەوەو ڕەخنەگری جیهانی زیاتر سەرتاکانی ئەم ڕێبازەو لە ڕوانگەی ڕۆمانەکانی (واڵتەر سکۆت)ەوە ئەگەڕێنەوە بۆئەنگلتەرە .

ڕیالیزمیش Realism بەشێوەیەکی گشتی لەسەرەتاکانی‌دا بریتی بووە لە چارەسەرکرذێکی موضوعی واقع بەبێ دەست تێوەردانی نووسەر .

لەبەر ئەوە ئاڵای شۆڕشی دژ بە ڕۆمانسیەتی هەڵکردووە ، ئەوەی زیاتریش ڕێگای بۆ ڕیالیزم خۆش‌کرد وەك دەست‌نیشانمان کرد قۆناخی دوایی زۆر لە بەرهەمی ڕابەرانی ڕۆمانسیەت خۆیان بووە ، شیعرو ڕۆمانەکانیان سیماو جیهانی ڕیالیزمی لەخۆگرتووە . لەو ڕووەوەوە هەوڵیان داوە ئەو پاڵەوانانەی ڕۆمانسیەکان لە بەرزایی ئاسمانی خەیاڵ‌دا توندیان کردبوون بیان هێنە سەر زەوی واقعو لە ڕوانگەی پەیوەندی بە کەسانی ترو کاریگریەوە تێی بڕوانن ، ئەمەش بوە هۆی خولقاندنی جۆرەها ڕووداوو بابەتی جۆراو جۆر کە ئەو سیمایانەی لەخۆ ئەگرت‌و ، هەر لەم بوارەشەوە وێنەی خودی خەڵیکان لە ڕوانگەی کۆمەڵگاوە ئەکردە پاڵەوانی بەرهەمەکانیان . لە ئاکامی ئەم ئەزمونە کاریگەرەوە نوێنەرانی ڕیالیزمو لەسەدەی ڕۆمانسیەت دا گەیشتنە ئەوەی بڵێن دەوروبەرو کۆمەڵ هێزێکی کاریگەری هەیە بەسەر دیاری کردنو چارەنووسی ژیانی مرۆڤەوە . نابێ ئەوەشمان لەیاد چێ کە ڕیالیزم ماناى گوێزانەوەیەکی (فۆتۆگرافی) کاربۆنی وا ناگەیەنێ .. بەڵکو (ڕاست گۆیی)لەخستنە ڕووی مەوداو شتەکانو ، ڕاستی ژیانو واقع ئاوێتەی ڕەنگ دانەوەی ئەم ڕێبازەیە (ڕاست گۆیی ل

هونەردا ماناى ڕاست گۆییە بەرامبەر بە ڕێساکانی ژیان بە گشتی‌و ، گوزارشت (تەعبیر) کردنە لە ڕۆحی کۆمەڵو بەرەوپێش چوونی . بەم شێوەیە ڕیالیزم ماناى وەرگرتنی ڕاستی خودو هەوڵدانە تا لە ڕوانگەیەوە نهێنی شتە گشتیەکان بدۆزرێتەوە)[2] .

لەبەر ئەوە ڕیالیزم نموونەی زیندو ، و ڕووداوی ناو جەرگەی سەردەمەکەی خۆی گەرەکە . گەر لەم دەروازەیەشەوە بڕوانینە بارو دۆخە کۆمەڵایەتیەکەی ئەوسای چاخی نۆزدەهەم ئەگەینە ئەو ڕاستیەی کە تا چەند هۆکارێکی گرنگی دامەزراندنی بناخەی ڕیالیزم بووە . نووسەری بلیمەتی ڕیالیزمیش ئەو نووسەرەیە وامان لێ بکات هەست بە بوونی نەکەین وەك نووسەرێگ ، و بەڵکو بگەینە ئەو ڕاستیانەی کە ئەو گەرەکیەتی پێمان بڵێ بەبێ ئەوەی زۆمان لێ بکات‌و پێمان ڕابگەیەنێ ، هەروەها گرنگ ئەوەیە لە ڕوانگەی کەسەکانیەوە ڕامان‌کێشێتە ناو ڕووداوەکانیەوە ، نەك ڕاستەوخۆو ، لە ڕوانگەی خۆیەوە پەل کێشمان کات .

ڕیالیزم لەسەرەتادا لە ئەنگلتەرە لەبواری ڕۆمانەکانی (واڵتەر سکۆت)ەوە سەری‌هەڵداوە ، بەڵام (تشارلز دیکنز) ١٨١٢ – ١٨٧٠ بە باوکی ڕاستەقینەی ئەدەبی ڕیالیزمی ئینگلیزی دائەنرێت لە فەرەنساش‌دا (فلوبیر) ئەدەبی ڕیالیزمی بڵاوکردەوە ، فلوبیر نەك تەنها دامەزرێنەری ڕیالیزمە لەفەرەنسا ، بەڵکو دیاردەیەکی ڕاستەو خۆی نەشونماکردنی ڕیالیزمە لە جیهان‌داو ، ڕۆمانی (خاتو بۆفاری) تەقینەوەیەکی گەورەی ئەو جیهانەیە ، هەر وەها ڕۆمانی (سوورو ڕەش)ی ستندال قۆناخێکی گەورەی ڕیالیزمی فەرەنسیە ، نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە (بلزاك) ١٧٩٩ – ١٨٥٠ دائەنرێت بە ئەستێرە گەشەی ئەدەبی ڕیالیزمی فەرەنسی‌و جیهانی ، گۆرکی سەبارەت بە (کۆمیدیای مرۆڤایەتی)یەکە ووتویەتی : – (کۆمیدیای مرۆڤایەتیم لە تەمەنی بیست ساڵیدا خوێندەوە . ئەم کتێبە هێزێکی گەورەی کاریگەر بوو بۆ سەر ئەو ڕۆمانسیەتەی هێشتا لە لام دروست نەبوو بوو ، هەستم بە بلیمەتی بەلزاك کردو خۆشەویستیەکی گەورە خۆشم ویست ، هەر وەك خۆشەویستی مامۆستایان هاوڕێی .. کتێبی بەلزاك گرانە ، مەزنە بەو هەموو خۆشەویستیەی بۆ خەڵك)[3] .

لەدوای ئەوان بلیمەتێکی مەزنی وەك (مۆپاسان) ١٨٥٠ – ١٨٩٣ دێتە ئاراوە کە دوای چنچۆف بەبێ هیچ دوو دڵیەك دائەنرێت بە مەزنترین

گۆرِنە چیرۆك نووسی جیهانی .

دوی ئەوە ڕیالیزم لەگەڵ گۆرانکاریە بنەرەتیەکانی جیهانو ژیان بەرەو گۆڕ نکری و بەرەو گۆرانکاریو بەرەو پێش چوون چوو ، تا لە ساڵەکانی ١٩٣٤ داو بەتایبەتی لە رووسیا مۆرکو بەرگێکی تری لەخۆ گرت کە بە ڕیالیزمی سۆشیالیست ناسراو فەلسەفەی دیالیکتیك ی کردە بنەمانی خۆیی و . دوای ئەوەش سنوری روسیای بری و بووە ڕێسای هەموو وولاتە سۆشیالیستەکان .

## ناچرالیزم (الطبیعة) سروشتیەت

سروشت یان سروشتیەت (الطبیعة) Naturalism وەك دیاردەو تەوژمێکی بەهێزو قۆناخێکی هەڵەشەو پێش‌کەوتووی ڕیالیزم لە کۆتایی چاخی نۆزدە لە ئەوروپا سەری هەڵداوە .. ئەم ڕێبازە گرنگیەکی بێهاوتای داوەتە وێنەکێشانێکی زۆر ووردی سەراپاگیری چارەنووس و خودی مرۆڤ لەروانگەی سروشتی ئەو خودەخۆیی و توخمە «بایلۆجی» و ناوەندە کۆمەلایەتی و ماتەریەکانەوە .

خێزانو قوتابخانەو نووسەرو چاپخانەو هاوڕێ ی و مێژوو ، و هەموو شتەکانی تر ئاوێتەی رەنگ‌دانەوەو کاریگەری مرۆڤن و بەسەر مرۆڤەوە ، مرۆڤ بیەوێ و نەیەوێ کۆمەڵی داب‌و نەریتی میرات‌گری چارەنووسی هەڵئەسوڕێنێ ، چونکە مرۆڤ گۆشت‌و خوێنەو ، بریتیە لە کۆمەڵی غەرائزو هەست‌و سۆز کە لەزنجیرەیەکی درێژی مێژووی باپیرانیەوە گەیشتونەتە ئەو .

هەر لەم گۆشە نیگایەوە سروشتیەکان زیاتر وویستویانە زۆر بە ووردی دوویاتی نزمترین و کلۆڵترین چینەکانی کۆمەڵ لەسەر هەموو ئاستەکان بکەنەوەو ، بارێکی پڕ لەسلبی و رەشبینی و توندو تیژی ئەو جیهانە بەرجەستە بکەن . گەر هەندێ بگەڕێینەوە بۆ دواوە وەك ڕیبازەکانی تر دەبینین سروشتیەت گەلی هۆکاری کاریگەری گرنگ رۆڵی گێڕاوە لەکامڵ بوون و نەشونماکردنی دا ، لەو هۆکارانەش شکاندنی لەشکری فەرەنسی بەرامبەر رووسیاو . دامرکاندنەوەی (کۆمۆنەی پاریس) و بڵاوبوونەوەی تەوژمێکی کۆنەپەرست لە هەموو بوارە جۆربەجۆرەکانی فەلسەفەو مێژوو و ، ئەدەب‌و . هونەرو ، زانست‌دا ، ئەم لایەنە سلبیانەش لە جێگای خۆیانەوە بارێکی رەشبینی لە دڵو دەروونی رابەرانی ئەم ڕیبازە خوتەقاندوەو جۆرێك لەسەرلێشێوانی و رۆحی راپەرانیان لەلا دروست بووە ..

ئەمە جگە لە کاریگەری زانستی پزیشکی ئەزموونگەری و بەتایبەت تاقیکردنەوەکانی (کلودبرنار) و کاریگەری کتێبەکەی (دەروازەیەك بۆ پزیشکی ئەزموونگەری) کە بەهایەکی فرەباڵاو مەزنی هەبووە بەشێوەیەکی گشتی لەسەراپای ووڵاتە ئەوروپیەکاندا . لەمەودای ئەم تاقیکردنەوە زانستیانەو ، بە تایبەتیش تیۆرەکانی (برنار) ەوە دەروازەیەکی زانستی ئەزمونگەری بە کاڵا کراوەتەوە لەبەر دەم پاشەرۆژی ئەم ڕێبازە ئەدەبیەداو (ئەمیل زۆلا) رۆڵێکی گەورەی لەبەرجەستەکردنی ئەم پرۆسیسە زانستیە لەئەدەب‌و هونەرو گێراوەو ، وەك زانستیەك روانیویەتە ئەو رۆو پاشەرۆژی ئەدەب‌و هونەر . (زۆلا) گەرەکی بووە لەم ڕیگا زانستیەوە رۆبچێتە خوارەوە بە (جیهانی دەروونی) پاڵەوانەکانیا ، هەر وەها ئەم قوتابخانە ئەدەبیە دووپاتی پێویستی (بێ لایەنی) نووسەری کردۆتەوە ، وەك هەڵوێست سەبارەت ئەو رووداوانەی خستویانەتە روو ، ئەمە جگە لەوەی پێویستە نووسەر دووربکە وێتەوە لەبەکارهێنانی هەموو جۆرە ووشەیەکی بریقەدارو بەکارنەهێنانی پروپاگەندەو ئامۆژگاری و دەست نیشان کردنی ئاکارو رەوشت‌و بڵاونەکردنەوەی ، بەڵکو لەسەر نووسەر پێویستە تەنها شتەکان وەك خۆیانو بەبێ زیاد و کەم بخاتە روو ، بێگومان لەم رووەشەوە نووسەر سەربەستیەکی تەواو و بابەتێکی زۆری ئەکەوێتە بەردەست تا لەسەریان بنوسێت ، بەمەش ئەم ئەدەبە ڕێگای بۆ زۆر لە دیاردەو باری دوور لە رەوشت‌و ئاستێکی زۆر نزم و بازاری و وەدەرخستنی چینە ترمەکانی کۆمەڵ لە ناشرینترین شێوەو دوور لە هەموو بنەماو ڕێبازەکانی ئەدەبەوەو ، پشت گوێ خستنی ڕێساو یاساکانی فەلسەفەو ، زانستی ئێستاتیکەوە کردۆتەوە . بێگومان بەمەش سروشتیەت ئەگاتە ئاستێك هەموو جۆرە پەیوەندیەکیان بە ڕیالیزمەوە نەمێنێ ی و دوور بکەونەوە لە هەموو خولقاندنو ئەفراندنێکی باڵای ئەدەب‌و هونەرەوە .[٤]

نابێ ئەوە لەیاد کەین کە ئەمیل زۆلا Emile zola مامۆستاو باوکی شە رعی ئەم ڕێبازەیوو لەسەر دەستیدا ڕیالیزم گەیشتە ئەو قۆناخەی بە سروشتیەت ناسرا . زیاتریش بنەماکانی ئەم قوتابخانەیە لەلای زۆلا لە رۆمانی (الوحش البشري) وەدەرئەکەوێت ، پاڵەوانی ئەم رۆمانە مرۆڤێکە نەخۆشی سێکسە ناسازی (الشذوذ الجنسي) ی لە باپیرانیەوە بۆ ماوەتەوەو ، رووداوی رۆمانەکەش لەم روانگەیەوە ئاوێتەی توخمێکی پڕ لە توندو تیژی و سێکسە .

سێکسیش لەلای زۆلا مەودای هەموو ئەو گۆرانکاریانەیە کە بەسەر کۆمەڵگادا دێت . زۆلا لەپاڵ ئەو خەرمانە بەپێزە بەردەوامەی (رۆمان) و

کورتە چیرۆکەکانی ، کۆمەڵێ لێکۆڵینەوەشی وەك (پێنفستی) ئەم دیاردەیەو لەشێوەی کتێبی سەربەخۆدا بڵاوکردۆتەوە ، لەو کتێبانەشی (ڕۆمانی ئەزموونگەری) و (سروشتیەت لە شانۆدا) و (ڕۆمان نووسە سروشتیەکان) هەر وەها زۆلا گرنگیەکی بێپایانی داوەتە شانۆو گەرەکی بووە لە ڕوانگەی ڕێبازی سروشتیەوە گۆرانکاریەکی بنەرەتی لەشێوەو شێوازەکانی نومایش‌کردنی شانۆیی‌و هونەری دەرهێنان لە لایەکەو ، لە لایەکی دیکەشەوە لەڕووی ئەدەبی شانۆوە بکات . لەم ڕووەوە زۆلا پرسیارێکی گرنگی کردووە ، ئەو پرسیارەش ئەوەیە : — (کۆرنی‌و ڕاسین ئەفرێنەرانی تراجیدیان ، هە ڕوەها فکتۆر هوگۆ درامای ڕۆمانسیەتی خوڵقان . کەواتە ئەو نووسەرە وونە کێیە کە پێویستە بیێتە ئەفرێنەری درامای سروشتی ؟) [٥]

گرنگترین ڕۆمانەکانی (زۆلا)ش بریتین لە (گێرمینال ، نانا ، بەختیاری ئافرتان ، زەوی ، خەون ، پارەکانی دکتۆر باسکاڵ ، مەی‌خانە) بەم ڕۆمانەشی واتە (مەی خانە)و بەڕای ڕەخنەگران سروشتیەت گەیشتۆتە ترۆپکی گەشەکردنی .. لەم ڕۆمانەشی‌دا وێنەی ئەو مرۆڤانەی وەدەرخستوە کە بەهۆی مەیەوە تووشی کەوتنی بەهێز دێن .

## سیمبۆلیزم (الرمزیة)Symbolism

زۆر هۆکاری گرنگ ڕۆڵی گێراوە لە تەقینەوەی تەوژمی «ڕەمزی» لەئەدەب و **هونەردا**[١] لەوانە نەمانی هیچ بەهایەکی هونەری بەرزو تاساندنی لە گێژاوی ڕێبازی (سروشتی)و ، دەرکەوتنی قوتابخانەی هونەر بۆ هونەر[٦] ،و گرنگی پێی‌دانی (شێوەو تشکیل) لە شیعرو ، هەمدیسان کوژاندنەوەی کۆمۆنەی پاریس ، چونکە زۆر لە شاعیرە ڕەمزیەکان بەشداری ئەم شۆڕشەیان کردوەو ، دوای پوکانەوەی بۆتە خورپەیەکی گەورە بۆیان ، ئەمانە هەمووی لەلایەکەو ، دەست بەسەراگرتنی بزوتنەوە زانستیە «وضعیە»کە بەسەر ئەوروپادا لەلایەکی دیکەوە ، (ئەم جووڵانەوەیە هەموو شتەکانی مل کەچی لۆژیك کردوەو ، باوەڕی تەواوی تەنها بە سیما ماتەر ئامێزەکان بووەو ، لەو ڕوانگەیەوە باوەڕی وەها بووە کە ئەتوانێ لە ڕێگای شێوازە ئەزموونگەری‌و بە بیری هۆشمەند بگاتە ڕاستی شتەکان) [٧] .

بەو شێوەیە لەکۆتایی چاخی نۆزدەدا ڕەمزیەت بەشێوەی شۆڕش ئاسا دژی‌و ضعیەکانو ، طبیعی‌و ، بارنا سیەکان) هاتنە گۆڕەپانی شارستانیەتەوە بێگومان (پاریس)لە سەرەتاوە وەك ڕێبازەکانی‌تر مەڵبەندی خرۆشاندنی ئەم جووڵانەوە ئەدەبیەبووە . لەم ڕوانگەیەو لە بواری ئەوپێش دەستیەوە ڕەمزیەت مۆرکێکی ئایدیایی‌و ڕۆحی لەخۆگرتوەو ، واقع و دیاردە ئاشکراکانی وەلاوە ناوەو ، ئامێزی بۆ جیهانێکی پڕ لەنهێنی کردۆتەوەو ، لە دەرگای (لاشعور)ی داوەو ، بەو جیهانە پڕ لەوێنەو پەنهان‌و نهێنیەدا ڕۆچۆتە خوارەوەو ، بەشێوازێکی ئیحائی‌و تجریدی ڕووت وێنەی ژیانی ناوەوەی مرۆڤ‌و دیاردە سروشتی‌و کەونی‌و جەوهەری ڕاستیان بە وێنەو ، داستان و ، مۆسیقا خوڵقاندوە ، بەو نیازەی تارلیەکی ڕۆحی بەرزی ڕەها ببەخشنە ئەدەب‌و هونەرو ، لەگەرۆی ڕیالیزم‌و ، سروشتیەت‌و ، پارناسیەکان دەربهێنێ .

یەکەم بانگەوازی ئەم ڕێبازەش (شارل مۆریاس)و لە ساڵی ١٨٨٦دا مێفیستی ڕەمزیەتی لە ڕۆژنامەی (فیگارۆ)دا بڵاوکردۆتەوە .[٨] دوای ئەوە شاعیرانی وەك (ڕامبۆ ، و مالارمێ‌و فیرلین) **بنەماکان** ڕەمزیەتیان لە شعیرەکانیان لەلایەکەو ، لەلایەکی دیکەشەوە لەو لێکۆڵینەوە فرەو بە پیتانەی بەردەوام لە کۆمەڵێ گوڤارو ڕوژنامەی تایبەت‌مەند بەم ڕێبازە بڵاویان کردۆتەوە داناوە .

جیهانی «لاشعور» لایەنێکی گرنگی ئەم ڕێبازەیە ، دوای ئەوەی (فرۆید) مرۆڤی دابەشی دوو حاڵەت کرد (شعور)و (لاشعور)و هەروەها دەست نیشان کردنی نهێنی ئەم جیهانە لەنەخشەی بیروهۆش‌و هۆشمەندی ، لەهەمان کات‌دا دەوڵەمەندی ئەم لایەنە لەزۆر دیاردەو خەون‌و جیهانی تایبەت ، کە هونەرمەند لە ڕوانگەی تەقینەوەی ئەو لاشعورە خەفەکراوە ئەفسونیەوە ئەگاتە قۆناخی ئەفراندنێکی باڵاو بەرزو ، هونەرێکی مەزنیش ئەخوڵقێنێ . هەروەها لاوانی سەر بەم ڕێبازە کەوتبوونە ژێر کاریگەری فەلسەفە ڕەشبینەکەی (شۆپنهاوەر)ەوە ، چونکە ڕەمزیەکان وەك شۆپنهاوەر دووپاتی دڵە ڕاوکەی ڕۆح‌و حەپەسان‌و گەمارۆدانی (بوون) لە کۆمەڵێ دیاردەی نادیارو پڕ نهێنی‌و ڕەمزیان ئەکردەوە . لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە مۆسیقای (ڤاگنەر) هۆکارێکی گەلی کاریگەر بووە بۆ وەدەرکەوتنی ڕەمزیەت ، چونکە مۆسیقاو ئۆپراکانی ڤاگنەر مۆرکێکی پڕ لەخەون‌و داستان‌و ئەفسونی لەخۆگرتووە .

مۆسیقا هاوکێشە ئاڵۆزە پڕ لە نهێنیە ڕەمزیەکە دەگەیەنێتەترۆپك ، لەم ڕووەوە «فیرلین» ووتویەتی : — (مۆسیقا لەپێش هەموو شتێکدا)[٩] بەمەش مەبەستیان بووە شعیر مۆرکێکی مۆسیقا ئامێز لەخۆ بگرێت‌و ، وەك مۆسیقا

شیعر ئەڕوانگەی هەست و سۆزێکی بەرزەوە تێڕوانینی بێسنور لەلای خوێنەر دروست بکات .

لەم بۆ چوونەوە ڕەمزیەکان دووپاتی ئەوەیان کردۆتەوە کە شاعر بەهۆی ئەو توانا بەهرە بەرزو خودیەی خۆیەوە ئەتوانێ یاساو بنەمایەکی جیاوازتر بەخشێتە سروشت‌و ، سروشت لە زۆر دیاردەی ئاشکرا بەدەربکات‌و ، واقعێك بخولقێنێ کە خۆی گەرەکیەتی . واقع لەلای ڕەمزیەکان بریتیە لە جیهانێکی پڕ لەجوولەو جوولانەوە ، گۆرانکاری بەردەوام ، لەبەر ئەوە ناگاتە جەوهەری ڕاستی ، بۆیە «خەون‌و فەلسەفەی خەون»پانتاییەکی گرنگ لەم ئەدەبە یان لەجیهان شعیرو هونەری ڕەمزی لەخۆدەگرێت ، بۆدلێر ووتویەتی : — (هەموو ئەو شتانەی لەسەر زەوین لەشتی لاوەکی بەولاوە زیاتر نین ، ڕاستی ڕاستەقینەش بوونی بۆ نیە لەخەون‌دا نەبێ)[١٠] . نابێ ئەوە لەیاد بکەین چیرۆك نووسی گەورەی ئەمریکی (ئەدگار ئالان پۆ)ڕۆڵێکی فرەگەورەو کاریگەری گێراوە بەسەر ڕابەرانی ڕەمزیەتەوەو ، شەمەندەفەری ڕێبازەکەیانی گەیاندۆتە وێستگەی ئەو دیاردەیەی بە ڕێبازو قوتابخانە ی ڕەمزیەت (سمبۆلیزم) ناسرا .

ڕەمزیەتیش بەشێوەیەکی گشتی لەقووڵاوی دەریای شعیرەوە وەدرکەوت‌و ، مەبەستی بووە بگاتە نهێنی جەوهەری ڕاستەقینەی شعیر .. ڕەمزیش تەنها کەرەسەیان بووە بۆ بەئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەیان . هەرچەندە ڕەمزیەت لە شعیردا سەری هەڵداو ڕابەرانی ئەم ڕێبازە بلیمەتانی وەك (بۆدلێرو ڕامبۆ ، و مالا مێ‌و فیرلین)و چەندان شاعیرانی گەورەی‌تر ئەم شۆرشەیان هەلگیرساند، بەڵام دەرگایەکی گەلێ فراوانی بۆ هەموو جۆرەکانی هونەر و ئەدەب‌و ، لەشێوازو مۆرکێکی باڵاو بەرزدا کردۆتە... هونەری چیرۆك‌و ڕۆمان‌و ، هونەری شانۆ لەڕووی تکنیکی دیکورو دەرهێنان‌و ، پرۆسیسی نومایش کردن‌و ، ئەدەبی شانۆیی هاوچەرخەوە کاڵایەکی گەلێ بەرزو جیاوازو ڕۆحی ڕەهای لە ڕوانگەی ڕەمزیەتەوە بە باڵا براوە مەوداو ئاسۆگەیەکی نوێی لەبەر دەم هەموو جۆرەکانی ئەدەب‌و هونەردا کردۆتەوە .

## سوریالیزم

هەرچەندە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم‌دا ڕێبازی ڕەمزی بەرەو نەمان چوو ، وەك ڕێبازو قوتابخانە ، بەڵام ئەتوانین بڵێین ڕێبازی ڕەمزی لەزۆر شێوەو وێنەی جیاواز جیاوازی تردا وەدەرکەوتۆتەوەو سەری هەڵدایەوە .. چونکە کاریگەری ئەم تەوژمە گۆرانکاریەکی بنەڕەتی لە زۆر بنەماو تێڕوانین‌و مەوداکانی هونەرو ئەدەبدا داهێناو ، ئەدەب‌و هونەری هاوچەرخ دەروازەیەکی نوێی بۆ والاْکرایەوەو ، داهێنان مۆرکێکی زیاتر (هونەر ئامێزی) لەخۆ گرتوە . سوریالیزم یەکێك بوو لەو تەوژمانەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم توانی هێزی خۆی بسەپێنێت‌و ، وەك دیاردەیەك بە شێوەیەکی کاریگەر بڵاوبێتەوەو ، ووشەکەش (سریالی) مانای لە (سەرو واقعەوە) ئەگرێتەوە ، لەو ڕوانگەیەوەی لەپشت واقعەوە واقعێکی‌تر هەیەزۆرفروان‌و بەهێزترو کاریگەرتر لە واقع ، ئەو واقعەش واقعی (لاشعور)ە ، لەبەرئەوە (ڕاستی لە تێڕوانینی ئەم ڕێبازەوە لەجیهانی (عقلی‌باطن)دایەو ، خەون جەوهەری ڕاستی‌و شتەکانە ، هۆش لە خەون‌دا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئازاد ئەبێ لەهەموو جۆرە دەست بەسەراگرتنێکی بیرو هۆشی هۆشمەند (العقل الواعي) .

ئەتوانین بڵێین (سریالیش)درێژ بوونەوەیەکی لۆژیکی تەوژمی (دادادی)یە کە لە زوریخ‌و لەسەر دەستی (هوکۆبال) لە ساڵی ١٩١٦دا وەك تەوژمێکی دژ بە جەنگ وەدەرکەوت .

سێ کوچکەیەکی زانستی‌و فیکری‌و فەلسەفی ڕۆڵێکی مەزنی گێراوە لە (دیاردەی سۆریالیزم)دا ، ئەوسێ لایەنەش : جیهانی لاشعورو عقلی باطن لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوە زانستیەکانی (فرۆید)و ، بە تایبەتی (فرۆید) بۆ پراکتیکی ئەو تیۆرە زانستیانەی شاکاری (ئۆدیبی پاشا)ی سوفۆکلیس و (لیۆناردۆدافنشی)و (شەکسپیر)و زۆری‌تر لە شاکارە جیهانیەکانی کردۆتە میدانە لێتۆژینەوەکانی‌و ، بەستونیەتەوە بە هێزی (لیبرۆ)ی سێکسیەوە .. لەپاڵ فرۆیدا فەلسەی (برغسون) هۆکارێکی ڕاستەوخۆ بووە ، برغسون ووتویەتی : — (پراکتیکی کردەیی‌و ئەزمونگەری هیچ پەیوەندیەکی بە زانستی مرۆڤایەتیەوە نیە)[١١] . «ئەندریەجید»یش خالێکی گرنگ‌و هۆکارێکی کاریگەر بووە ، ئەندریەجید زۆر لەبەرهەمە ئەدەبیەکانی کاڵایەکی پڕ لە ڕەمزیەت‌و جیهانێکی پڕ لە سوریالیزم‌و خەونی بە باڵا برابوو ، بە تایبەتی (جید)ماوەیەك ئەندامی قوتابخانەی (ڕەمزی)بووە لە فەرنساو ، کاریگەری ئەو قوتابخانەیە لەبەرهەمەکانی‌دا ڕەنگیان دابووەوە .

گرنگی پێ‌ی دانی ئەم ڕێبازە بە (لاشعور)و عقلی باطن ئەگەڕێتەوە بۆ ڕابەرو دامەزرێنەری ئەم تەوژمە (ئەندریەبریتۆن)بریتۆن قوتابی کۆلێژی

پزیشکی بووە کە جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرساوەو ، لە ساڵی ١٩١٥ بۆتە (سەرباز) یەکێك لەیەکە پزیشکیەکاندا ، لەم رووەوە (بریتۆن) زیاتر ئاڵودەی ئەم لایەنە ئەبێتو ، زۆر لە هاوریٚ شاعیرەکانی وەك (ئەبۆلینێرو ، بۆل فالریو ، ئەراغۆن)ئەوروژێنیٚو باسی لێکۆڵینەوە دەروونیەکانی (فرۆید)یان بۆ ئەکات .

هەر وەها (برتیۆن)لە روانگەی ئەو بۆ چوونە تایبەتمەندەیەوە بۆ دامەزراندنی تەوژمێکی نویٚ تیشکی گرنگی پیٚ‌ی دانی خستۆتە سەر دیوانی (سروودەکان مالدودور)ی (لۆتریامۆن)ەوە ، ئەم دیوانەی لۆتریامۆن هێزێکی ئەفسونی گەورە بووە بۆ سوریالیزمەکان ، برتیۆن هەمیشە بە چاوی رێزو گەورەییەوە روانیویەتە بلیمەتی (لۆتریامۆن) . برتیۆن مێنفیستی یەکەمی لە ساڵیٚ ١٩٢٤دا بڵاوئەکاتەوە ، بە تایبەتی لەدوای ئەوەی ئەم تەوژمە زۆر لەسیماکانی وەدەرکەوت ژمارەیەکی زۆر لەداهێنەرە گەورەکانی پاریس وەك (ئیلوار ، و کرافل ، شاعیر شانۆیی ئەنتۆنین ئارتۆ ، و فیتراك ،و ئەراغۆن)و زۆری‌تر چوونە ریزی ئەم رێبازەو ، رەزامەندی خۆیان بۆ بنەماکانی دەربری‌وە .

برتیۆنو بەلاینگیری ئەندامانی ئەم تەوژمە لە مانیفیستی یەکەمی‌دا بانکەشەی ئەوەیان کرد کە هونەر هەڵقوڵاوی (فوضیو ، عقلی باطنیو ، لامعقولیەتو ، خەون)ەو لەمەداری جیهانێکدا ئەسورێتەوە زۆر دوور لە هێزو رژێمی هۆشەوە (العقل) .. «رێبازێکی ئۆتۆماتیکی دەروونی روونە ، مەبەستیەتی بەهەر شێوەیەك بێت گوزارشت (تعبیر)لە ڕاستی فیکر بکات ، بەڵام دوور لەهەموو جۆرە رژێمێکی «عقل»ەوە»[١٢] .

بێگومان کارەساتەکانی جەنگی گەورەی جیهانی یەکەم هۆکارێکی گەلی گرنگی وەدەرکەوتنی ئەم دیاردەیە بووە ، رابەرانی ئەم رێبازە بە شێوەیەکی گشتی یاخی بوون لە هەموو جۆرەکانی شارستانیەتی رۆژئاوای ئەوکاتە ، بەتایبەتیش لە ساڵەکانی جەنگ‌داو ، دووپاتی پێویستی گۆرانکاریەکی بنەرەتیان کردۆتەوە لە کۆمەڵو مروڤو هونەردا ..و بە ئاشکرا دژی بورژوازیەت ئەجەنگانو دەردەکانی کۆمەڵو لێڵ‌بوونی‌کانی شارستانیەتی ئەوروپیان ئەنایە ملی ئەو چینە . کەواتە سەربەستیەکی رەهاو جیهانێکی پڕ لەخەون و هێزی لاشعورو عقلی‌باطن و ، لێکوڵینەوەی دەروونی ئەمانە هەمووی هێزی گوزارشت کردنی هونەرە ، بەمەرجێك بەهەموو شێویەك دووربکەوینەوە لە بیرو هۆشو لۆژیکەوە . دوای ئەوە سوریالیزم لەناو بوارە جۆربەجۆرەکانی ئەدەبو هونەردا بڵاو ئەبێتەوەو ، ژان کۆکتۆو ، بیکاسو و (سلفادۆردالی)دێنە ریزی ئەم بوارەوە . بەڵام کاریگەری دالی لەهەموویان زیاترە ، لەبەر ئەوەی تەنها (دالی) ئەم رێبازە لای نەداو هەناسەیەکی درێژو گەورەی پێی بەخشی .

**پەراوێزو سەرچاوەکان .**

١ – کاتی خۆی کلاسیزمو رۆمانسیەت وەك دووزنجیرەی یەك بە دوای یەکی ئەم زنجیرە لە رۆژنامەی «هاوکاری» بڵاوکراوەتەوە ، لەبەر ئەوە وام بە چاك زانی جارێکی‌تر لێرەدا بڵاو نەکرێتەوە .

٢ د. حاتم عماد ، مدخل الى تاريخ الاداب الاوروبية ، الدار العربية للكتاب ، ص ٣٤٩ . سنة ١٩٧٩

٣ – هەمان سەرچاوە ، ل ٣٦٣

٤ – رێبازی سروشتیەت لە ئاکامی ئەو رژێمە کاربۆنیەی پەیرەوی ئەکرد کۆمەڵیٚ گرفتو گێژاوی ئاڵۆزی خولقاند بووە هۆی دروست بوونی قوتابخانەی (هونەر بۆ هونەر)ئەم تەوژمە روویەکی دژی توندوتیژی سروشتیەت بووەو ، هەوڵی داوە هونەر لەو ژیانە کۆمەڵایەتیەی سروشتیەکان بۆیان دروست کردبوو دوور بخاتەوەو ، هونەرمەند مرۆڤێکی (ئازاد)و دوور بیٚ لە هەموو بارودۆخە رامیاریو کۆمەڵایەتیەکانەوە هونەرەکەشی بە دەربیٚ لەم جۆرە سیفەتانەوە ، نەك هەر ئەوە بەڵکو هونەر ئەبیٚ لەم ووانگەیەوە بابەتو تیٚ‌روانینی تایبەتمەندی رەهای خۆی هەبیٚو ملکەچی هیچ جۆرە پێوەروکاتو شوێنێك نەبیٚ ، ئەم قوتابخانەیە زیاتر لە شعیردا وەدەرکەوتو بە (پارناسیەت) ناسرا ، ئەم ناوەش ئەگەرێتەوە بۆ چیای (پاراناس)ی یۆنانی ، وەك لەداستانەکاندا هاتووە ، ئەم چیایە خوای شعیری تیا نیشتە جیٚ بووە .

٥ – اردش ، سعد المخرج في المسرح المعاصر ، عالم المعرفة ، الكويت ، ص ٥٦ ، سنة ١٩٧٩ .

٦ – پێویست بوو ئەم قوتابخانەیەش وەك رێبازەکانی دی روون بکەمەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی زیاتر ئەم بزوتنەوەیە لە شعیردا سەری هەڵداو لەمەداری شعیر نەچووە دەرەوەو ، بەشێکی زۆر لە شاعیرە بەرزەکانی فەرەنسا رابەرایەتیان کرد ، بۆیە ئەم لایەنە ئەسپێرمە شاعیرەکانمان ، لەبەر ئەوەی تانو پۆیەکی زۆری مەسەلە شعیریو مێژووی شعیرو شاعیرە بلیمەتەکانی گەرەکە .. ئەمەش زیاتر لەوانەوە نزیکە .

٧ – آيت حمودي ، تسعديت ، أثر الرمزية الغربية في مسرح توفيق الحكيم ، دار الحداثة للطباعة والنشر والتوزيع ، سنة ١٩٨٥ ، ص ١٣

٨ – د. جواد الطاهر ، علي ، الخلاصة في مذاهب الادب الغربي ، الموسوعة الصغيرة ، دار الجاحظ للنشر ، سنة ١٩٨٣ ، ص ٤٨

٩ – د. حاتم عماد ، مدخل الى تاريخ الاداب الاوروبية ، الدار العربية للكتاب ، ص ٣٩٦ ، سنة ١٩٧٩ .

١٠ – آيت حمودى ، تسعديت ، اثر الرمزية الغربية في مسرح توفيق الحكيم ، دار الحداثة للطباعة والنشر والتوزيع ، سنة ١٩٨٥ ، ل ٢٩

١١ – د. حاتم عماد ، مدخل الى تاريخ الاداب الاوروبية ، الدار العربية للكتاب ، ص ٤١٠ ، سنة ١٩٧٩ .

١٢ – د . جواد الطاهر . على ، الخلاصة في مذاهب الادب الغربي ، الموسوعة الصغيرة ، دار الجاحظ للنشر ، ص ٨٦ ، سنة ١٩٨٣ .






بەیارمەتی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیری و
لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە

کورتەچیرۆك

لە خەونەکانی
نامۆیێك

حەسەن جاف



# چەند ساتێك بێداری لە ئاست خەونەکانی نامۆیێك دا



ئاسۆ ئەحمەد



تەمەنی چیرۆکی کوردی لە نیو سەدە تێپەڕیوە ، دیارە ئەم ماوەیەش بە پێودانگی نەش و نماو گۆڕان و گەشەسەندنی خێرای ئەم سەدەیە ماوەیەکی کەم نیی‌یەو چیرۆکی کوردیمان لەمەودای سالآنی تەمەنی خۆی‌دا گەلێك بازدان و گەشەسەندن و نوشستی‌و کپ بوونی تووش هاتووە ، ڕۆژگاری زێڕین و ڕۆژگاری لێڵ و تەماوی‌ی بەخۆوە بینیوە . هەڵبەت ئەم گەشەسەندن یان کپ بوونەش بێ بە پێی گۆڕانەکانی بوارە ئابووری‌و رامیاری‌و کۆمەلآیەتی‌یەکانی کۆمەڵ دەرکەوتوون .

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە دەبینین گەلێك بەپێزو نایاب ئەدەبەکەیان ڕازاندووەتەوە و زۆر چیرۆکی کاڵ و کرچ و بێ‌پێزیش سیمای ئەدەبەکەیان بزرکاندووە ، ژمارەیەکی زۆر دەردو پەتاو نەخۆشی لە جەستەی چیرۆکی کوردیمان گەرایان خستووەو بێ چارەسەر مانەتەوە ، تەنانەت هەندێکیان بوونەتە نەخۆشی‌ی کەڤنار «أمراض مزمنة» .

ئاشکرایە بەشێکی گەورەی گوناهو ئۆباڵی ئەم دیاردە نالەبارەش دەکەوێتە ئەستۆی «ڕەخنەی ئەدەبی» کە نەیتوانیوە وەك پێویست ڕۆڵی مەزن و بایەخداری خۆی ببینێت لە شی‌کردنەوەو لێکدانەوەی بەرهەمی ئەدەبی و دەرخستنی ڕەگەزی ئیجابی‌و سلبی تێیدا و ڕێنمایی کردنی شاعیرو نووسەران و خۆش کردنی زەمینە بۆکردەی داهێنان «الأبداع» لە ئەدەبەکەمان دا . تا ئێستاش ڕەخنەی ئەدەبیمان لە چوارچێوەی موجامەلەو پیا

هەڵدان یان بە پێچەوانەوە شکاندن و داپڵۆسین دەرنەچووە ، تا ئێستاش زۆربەی زۆری نووسەرانمان لە ڕەخنەو قسەی هەق دەسڵەمێنەوەو زویر دەبن . بێگومان ئەم پاشاگەردانی‌یەی «ڕەخنەی ئەدەبی» گەلێك هۆکاری زاتی و مەوزووعی خۆی هەیە کەلێرەدا دەرفەتی باس کردنی نی‌یەو لێکۆڵینەوەی تایبەت و فراوانی پێ دەوێت .

ئیتر هەر ئەوەندە دەمێنێتەوە چاو ببڕینە هیممەتی نووسەران و دڵسۆزانی ووشەو ئەدەبی کوردی و هیوای ژیانەوەو گەشەسەندنی «ڕەخنە ئەدەبی» بخوازین لە ئەدەبی کوردیمان دا .

ئێستاش با چیدی لە مەبەستی سەرەکی ئەم نووسینە دوور نەکەوینەوەو پێکەوە بە ووردی‌و هێمنی لاپەڕەکانی کۆمەڵە چیرۆکی «لە خەونەکانی نامۆیێك»[1]ی کاك «حەسەن جاف»ی چیرۆکنووس هەڵ بدەینەوە کە «نۆ» چیرۆکی کورتی لە دووتوێدایەو بەرهەمی «نۆ» ساڵی نووسەرەکە لە نێوان ساڵانی «١٩٧٣ ـ ١٩٨٢» دا نووسراون .

لە ساڵی ١٩٨٦ دا چاپ کراوەو ئەمیندارێتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان یارمەتی لە چاپدانی داوە .

## چەند ساتێك لە یادداشتەکانی نامۆیێك

«چیرۆك هەر جۆرێك بێت ، لە ڕاستی‌دا گێڕانەوەی ڕووداوێکە»[2] ، گەر لە ڕوانگەی ئەم ووتەیەوە لەم چیرۆکە وورد ببینەوە ئەوا هیچ ڕووداوێك ـ بەمانای تەواوی ڕووداو ـ نابینین ، ناکۆکی‌و هێڵی درامی‌و ناوەرۆکێکی دیارو ئاشکرا بەدی ناکەین. نووسەر هەر لە سەرەتاوە لەڕێی چەند ڕستەیەکەوە پاڵەوانەکەیمان پێ دەناسێنێت ؛ مرۆڤێکی سست و ماندوو .. زۆربەی ساتەکانی ڕۆژگار لە نێوان چوار دیواری ژوورەکەی‌دا بەسەر دەبات .. «زۆر دەمێکە کردوومە بە خوو ، لە ژوورەکەمدا خۆم حەشار بدەم و لە ڕاکشان بەولاوە هیچی کە نەکەم .»

پاڵەوانی چیرۆك بەم شێوەیە باسی خۆی دەکات .. بە درێژایی ڕۆژگار لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕاکشاوەو لە بنمیچ و دیوارەکان ڕادەمێنێ ..

تیشکی سەرنجەکانی ئاراستەی ڕیزە مێرووله دەکات و گلێنەکانی لەگەڵ کشان و درێژ بوونەوەی مێروولەکان دا لەرەوتان . پاشان هێدی هێدی پێڵووەکانی ماندوودەبن و نوقمی خەوێکی قووڵ دەبێت و خەون دەبینێ .

ئەمە پوختەی کارو پیشەو هەڵس و کەوتی پاڵەوانی چیرۆکەکەیە هەر وەك نووسەر خۆی پێمان ڕادەگەیەنێت ، خوێنەریش جگە لەم چەند زانیاری‌یە هیچی تر لە بارەی پاڵەوانەوە نازانێت ، بەرەو ڕووی کۆمەڵێك نهێنی‌و پرسیاری بێ وەڵام دەبێتەوە کە لە دووتوێی چیرۆکەکەدا هیچ ڕستەیەك .. وەسفێك .. وێنەیەك .. تەنانەت تاقە ووشەیەکیش بەدی ناکرێت تیشکێکیان بخاتە سەرو یاریدەی خوێنەر بدات کون و قوژبن لایەنە تاریك و شاراوەکانی چیرۆکەکەی لا ڕۆشن ببێتەوە ، بۆ نموونە :ـ

پاڵەوان کێ‌یە ؟

سەر بە چ توێژو چینێکی کۆمەڵە ؟

چی وای

لێدەکات بە درێژایی ڕۆژگار لە ژوورەکەی‌دا خۆی حەشاربدات و لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕابکشێت ؟ خۆی لە کێ .. شتێك حەشار دەدات ؟ ئەو کە زۆربەی ساتەکانی ڕۆژگار لەنێوان چوار دیواری ژوورە تەنگەکەی دا بەسەر دەبات و وەك خۆشی دەڵێت هەندێك جار بە هەفتەش ناچێتە دەرەوە ، ئەی چۆن بژێوی ڕۆژانەی دابین دەکات ؟ خێزان و کەس و کاری هەیە یان بە تەنیا دەژی ؟ ئەمانەو دەیان پرسیاری دیکە لە بیر و هۆشی خوێنەردا سەر هەڵ دەدەن و داوای وەڵام دەکەن بۆ ئەوەی گرێ و گۆڵ ئاڵۆزی‌ی چیرۆکەکە برەوێتەوەو مەبەست و ویستی نووسەر بگاتە خوێنەر ئەم لێڵی‌و نادیاری‌یەی ناسنامەی پاڵەوانی چیرۆك وا لە خوێنەر دەکات هەر زوو لە خوێندنەوەی

چیرۆکەکە بێزار ببێت و هیچ تاسە و تامەزرۆیی‌یەکی بۆ تەواو
کردن و تێگەیشتنی چیرۆکەکە لانەمێنێت چونکە خۆی لەبەردەم
زریـزەیـەکی نەپساوی پرسیارو ئاڵۆزی‌و نهێنی‌و تەلیسم دا
دەبینێت کە ئاشکرا کردن و پەردە لە روو لادانیان کارێکی گران
و مەحاڵە ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی‌و بێ پێزی‌ی دارشتنی
چیرۆکـەکـە و شکستی هێنانی چیرۆکنووس لە پێك گەیاندنی
ووردو بەسەلیقەی جەمسەرە جوداکانی دا .

لێرەدا بە پێویستی دەزانم خوێنەری هێژا لەوە دڵنیا بکەم کە من
هەرگیز داوای ئەوە لە نووسەر ناکەم وەڵامی هەموو پرسیارێك
بداتـەوەو گشت نهێنی‌یـەك ئاشکـرا بکـات و هەموو گرێ و
ئاڵۆزی‌یەك شی بکاتەوەو چیرۆکێکی بێ پرسیارو گرێ‌و نهێنی
بخـاتە بەر دەستی خوێنەر ، نەخێر من هەرگیز داوایەکی وا
ناکەم ، تەنانەت بڕوای تەواویشم بەوە هەیە کە داوایەکی لەم
جۆرە گێـل‌و تێنـەگـەیشتنــە لە ئەدەب و رۆڵی خوێنەر وەك
لایـەنێکی کاریگـەرو سەرەکی لەهەر بەرهەمێکی ئەدەبی‌دا .
بەڵام ئەمــەش وا ناگەیەنێت ـ هەر وەك لەسەرێشەوە ئاماژەم
بۆکرد ـ چیرۆکنووس خوێنەر بەرەو رووی کۆمەڵێك گرێ و گۆڵی
مەحکەم و پرسیاری بێ وەڵام بکاتەوە و داوا لە خوێنەر بکات
وەڵامی گشت پرسیـارەکان شی‌بداتەوەو هەموو نهێنی‌و گرێ‌و
گۆڵ و ئاڵۆزی‌یەکار شی بکاتەوە،ە دوایی‌دا لەمەبەستی نووسەر
تێبگـات ، هەموو ئەوەی لێرەدا من لە نووسەری داوا دەکەم
ئەوەیە لە هەندێك شوێن دا بە رستەیەك .. بەوێنەیەکی هونەری
.. بەووشەیەك ـ تاقە ووشەیەك ـ یاریدەی خوێنەر بدات کلیلی
ئاڵۆزی‌و نهێنی‌یەکان

بدۆزێتـەوەو لایەنە تاریك و نادیارەکانی چیرۆکەکەی لا روون
ببێتەوەو پاشانیش لەبیرو راو مەبەستی راستەقینەی نووسەر
تێبگـات ، بۆ نمـوونـە کاتێـك نووسـەرێـك دەیەوێت پێمان
رابگـەیـەنێت کە پاڵەوانی چیرۆکـەکەی مرۆڤێکی دەوڵەمەندە
پێویست ناکات یەکسەر بنووسێت « فلان کەس دەوڵەمەندە »
بەڵکە دەتوانێت بە گەلێك شێوەی ناراستەو خۆ ئەم مەبەستەی
خۆی بە خوێنەر بگەیەنێت .. وەك ئەوەی بنوسێت « کە دەستی
دایە دەرگای ئۆتۆمبیلە سوپەر سالۆنە سپی‌یەکەی ئینجا بۆی
دەرکەوت کە سویچەکەی لەسەر مێزی ژووری میوانەکە بەجێ
هێشتـووە » یان بە شێـوەیەکی تر دەتوانێت « کە لە باڵکۆنی
خانووە سێ نهۆمی‌یەکەیەوە دەمیراونی‌یە دەرەوە .. باخچەکەی
دەبینی بە گوڵی زەردو سوور رازاوەتـەوە» ئەوسا خوێنەر تێ
دەگـات کە پاڵەوانی چیرۆکـەکـە مرۆڤێکی دەوڵەمـەندەو لەم
روانگەیەشەوە کارو بیرو راو هەست و کەوتی هەڵ دەسەنگێنێ .

ئەمــە دەربـارەی لێـڵ‌و نادیاری‌ی ناسنامەی پاڵەوان ..
مەسەلەیەکی تر کە لەم چیرۆکەدا سەرنج رادەکێشێ مەسەلەی
بەکارهێنانی خەونە . خەون وەك بابەتێکی زیندوو گەلێك جار لە
ئەدەب دا تەوزیف کراوە . لە ئەدەبی گشت میللەتێـك دەیان
نموونەی وا بەدی دەکرێت کە خەون بووەتە بابەتی سەرەکی‌ی
گەلێك شیعرو چیرۆك و لە رۆمان و داستان و شانۆنامەش دا
رووبەرێکی دیارو بەرینی داگیرکردووە ئەم بایەخ وگرنگی‌یەی
خەون لە خۆوە نەهاتۆتە گۆڕێ ، هەروەها بەر جەستە کردنیشی
لە توێی بەرهەمی ئەدەبی‌دا کارێکی هەر واساناو بێ گرفت
نی‌یـە ـ وەك لە سەرەتـاوە دەردەکەوێت . نووسەر لەبەر زۆر
سۆنگەی جیاواز پەنا وەبەر خەون دەبات .. بۆ دەربرینی هیواو
ئاواتە گران و قەدەغەکانی ... بۆ بەخشینی کەشێکی سیحر
ئامێـزو خەیاڵی بە بەرهەمەکەی ئەمەش گەلێك جار مەبەستی
جوانکـاری لە توێی خۆی‌دا هەڵ دەگـرێت ، واتـە نووسەر
دەیەوێت کالایەکی جوانی نیمچە سەیرو نامۆ بە بالای بەرهەمە
ئەدەبی‌یەکەی ببرێت . هەروەها نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت
کە یەکێك لە هۆیەکانی تری پەنا بردنە بەر خەون بۆ خۆ نوقم
کردنی نووسـەرە لەنـاو نارێکی و ناکـۆکی‌و ناماقووڵی‌ی وێنە
سەیرو سەمەرەو دژ بەیەك و ناواقیعی‌یەکانی خەون دا ، بەو
پێ‌یەی کە « خەون بریتی‌یە لە کۆمەڵێك وێنەی هەستی‌ی پووچ
و نارێـك و شێـواوو ناکۆك کە جێ‌ی چالاکی‌ی هوشیارانەی
مێشـك دەگـرێتـەوە»[٢] بەمـەش نووسـەر خۆی لە رووبەڕوو
بوونـەوەی کێشـەو گیرو گرفتـەکـانی بەرهەمەکەی‌و چنینی
ماقـوول و لۆجیکـانـەی رووداوەکان و بە ئەنجام گەیاندنیان
دەدزێتـەوە . بێ گومان ئەمەش حوکمێکی سەراپاگیری نی‌یە
چونکــە زۆر جاری وا هەیــە بەکـارهێنـانی خەون قووڵی‌و
زینــدوویی‌و مەداو ئاسـۆی فراوانتـر بە بەرهـەمی ئەدەبی

دەبەخشێ. هەروەها گەلێك جار نووسەرێك ناوەرۆك و بیرۆكەی دەوڵەمەند ئاوێتەی خەون دەكات و هەر لەرێی خەونەوە شتی گەورە دەڵێت ئینجــا ئەگــەر لە روانگــەی سروشتی خەون و ئەركەكانیەوە ـ وەك باس كرا ـ سەرنجێكی وورد لە خەونەكەی پاڵەوانی ئەم چیرۆكــەی كاك « حەســەن جاف » بدەین ئەوا هەرزوو دەگەینە ئەو بروایەی كە ئەم خەونە بەزۆر ئاخنراوەتە نێو چیرۆكەكەوەو بە زۆرە ملێ بەسەر پاڵەوان دا سەپێنراوە ، دەنــا بە هیچ جۆرێك خزمەتی ناوەرۆكی چیرۆك و كەسێتیی پاڵەوانەكە ناكات ، بوون و نەبوونی لە چیرۆكەكەدا وەك یەكەو هیچ لە مەسەلەكە ناگۆرێت .

### رەشەبا

هەر لە سەرەتــای چیرۆكــەوە ناكــۆكی زەمــەن و تێك چرژانی نارێكی دەمــە جیــاوازەكــانی فرمــان سەرنجی خوێنەر كۆت دەكەن. ( رابردووی سادە ، رانەبردو ، رابردووی بەردەوام ، رابردووی دوور دیسان رانەبردوو ) ، جا بۆ ئەوەی خوێنەری بەرێــز بە چاكی ئاگــاداری گۆرانی كتــوپــرو ناپێــویست و نەگــونجــاوی كات ببێ لە چیرۆكــەكــەدا ئەوا ناچــارم چەنــد پەرەگرافێك لە چیرۆكەكە بخوازم بۆ نموونە :ـ

« هێدیو لەسەر خۆ كەوتیتە پێچانەوەی رێگاو هەردوو دەستت لە گیرفــانت نابووو بە چەپش لەبەر خۆتەوە گۆرانیەكت دەوت لەگــەڵ هەنگاوە سست و هێواشەكانتا خۆریش زیاتر بەسەر زورگەكاندا سەر دەكەوت و تیشكی بڵاو دەركردەوە . جار جار بێ ئەوەی هەست بكەیت دەنگت لێ هەڵ دەبری لە دەنگی خۆت دا دەچڵەكیت ( رانــەبردوو ) سەیرێكی ئەملاو ئەولای خۆت دەكەیت .. پۆل پۆل كچان بە جلە شینەكانیانەوە رووەو فێرگە هەنگــاو دەنــێن .. كورانیش ئەمبــەرو ئەوبــەری جادەیان لێ گرتوون ( رانەبردوو) ... »

« لە دەریــای ئەندێشەدا هەستت مەلەی دەكردو وەك بەسەر جادەكــەوە نەبیت وا بوویت ، هۆرنی ئوتــۆمبیلێــك بە ئاگــای هێنــایتــەوەو هەنگــاوەكــانت بۆ سەر شۆستــەكــە گواستــەوە (رابــردوو). یادگــارەكــانی رۆژانی رابــردووت راتدەكێشنەوە دواوەو وا مێشكت جەنجــاڵ دەكــەن ئاگات لە خۆت نامێنێ ( رانەبردوو) ...»

« هەر چەندەت دەكرد نە كەسێكت بەدی دەكردو ( رابردوو) نە چاویشت بە باشی بۆ هەڵ دەهــات (رابردوو) ، پشت لە باكە دەكەیت و (رانەبردوو) ، رووی تێ دەكەیت ( رانەبردوو) لابەلا دەرێت ( رانــەبــردوو) ، چایخــانەكەی ئەوسەر پردەكە بەدی دەكەیت (رابردوو)، هەرچی هێزێكت تیا مابوو (رابردوو) داتە بەر قاچت (رابردوو) ، كەخۆت كرد بە ژوورا (رابردوو)..»

بێ گومان ئەمە مشتێكە لە خەروارێك و دەتوانم دەیان نموونەی تری لەم بابــەتــە لەم چیرۆكــەدا دیاری بكەم كە سەرجەم لە «٦٥٠» ووشە پێك هاتووە . بەداخەوە ئەم لەنگیو نارێكییە لە چەنــد چیرۆكێكی تری كۆمەڵەكەش دا دووبارە بووەتەوە وەك چیرۆكی ( چەند ساتێك لە یادا شتەكانی نامۆیەك ، كاتێك لە دەرگا نادرێ سێبەری داربەروو ، یادێكی زیندوو) .

ئاشكــرایــە كات ( زمن ) یەكەیەكی بنەرەتیو بنەمایەكی سەرەكیی ئەدەبە بەگشتیو چیرۆكە بەتایبەتی ، هیچ چیرۆك و رووداوێك لە دەرەوەی سنووری كات دا رووناداد ، تەنانەت چیرۆكەكانی خەیاڵی زانستیش ( قصص الخیال العلمي) كە لە داهــاتــوویــەكی خەیــاڵیی نەبینراوو بۆ شاییە دوورەكانی گەردوون دا روودەدەن . جا بەم پێیــە بەكــارهێنــانی دەمە جیاوازەكانی كات و جێگۆركێ پێ كردنیان كارێكی ئاسان و گۆترە نییەو سەلیقەو كارامەیی پێدەوێت . وانەبێت مەسەلەی تێكەڵ كردنی دەمەجوداكانی فرمان شتێكی نوێ بێت بەڵكە هەر لەسەرەتاكانی ئەم سەدەیەوە لەلایەن زۆر لە نووسەرانی دنیاوە پەیــرەو كراوە ، لەوانــەش مارسیــل پرست و ولیــەم فۆكتەرو فیرجینیــاوۆلف و جیمس جۆیس و گابریل گارسیا ماركیز . لە رۆمانی ( پایزی پاتریارك ) ی (ماركیز) دا ئاوێتە بوونێكی لێك نەپســاوی رابــردوو و ئێستــاو داهــاتــوو لە چوارچێــوەیەكی هونەریی كۆك و پتەودا دەبینرێت ، رووداوەكان بە شێوەیەكی وا تێــك چرژاون و بەیــەكدا چوون خوێنەر لە ئاست خامەی بەپیتی نووسەردا سەرسام دەبێت و پێویستی بە بیركردنەوەو مێشــك گوشــین و خۆمــاندووكردن دەبێت تا جەمسەری لێك ئاڵاوی رووداوەكــان لەبــەر یەك بترازێنێو بە پێی زنجیرەی زەمەنیی

رووداانیان رێزیان بكاتەوە .. رابردوو .. ئێستا .. داهاتوو . هەر

ئەمـەشـە تام و چێـژی زێتـری بە چیرۆکـەکـە بەخشیوە و
کردوویەتیە بەرهەمێکی نائاسایی‌و ناوازەی وا کە بەسانایی خۆ
بەدەستەوە نادات و وەك بەرهەمی سادەو ساکارو بێ پێز بە
راگـوزاری بەسـەر پەرەی مێشـك دا تێ ناپـەرێت بەڵکە بە
قووڵایی خانەکانی‌دا رۆدەچێت و رەنگ دادەکوتێت .. بۆ هەتایە
لەبیرو هۆش دا تۆمار دەبێت .

کەواتـە مەسەلەی تێك هەڵ کێشان و ئاوێتەکردنی دەمە
جوداکـانی کات کارێکی رەوایەو ناتوانرێ رەت بکرێتەوە ، بە
مەرجێك پێویستی‌یەکی تەکنیکی و جونکاری بیسەپێنێ بەسەر
نووسەرداو بە شێوەیەکی هونەری ماقووڵ و گونجاو بەرجەستە
بکـرێت و لە دەقـە ئەدەبی‌یـەکەدا دا برێژرێت . هەر لەبەر
رۆشـنـایـی ئەم راسـتـی‌یـەدا کە بەووردی ئەم چیرۆکـە
دەخـوێنێنەوە هیچ هۆیەك بۆ جێ‌گۆرکێ پێ کردن و گۆڕینی
کتـوپـڕی دەمـەکانی فرمان بەدی ناکەین ؛ ئەو رووداوانەی
چیرۆکنووس بۆمانی دەگێڕێتەوە سەر جەم لەیەك کاتی هاوبەش
دا روودەدەن ئەویش ئەو بەیـانی‌یـەیـە کە پاڵەوانی چیرۆك
لەمـاڵەوە دێتـە دەر .. کەچی لەگـەڵ ئەمـەش دا نووسـەر
رووداوەکـان دابـەش دەکات و بێ هیچ پێوەندو بنەمایەك
هەندێکیان دەخاتە دەمی رابردووو هەندێکی تریشیان لەدەمی
ئێستادا دادەرێژێت ، ئەمەش وا لە خوێنەر دەکات بگاتە ئەو
باوەڕەی کە نووسەر ئاگای لە رەوتی چیرۆکەکەی نی‌یەو لەنێو
ناکۆکی‌و دژواری‌ی بیرۆکەکانی دا وون بووە . رەنگە ئەگەر ئەم
جۆرە هەڵەو ناکۆکی‌یە زەقە بەسەر چیرۆکنووسێکی لاوی تازە
پێگـەیشتـووی کەم ئەزمـوون دا رابـبـورێت ئەوا لەلایـەن
خوێنەرەوە چاوپۆشی لێبکرێت و زۆر لەسەری حساب نەکرێت ،
بەڵام کاتـێـك دەلاقـەیـەکی وا دیـارو نالەبـار لە چیرۆکی
نووسەرێکی وەك کاك «حەسەن جاف» دا بەدی دەکرێت ئەوا
خوێنـەر ناتوانێت بە ئاسانی چاوی لەئاست دا بنووقێنێت و
فەرامـۆشی بکـات، چونکە کاك «حەسەن» نووسەرێکی خاوەن
ئەزموونەو لەسەرەتای حەفتاکانەوە ئاشنایەتی‌ی لەگەڵ چیرۆك
دا هەیە ، جگە لەمەش بەرای من یەکێکە لەو چیرۆکنووسانەی
بەچـاکی دەسەڵاتی بەسەر کەرەسەو ئامرازەکانی چیرۆك دا
دەشکێت و لە ووردەکـاری‌یـەکـانی تەکنیکی کورتە چیرۆکی
هونـەری‌دا شارەزایـە ، هەر بۆیەشە داوای بەرهەمی کۆك و
بەپێزو بێ‌خەوشی لێ‌دەکرێت .

ئێستاش با سەرنجێك لە ناوەرۆکی چیرۆکەکە بدەین .. لەم
چیرۆکـەش دا ـ هەر وەك چیرۆکی یەکەم ـ پاڵەوان نامۆیە بە
خوێنـەرو ناسنـامـەکـەی لێـڵ و نائاشکرایە ، خوێنەر هیچ
دەربـارەی ئاسـتی رۆشنبـیری‌و باری سایکـۆلۆژی‌و پلەی
چینایەتی‌ی پاڵەوان نازانێت واتە ئەو زانیاری‌یانەی کە یاریدەی
دەدەن سیمـاو کەسـایـەتی‌ی پاڵەوانی لە پێش چاو روون و
ئاشکـرا بێت و لە رێی ئەویشـەوە لە رووداوو هێـڵی درامی
چیرۆکـەکـەو مەبـەست و فەلسەفەی نووسەر تێبگات . هەر
ئەمـەنـدەش نا ، بەڵکە نووسەر جارجار هەندێك راو بیرۆکەو
کارەکتەری لاوەکی دەئاخنێتە دوو توێی دێرەکانەوە کە بە هیچ
جۆرێـك پەیـوەنـدی‌یـان بە ناوەرۆکی چیرۆکەکەوە نی‌یە وەك
(باریکەلە مووزەردەکە) و ( مەسەلەی لە بیرچوونەوە ) لە کۆتایی
چیرۆکەکەدا ، بەمەش ئەوەندەی تر چیرۆکەکە ئاڵۆز دەکات و
خوێنەر لە مەبەستی سەرەکی‌ی چیرۆکەکە دوور دەخاتەوە .

ئینجا بەر لەوەی کۆتایی بەسەرنجەکانم بهێنم دەربارەی
ئەم چیرۆکـە بە پێویستی دەزانم چەند وەسف و وێنە کاڵانە
بخەمە پێش چاوی خوێنەری بەرێز:ـ

« لەوە دەچوو باران هەنگاوەکانی رەشەبای شەتەك دابێ و بە
تەواوی هێوری کردبێتەوە » ل ١٩.

لە راستی‌دا لێرەدا هەرزوو ( رەشەبا ) و ( هەنگاو ) و (شەتەك)
مێخ ئاسا لە مێشکی خوێنەر هەڵ دەچەقن ، چونکە وێنەیەکی
لەق و شێـواوە ، کورد دەڵێ : ( رەشـەبـاکـەی خست ) یان
(بەڵکەباران بباریت و ئەم رەشەبا نەفرەتی‌یە بخات).

لەجـێـیـەکی تردا دەڵێت « ئەڵێی دەریـایـان سەرەو خوار
راگرتووە» مەبەست لەم لێك چوواندنە بارانی بەلێزمەو بە خورە،
بەڵام لێك چوواندنێکی ئەوەندە قورس و نەگونجاوە هەر هەرس
ناکرێت .

تکـایـە باش سەرنجی بدەنێ .. هەرگیـز دەریا سەرەو خوار
راگیراوە داخۆ نووسەر نەیدەتوانی بە کوردی‌یەکی پاراوتر و
وێنەیەکی هونەری‌یانەترو رەنگینتر پێمان رابگەیەنێت کە باران
بە لێزمە دەباریت ؟!

## کاتێك لە دەرگا نادرێ

کەسێـک پاش دوو سێ ملنـگ دابران لەسەفەرێکی دوور دەگەڕێتەوە ، لەکاتی گەڕانەوەیدا بەرەو ماڵ .. بەو ناوچانەدا رادەبـوورێت کە یادو بیرەوەری رۆژانی منالیو هەرزەکاریی تێـدا جێ هێشتوون ( پردە کۆنەکە ، ئاوە خورەکەی خاسە ، مەجـیـدیـە ، کتێبخـانــەی گشتی بازاری حەسـیرەکـە ، گۆڕستـانـەکەی شێخ محێدین ، تاد ..) پاشان دەمەو ئێوارە دەگاتە ماڵەوەو بە دیداری هاوسەرو منالەکانی شاد دەبێتەوە . ئەمە پوختە یان بڵێن هێڵی گشتیی چیرۆکەکەیە.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا رووداوێکی ئاساییەو هیچ شتێکی کتـوپـڕو نائاسایی یان ناکۆکیو یەکانگیری لە خۆنەگرتووە.. نووسەریش زیرەکانە بە رەوتێکی هارمۆنیی نەرمی بێ کۆسپ و گرێ و گۆڵ گەشە بەرووداوی چیرۆکەکەی دەدات، وەسف و ووشەو وێنەی هونەری بە ئاگاییو بە پێی پێویست بەکاردێنێت و زێدە رۆیی ناکـات ، بەمەش ئەستۆی چیرۆکەکەی قورس ناکات و سنووری چیرۆکی زۆر کورت « الأقصوصة » ناشکێنێت ، لێرەدا بە پێویستی دەزانم وەك سەرنجێکی گشتی سەبارەت بەم کۆمـەڵە چیرۆکـە ئامـاژە بۆ ئەوە بکەم کە هیچ یەکێك لە چیرۆکـەکـانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی کاك «حەسەن جاف » لە (١٢٠٠) هەزارو دوو سەد ووشـە تێپـەڕ ناکات ، ئەم جۆرە چیرۆکە بە قەوارە بچووکەش بە پێی پۆلێنێك «تصنیف » کە هەندێك لە چیرۆك ناسانی بێگانە چەسپاندویانە دەچێتە خانەی چیرۆکی زۆر کورتـەوە « الأقصـوصـة » [٤] . بۆ زیاتر روون کردنەوەش دەبێت ئەوە بڵێین کە بە گوێرەی ئەم پۆلێنە چیرۆك دەکرێت بە سێ بەشەوە .. یەکەمیان ( رۆمان ) کە لە رووبەرێکی فراوانی کات و شوێن دا هەڵ دەسورێو بە دەیان کارەکتەرو رووداو لە چوارچێوەی خۆی دەگرێت و لە هەزاران ووشە پێك دێت . دووەمیان ( کورتە چیرۆك ) کە لە گۆشەنیگایەکی تەنگترەوە دەڕوانێتـە دەوروبەرو تەنیا چمکێکی بچووکی دەکاتە بابەتی سەرەکی خۆی ، کارەکتەرانی نێو کورتە چیرۆك لە کەسێك یان چەند کەسێك تێپەڕ ناکەن کە رووداوێکی دیاری کراو دەبێتە خولگە « محور » ی سوورانەوەیان ، وەك قەوارەش لە دوو هەزار تا حەوت هەشت هەزار ووشە پێك دێت .

جۆری سێیەمی چیرۆکیش ( چیرۆکی زۆر کورت ـ الأقصوصة) یە ، دەتـوانم بڵێم ئەم جۆرە ئاڵۆزتـرین و قورسترین جۆری چیرۆکە چونکە مەوداکەی زۆر کەم و سنووردارە ، نووسەری ئەم چەشنە چیرۆکە مەحکومە بەوەی لە چوار چێوەی جغزێکی تەنگ دا هەڵسوورێت .. شوێن رووبەرێکی جوگرافی دیاری کراوە .. کاتیش بازنەیەکی زەمەنیی داخراوە کە نابێت لە چەند کاژێرێك تێپەڕ بکات . بابەتی چیرۆکی زۆر کورتیش بابـەتێکی سادەو زینـدووە .. رووداوێکی ئاسان و هارمـۆنیـیـەو گەشـەکـردن و بە ئەنجـام گەیشتنی پەلەی پێدەوێـت، قەوارەشی لە نێـوان پێـنـج سەد تا دوو هەزار ووشەدایە . هەڵبەت ئەم جۆرە دابەشکردنە شتێکی موتڵەق و بێگیان نییە.. شواریەکی پۆلاین نییە ئاودیوبوونی کارێکی مەحاڵ بێت بەڵکە تەنیا بۆ رێکخستنی چیرۆك وپاراستنێتی لە ئاژاوەو شێـوانـدن و پاشاگەردانی . بێگومان رەنگە هەندێك کەس بەم جۆرە دابـەشکـردنـە قایـل نەبن و بە کوت کردنی نووسەرو کوشتنی گیان و کرۆکی چیرۆکی لە قەڵەم بدەن ، دیارە هەمـوو کەس ئازادە لەڕاوبـۆچـوونـیدا بەڵام دەبـێت ئەو راستیـیـەشمـان لەبـەر چاو بێت کە «قـەوارە» لە چیرۆك دا بنـەمـایـەکی گرنـگ و بایەخدارەو بەفەرامۆش کردنی چیرۆك ناسـنـامــەی خۆی لەدەسـت دەدات ، پەیـوەنـدیـیـەکی دیالێکتیکیی نەپساو هەیە لەنێوان قەوارەی چیرۆك و سەرجەم پێکـهـاتەکـانی تری چیرۆك دا وەك رووبـەریکات و شوێن و رووداوو کەسـەکـان ، پشت گوێ خستنی ئەم باخـەیـە بێ ئەنـدازەیـەی «قەوارە»ی چیرۆکیش ئاژاوەو پەشێوییەکی لە رادەبـەدەر لەبـواری چیرۆك دا دەخـولقێنێو هیـچ سنوورو تخووبێك لە نێوان جۆرە جیاوازەکانی چیرۆك دا ناهێڵێت هەر وەك ئەمـڕۆ لە چیرۆکی کوردیمـان دا دەردەکەوێت .. دەیان جۆری چیرۆك لامـان پەیدا بووە.. (رۆمان ، نۆڤلێت چیرۆکی درێژ، کورتە چیرۆك،چیرۆکی زۆرکورت، پۆستەرە چیرۆك، رۆژانە چیرۆك ، تەنـانـەت بروسـکـە چیرۆکـیش !) ئەمــەش پاشـاگەردانییەکەی قووڵتر کردووەتەوەو پەتایەکی ناهەموارو کوشندەی لە بواری چیرۆك دا خولقاندووە.

ئێستـاش با بگەڕێینەوە لای چیرۆکی «کاتێك لە دەرگا نادرێ»و شەن و کەوێکی هێمنی بکەین . بەر لە چەند دێرێك

ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە ئەم چیرۆکـە ڕووداوێکی سادەی لە خۆگـرتووەو بە کاوەخۆ گەشە دەکات ، بەڵام هەر زوو لەکاتی خوێندنەوەدا کۆمەڵێك پرسیارمان لا دروست دەبێت کە هەرگیز لە چیرۆکەکەدا وەڵامیان نابینیەوە... پاڵەوان کێیە؟ بۆچی بە سێ مانگ جارێـك دەگـەڕێتـەوە نێـو خێـزانـەکـەی ؟ هۆی سەفەرەکەی چییە؟ کەسەفەر دەکات بۆ کوێ دەچێت ؟ هەموو ئەمـانـە پرسیـاری پێـویستن بۆ زێتر قووڵ کردنەوەو ڕوون کردنەوەی مەبەستی چیرۆکنووس و لایەنەکانی چیرۆکەکەی ، هەر ئەمـەندەش نا بەڵکە نووسەر هەر لە خۆرایی پەردەیەکی ئاڵۆزیو تەم و مژی لە بالای چیرۆکـەکـەیـەوە ئاڵانـدووەو خوێنـەری بەرەو ڕووی کۆمـەڵێـك تەلیسم کردۆتـەوە ، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە خوێنەر دەکەوێتە گومانەوە داخۆ ئەوەی دەیخوێنێتەوە ڕووداوێکە بە ڕاستی لە چیرۆکەکەدا ڕوودەدات - واتـە گەڕانـەوەی پاڵەوان بەرەو ماڵ - یان وەك هەنـدێك لە چیرۆکـەکـانی تری کۆمەڵەکە تەنیا خەونێکە لە (خەونەکانی) پاڵەوانە نامۆکەی نووسەر ، بە تایبەتیش لە کۆتایی چیرۆکەکەدا ئەم بە تەواوی مێشکی خوێنـەر لەژێر ڕکێفی خۆی دەنێت ، بەداخەوە لێرەدا بواری ئەوە نیـیە دوا حەڤدە دێری چیرۆکەکە بنـووسمـەوە بۆ ئەوەی ڕاستیی قسەکانم بە خوێنەری هێژا بسـەلمێنم، بەڵام داوای لێدەکـەم بگـەڕێتـەوە سەر کۆمـەڵە چیرۆکەکەو سەرپشك بێت لە یەکالاکردنەوەی ڕاستیو چەوتی ڕاو بۆچوونەکانم دا . ئاشکرایە (کۆتایی) یان وەك هەندێك ناوی دەنێن (قفل) لە چیرۆك دا یەکێکە لە بەشەسەرەکیو گرنگەکان و ڕۆڵێکی سامناك و بنەرەتی دەگێڕێت لە چیرۆك دا - بەتایبەتی لە چیرۆکی زۆر کورت دا وەك چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی بەر دەستمـان - (قفـڵ) ئەو بەشـەی چیرۆکـە کە جەمسەرە جوداکانی ڕووداوی تێدا لێك دەدرێت ، ئەو بەشەیە کە گرێی چیرۆکـەکـەی تێدا شیدەبێتەوە ، ئەو بەشەیە کە تێدا تیشك دەهاوێژرێتە سەر مەبەستی نووسەرو ناکۆکییەکانی تێدا یەك لایی دەبێتەوە . جا چیرۆکنووس لە ئاست ئەم ڕۆڵە بایەخدارو ترسنـاکـەی (قفـڵ)ی چیرۆك دا ناچـارە کە زۆر بە ووردیو سەلیقەو کارامەیی مامەڵەی لەگەڵ بکات . بەڵام بەداخەوە لەم چیرۆکەدا نووسەر نەك هەر بە ووردی مامەڵەی لەگەڵ ئەو بەشە گرنگەی چیرۆکەکەیدا نەکردووە بەڵکە چەند ڕستەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی ڕیز کردووە کەهیچ تاڵە دەزوویەك بە سەرەتاو ناوەندو ڕووداوی سەرەکیی چیرۆکەکەیانەوە نابەستێ، تەنانەت لەوە دەچێت بەشێـك بێت لە چیرۆکێکی ترو بە هەڵە ڕەگـەڵ ئەم چیرۆکـەی بەر دەسـتمـان خرابـێـت ، بە ڕادەیـەك پاش خوێنـدنـەوەی ئەو چەنـد دێـڕەی کۆتایی چیرۆکەکە خوێنەر سەرسام دەبێت .. شێتگیر دەبێت، سەرە خولێی پێدەکەوێت و ماوەیـەك ڕادەمێنێ ، تەنـانـەت ڕەنگـە بۆ ساتێـك لەبـیرو ڕۆشنبـیریو توانـای تێگـەیشتنی خۆیشی بکەوێتە گومانەوە، چونکـە کۆتـایی چیرۆکەکە - وەك لەمەوبەرو باسم لێوە کرد - بەکـەش و هەوای چیرۆکـەکـە نامۆیەو هیچ تاڵە دەزوویەکی باریکیش بە بەشەکانی تری چیرۆکەکەوەی نابەستێتەوە. دیارە ئەمـەش یەکـێـتـیی بیرو بابـەت و گرێچـن و ڕووداوی لەچیرۆکەکەدا لەق کردووەو ڕیسەکەی نووسەری کردۆتەوە بە خوری !

## سێبەری داربەڕوو

ساتە سەختەکانی گیانەلا و بە ڕەنگاربوونەوەی مەرگ .. ئەو ساتانەی یاداشتەکان بارانی بە خوری بەهار ئاسا بەسەر دڵ و بیری مرۆڤ دا دەبارێنەوە ، ئەمە بابەتی ئەم چیرۆکەیە . چیرۆکەیە . چیرۆکنووس زیرەکانە حاڵەتێکی ئینسانی دەگمەنی لە چوارچێوەیەکی هونەریی پتەودا دارشتووە ، زۆر بە چاکی یادو بیرەوەرییـەکـانی ڕابردووی پاڵەوانی ئاوێتەی ساتە بە ئازارەکانی ئێستای کردووە ، ئەم هاوکێشە قورسەش ئەوەندە بە ووردیو کارامـەیی بەدی هێنـراوە کە خوێنـەر بۆ تەنیـا ساتـێـکـیش هەسـت بە بێـزاری و وەڕسی ناکـات لە کاتی خوێنـدنـەوەی چیرۆکـەکـەدا بەڵکـە بە پێچـەوانـەوە زۆر بە پەرۆشـەوە ووشەو ڕستەکان دەقۆزێتەوەو لەگەڵ گەشەکردنی درامیی ڕووداوی چیرۆکەکەدا بەرەو لوتکە هەنگاو دەنێت و تا دوا ووشە پێڵووی چاوانی لە ئاست دێرەکان دا لێك نانێت ، کە لە خوێنـدنـەوەی چیرۆکەکەش دەبێتەوە «دەست خۆش»ێکی گەرم ئاراستەی نووسەر دەکات و ئاهێکی حەوانەوەی وەبەردا دێت .

له راستیدا ئەم جۆرە تەکنیکە ـ پێکەوە گرێدانی ئێستاو رابـردوو ـ کارێکی ئاسـان نییە ، بگرە لە تەکنیکی ئاسایی چیرۆك زەحمـەت ترو ئاڵۆزتـرە . لەم جۆرە چیرۆکـەدا زەمەن بازنەیەکی داخراو نییەو شوێن رووبەرێکی جوگرافی جێگیرو دیاریکراو نییە ، زەمەن مەلێکی سرکەو بێ سرەوت لە نێوان ئێستاو رابردووی دوور و نزیك دا باڵ لێکدەدات ، شوێنیش دەیان بستۆکە زەوییەو لەچەند ساتێکی خێرادا دەبنە شانۆی رووداوی چیرۆکـەکـە (مـاڵەوە .. جادە و کۆڵانەکانی شار ، قوتابخانە ، هۆڵەندە ، تەنجە .. دەشت و دەری بەرین .. ژێر دار بەرووپەك) بەم شێوەیە شوێن جێگیریی خۆی وون دەکات، ئەمەش لەم جۆرە تەکنیکەدا نابێتە مایەی لاوازیی چیرۆکەکە بەڵکـە دەبێتــە کۆڵەکـەیــەکی سەرەکیی بینـای درامیی چیرۆکەکەو هۆیەك لە هۆیەکانی سەرکەوتنی .

خاڵێکی تریش کە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکرێت مەسەلەی لەدایك بوونەوەی یادو بیرەوەرییەکانی (رابردووە) لە مناڵدانی ساتە ناسۆرەکانی (ئێستاوە) ٠ هەڵبەت سەر هەڵدانی یادەکان لە بارو دۆخێکی .

زۆر تایبـەتی و نائـاسـایی وەك بارو دۆخی دەوری پاڵەوانی چیرۆکەکەدا بەپێی بە دوای یەکدا هاتنێکی زەمەنی رێك و پێك نابێت «تسلسـل زمني منتـظم» ، وەك دەزانـین پاڵەوانـەکـە پێکراوە.. لە دەشتێکی بەرین دا بەسنگەخشکێ بەگژ مەرگ دا دەچێت ، ئاشکرایە زامەکەی جەستەی کار لە تواناو چالاکیی بە ئاگاو رێك وپێکی بەشەکانی مێشکی دەکات و دەیشێوێنێت، دەبێتە هۆی ئەوەی یادو بیرەوەرییەکان وەك کۆمەڵێك وێنەی تەمـاویو بزرکـاوو پچـر پچر بە تێکەڵ و پێکەڵی بێنەوە سەر رووپـەری مێشکی و لەگەڵ ساتە زەردەکانی ئێستادا تێکەڵ بین، تەنانەت هەندێك جار یادو بیرەوەری زۆر سەیرو ناما قووڵ بەپێش چاوی مرۆڤ دا دێنەوە .. سیماو روخساری کەسانی وا لەپێش دیدەکانیدا خۆ دەنوێننەوە کە تەنیا جارێك یان دووجار لەوەبەر بینیونی ووەك ناسین بە هیچ کلۆجێکیش نایانناسێت ، جا رەچـاوکـردنی ئەم خاڵە لەلایـەن نووسـەرەوە گورو تینی زیاتری داوەتە چیرۆکەکەو واقیعیەت و زیندوێتیی بابەتەکەی قووڵتر کردووەتەوە .

هەر وەها یەکێك لە خاڵە ئیجابییەکانی تری ئەم جۆرە تەکنیکـە سوود وەرگـرتنێتی لە هونەری سینەما ، ئەویش بە بەکـارهێنانی «مۆنتاژ» بۆ برین و لێکدان و تێهەڵکێش کردنی دیمەنەکانی رابردوو لەگەڵ ساتە ژیاوەکانی ئێستادا . بەم پەل هاویـشـتـنــەش بەرەو هونـەرەکـانـی تر هونـەری چیرۆك دەوڵەمەندترو پوختەتر دەبێت و ئامرازو کەرەسەی نوێ دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە .

لە کۆتاییدا دەبێت ئەوە بڵێم کە تاقە شتێك هارمۆنیەتی چیرۆکـەکـەی کەمێـك لەنـگ کردووە .. زەمەنی راستەقینەی چیرۆکەکەیە واتە ئەو کاتەی رووداوی چیرۆکەکە دەیخایەنێت . وەك لە چیرۆکەکەدا ئاشکرایە رووداوەکە لەو ساتەوە دەست پێ دەکـات کە پاڵەوانی چیرۆك بە زامـداری لەسـەر خاکـەکـە درێژبووەو خاو بە دەوروبەری خۆیدا دەگێرێت .. دەیەوێت خۆ بگـەیـەنێتـە پاڵ نزیکتـرین دار بەروو کە وەك لە رێی وەسفـەکـانی نووسـەرەوە دەردەکەوێت چەند مەترێك لێوەی دوورە ، هەروەها نووسەر ئەوەشمان پێ دەڵێت کە ئەو ساتەی پاڵەوان بەرەو داربەرووەکە خۆی دەکوتێت (خۆر تازە سەری لە ئاسۆوە دەرهێناوەو فێنکایی دەبەخشێ بە دەوروبەر) واتە کات سەر لە بەیانییە ئینجا پاش کەمێك خۆکێش کردن بەسەر چقڵ و درك و داڵ دا تێ دەگـەین کە (هـەتـاو پشکۆیە) واتە کات نیوەڕۆیە ، کاتێکیش پاڵەوان دوا تەکان دەدات وەدەگاتە ژێر دار بەرووەکە .. چیرۆکنووس دەنووسێت (ئاسمان سنگی خۆی بە پرشنگی ئەستـێرە رازانـدوەتـەوە و مانـگ تیشکی زیـویـنی دەبەخشێتە سەر زەوییو در بە تاریکی شەو دەدات) واتە کات شەوە . ئەم ماوە زەمـەنییـەش لەگەڵ جووڵەی پاڵەوانەکەدا ناگونجێت ، لە بەیانییەوە تا شەو کاتێکی زۆرە بۆ برینی چەند مەتـرێـك گەرچی بە سنگـەخشێ و چنگەکرێش بێت .. رەنگە پاکـانـەی نووسـەر ئەوە بێت کە پاڵەوان بەسەختی پێکراوەو زامەکەی جەستەی قووڵ و کاریگەرە بۆیە ناتوانێت بە ئاسانی بجووڵێتەوە، ئەمە رێی تێدەچێت و زۆر راستە کە زۆر جار لەو حاڵەتانەدا زامی قووڵ و تینوێتی و خوێن لەبەر رۆیشتن برست لە مرۆڤ دەبڕن و بۆ ماوەی چەند کاژێرێك لە هۆش خۆی دەبەن و چوار پەلی کۆت دەکەن و ناتوانێت بستۆکێك لە جێی خۆی

بزوێت .. بەڵام ئەوەی ئەم پاکانەیەش پووچەڵ دەکاتەوە ئەوەیە کە ئەم قووڵی‌و کاریگەیەی زامی پاڵەوانەکە بە هیچ جۆرێك لە چیرۆکەکەدا دەرناکەوێت و نووسەر زۆر بە رووکەشی باسی زام و بێ‌هێزی‌و خوێن لەبەر رۆیشتنی پاڵەوانەکەیمان بۆ دەکات و وەك پێویست بایەخ بەم لایەنە نادات .

بەڵام ئەمــە هەرگیز لە ئاستی چیرۆکەکە کەم ناکاتەوەو دیسان دەگەڕێمەوەو دەڵێم ئەم چیرۆکە یەکێك لەهەرە چاکترین و بەپێزترین چیرۆکەکانی کۆمەڵەکەیە .

## بازنەیێکی داخراو

ژیــانی رۆژانەی پڕ رۆتینی بڕژوایەکی بچووك بابەتی ئەم چیرۆکەیە . چیرۆکنووس راستگۆیانە ژیانی بێ‌رەنگی مرۆڤێکی بۆ بەر جەستە کردووین .. ژیانێك هەموو شتێك تێیدا دووبارە دەبێتەوە .. هەموو ساتەکانی لێك دەچن و هیچ شتێکی نوێی تێدا بەدی ناکرێت .. بەرادەیەك ئەو مرۆڤە وای لێ‌هاتووە بڵێت «بــەیــانیــان کە لە خەو هەڵ دەسم خەمی ئەو رۆژە تازەیــە دامدەگرێ». ئەم مرۆڤەی پاڵەوانی ئەم چیرۆکە مامۆستایە .. پیشەی فێرکردنە ، پانزە ساڵی رەبەقە ژیانی لەسەر یەك نەغمە دەڕوات ؛ بەیــانیان دەچێتە قوتابخانە .. «زەنگ هەنگاوەکانم بەرەو پۆل راپێــچ دەکــات و زمــانیشم دەخـــاتــە گەڕو وەك موســەجیلەیێــك پەنجە بە دوگمەکەیدا بنێیت دەکەومە قسە ، گاڵتەم بە خۆم و بە قوتابیەکانیشم دێت» پاشان لە کاتی پشوودا دەچێتــە ژووری مامۆستایان و هەموو رۆژێك هەمان باس و خواس ... یاســای خزمەت و خانەنشینی ، مووچەو عەلاوە ، فلیمــەکەی دوێنێی تەلەفزیۆن ، تۆپێن ، رۆن، تەماتە، تاید، گرانــی ... تاد ئیـنـجـا پاش تەواو بوونــی دەوام بەرەو ماڵ دەبێتەوە.. لەوێش هەمان قەوانی رۆتین و بێزاری .. هەر کە لە دەرکــەی حەوشــەکــە دەچێتـــە ژوورەوە منــاڵەکــانی تێ‌ی دەرووکــێن.. ئەمیــان شکــات لەویان دەکات .. ئەویان ئەم تاوانبار دەکات .. پاشان شیرەو هەراو سکاڵای دایکیان کاسی دەکــەن ، ناچار بۆ خۆدەربازکردن لەم بازنەی بێزاری‌یە پەنا وەبــەر کتێب و خوێندنەوە دەبات بەڵام «مێشکم دەگوشرێ ، دەبێت بە وێستگــەیــەك دەیــەها شەمەندەفەری پێدا دێت و دەڕوا .. ووشەکان لەبەر چاوم دەکەونە سەما .. تێکەڵ یەکدی دەبن و خاڵێکی گەورە دروست دەکەن» بۆیە کتێبیش دەخاتە لاوەو بەرەو چاپخــانــەیەك دەکەوێتە رێ ، بەڵام سەد مخابن لەوێش کۆمــەڵێــك قســـەو باسی سوواو چرنـــووك لەمێشکی گیردەکەن.. بۆیە ئەوێش جێ دێڵێت و دەمەو ئێوارە بە ناچاری خۆ بە ماڵ دا دەکــاتەوە . بەم شێوەیە پاڵەوانی چیرۆکەکە لە (بــازنەیەکی داخراو)ی بێزاری‌و رۆتین دا دەخولێتەوە ، ئامێر ئاســا هەڵ دەسووڕێت و جووڵەو کردارەکانی میکانیکیەتێکی تەواویان بە خۆوە گرتووە ، کار دەکات .. دێت و دەڕوات.. لەناو خێزان و دەوروبەرەکەی‌دا دەژی بەڵام بە هیچ جۆرێك ئازاد نی‌یــە لە هەڵبــژاردن (الأختيــار)دا ، هیــچ شتێکی ژیانی بە گوێــرەی حەزو ویستی خۆی نی‌یەو هەموو شتێکی بەسەردا سەپێنراوە ، لەگشت لایەك بێزاری چاوەڕێیەتی (قوتابخانە ، ماڵەوە گۆڤــارو کتێب خوێندنەوە ، چایخانە) هەموو شتێك لە دەوروبـــەرەکــەی‌دا مایــەی وەرس بوون و جارسی‌و بێ هوودەیی‌یە، سەرجەم رۆژانی تەمەنی لێك دەچن و هیچ شتێکی نوێ لە ژیــانی‌دا ناخـــوڵقێت . ئەم پاڵەوانــە نمــوونــەیــەکی سیزیفی‌یە .. بێ هوودەیی دەوری تەنیوەو هەموو ئەو کارانەی بە ئەنجــامی دەگــەیــەنێت بێ هوودەن و دووبــارەو (دە)بارە دەبنەوە، (عبدالرحمن بدوي) دەڵێت : «کرێکار هەموو رۆژێك هەمــان کار بە شێــوەیــەکی بێزارکەر ئەنجام دەدات .. بەڵام هەست بە بێ هوودەیی کارەکەی ناکات تا ئەو ساتەی ووریا دەبێتــەوەو لەخــۆی دەپرسێت.. ئەم کارەم نرخی چی‌یە؟ کار دەکات بۆ ئەوەی بخوات.. دەخوات بۆ ئەوەی کار بکات ! بەم شێوەیە تا مردن.. ئەمەیە کۆتایی ناماقوڵی هەموو بوونەوەرێك»[٥]

ئەمــەش هەمان (بازنە داخراو)ەکەی پاڵەوانی چیرۆکەکەمانە، ئەمیش ووریا بووەتەوەو لە خۆی پرسیوە .. نرخی ئەم ژیانە چی‌یە؟ هەر بۆیەشە بەم شێوە قووڵ و بێ ئەندازەیە هەست بە بێ هوودەیی‌و بێــزاری دەکــات ، لە ئاست رەوتی شتــەکانی دەوروبەردا دەسەوسانەو وەك کۆتەرە دارێك خۆی داوەتە بەر زەبــری شەپــۆلە توورەو بە هێزەکانی ژیان ، وەك هەموو ئەو کەسانەی دنیایان لا بێ هوودەو ناماقوڵەو لەنێو گۆمی سستی‌و

تەمبەڵی‌دا خۆ نوقم دەکەن و بیانووشیان بۆ پاکانە کردنی ئەم سلبیەتەیان ئەوەیە کە بێ ویستی خۆیان هاتوونەتە دنیاوەو لە دایك بوونیان هەڵەیەکی گەورەی سروشت بووە .. لەبەر ئەوە هەر چۆن بەرپرسیار نین لە هاتنە دنیایان دا هەر بەم پێیەش بەرامبەر ژیان و ئەرکەکانی بەرپرسیارنین ، هەر لەم روانگەیەشەوە قێز لە کار دەکەنەوەو وەك هاوکێشەیەکی پووچ و بێ مانا سەیری دەکەن ، کارکردن لەپێناوی خواردن داو خواردن لەپێناوی کارکردن دا ، هەڵبەت لەمەش زێتر لە پاڵەوانی ئەم چیرۆکەو هەموو ئەو کەسانەی سەر بە چینەکەی ئەون چاوەروان ناکرێت ، ئەو لە هەموو شتەکانی دەوروبەردا وەرسی‌و بێ هوودەیی دەبینێت .. بەڵام ئایا چی دەکات بۆ ئەوەی هەوری رەشی ئەم بێزاری‌و رۆتینە لە دەوری خۆی برەوێنێتەوە؟ وەڵامەکە زۆر روون و ئاشکرایە : هیچ ! لە ژیان بێزارەو بە هیچ شتێك قایل نابێت .. نەفرەت لە هەموو شتێك دەکات بەڵام ئەوەندە خۆی ماندوو ناکات بەردێك لێرە هەڵگری‌و بیخاتە ئەوێ! بە چوار مشقی دانیشتووەو چاوەری‌یە هەموو شتێك بە ئامادەکراوی بێتە بەر دەستی . لە راستی‌دا مایەی خۆشحاڵی‌یە کە نووسەر زیرەکانە نمونەی مرۆڤێکی وا سلبی‌ی کردۆتە پاڵەوانی چیرۆکەکەی .. مرۆڤی وا کە لە ژیانی رۆژانەدا بە بەردەوامی تووشمان دێن .

نووسەر لەم چیرۆکەدا تەکنیکێکی ساکاری بە شێوەیەکی کۆك و پتەو بەکارهێناوەو گەرچی لەیەکەم ووشەوە تا دوا ووشە شێوازی گێرانەوە بە راناوی کەسی یەکەم (من) بە سەر چیرۆکەکەدا زاڵە بەڵام چیرۆکنووس بە سەرکەوتوویی دیالۆگ و مەنەلۆگی بەکار هێناوەو چیرۆکەکەیی پێ دەوڵەمەند کردووە بەمەش خوی لەشێوە گێرانەوەی سادەو تەقلیدی‌ی بێگیان دوور خستۆتەوە .

وەك ووتم نووسەر لە گێرانەوەی چیرۆکەکەی‌دا پەنای وەبەر راناوی کەسی یەکەمی تاك بردووە ، ئەم شێوازەش کۆنترین شێوازی گێرانەوەیە سەرتاکانی دەگەرێتەوە بۆ ئەو کاتەی مرۆڤ بۆ یەکەم جار قسەی کردو هەست و سۆزو ژانەکانی دەربری و سەر گوزەشتەی خۆی گێرایەوە ، یەکێك لە نیشانە دیارەکانی ئەم شێوازەش بەخشینی ئیقاعێکی نەپساوەو هارمۆنیەتێکی بێ گری‌و قۆرتە بە چیرۆکەکە چونکە راستەوخۆ هەست و نەست و خەم و ژان و خەون و هەڵچوونەکانی پاڵەوان لە خۆدەگری‌و بێ هیچ کۆسپ و ئاڵۆزی‌یەك دەریان دەبرێت . ئەمە جگە لەوەی ئەم شێوازە زێتر لە شیعرەوە نزیکەو کە چیرۆکنووس بەکاری دێنێت مەبەستی ئیستاتیکی‌ی پێ بەدی دەهێنێت . هەروەها یەکێك لە نیشانە گرنگەکانی تری ئەم شێوازە رەخساندنی دەرفەتە بۆ نووسەر تا ئاوێتەی کەسایەتی‌ی پاڵەوانەکەی ببێت و لە پشت دەنگی ئەوەوە دەنگی خۆیمان پێبگەیەنێت ، ئەمەش زۆر جار بەشێوەیەکی وا دەشکێتەوە کە خوێنەر نەتوانێت بە سانایی دەنگ و روخساری نووسەرو پاڵەوانەکەی لێك جیا بکاتەوە هەر وەك لەم چیرۆکەی بەردەستمان دا دەردەکەوێت ، چیرۆکنووس بە رادەیەکی ئەوتۆ دەنگ و رەنگی خۆی لە نێو خودی پاڵەوانەکەی‌دا تواندۆتەوە کە بوونی لە چیرۆکەکەدا ـ وەك خوڵقێنەری بەرهەمەکە ـ بە تەواوی وون بووەو لەنێو کەسایەتی‌ی پاڵەوانەکەی‌دا نەبێت بەدی ناکرێت ، ئەوەشی زێتر ئەم هەستە لای خوێنەر قووڵ دەکاتەوە بێ دەنگی‌و کرو کپی‌ی نووسەرە لە ئاست راو فەلسەفەو هەست و کەوتی سلبیانەی پاڵەوانەکەی‌دا ، ئاشکرایە ئەرکی نووسەر تەنیا لە جغزی تەنگی خستە رووی رووداوو کەسانی چیرۆکەکەی‌دا ناوەستێ بەڵکە دەبێت وەك لایەنێکی هەرە سەرەکی و گرنگی بەرهەمەکەی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر ئەو رووداوو کارەکتەرانە ئاشکرا بکات کە خوڵقاندوونی ، بێ گومان مەبەستیشم لەم ووتەیە ئەوە نی‌یە کە نووسەر لە پەراوێزی هەر چیرۆکێکی دا بنووسێت «خوێنەری بەرێز ئەوەش بزانە کەمن بەهیچ جۆرێك لەگەڵ پاڵەوانەکەم دا نیم بەڵکە دژی رەفتارو گفتاریم» نەخێر هەرگیز ئەمە ئیشی نووسەر نی‌یە ، بەڵام چیرۆکنووس دەتوانێت لە ری‌ی چەند ووشەو رستەیەکەوە یان لەری‌ی شێوازی گێرانەوەی سەرانسەری چیرۆکەکەیەوە هەڵوێستی خۆیمان بۆ دەربخات یان هەر هیچ نەبێت تەنیا وەك ئیحا ئیحای ئەوەمان بداتێ کە لایەنگری بیرو بۆچوون و رەفتاری پاڵەوانەکەیەتی یان نا . پێویستی‌ی ئەم هەڵوێست پیشان دانەی نووسەریش بە

تایبەتی لە چیرۆکێکی وەك ئەم چیرۆکەی کاك (حەسەن جاف)دا خۆی دەسەپێنێ (بەزنەیەکی داخراو) ، کاتێك چیرۆکنووس خوێنەر بەرەورووی پاڵەوانێکی سلبیو کۆمەڵێك راو بۆ چوونی ترسناك و تێکدەر دەکاتەوە ، دەبێت زۆر بە روونی ئەوە لە خوێنەر بگەیەنێ داخۆ مەبەستی لە خستنە رووی نموونەی مرۆڤێکی وا سلبی لە چوارچێوەی چیرۆکەکەیدا بۆ ریسواکردنی ئەو جۆرە کەسانەیە بۆ لایەنگرتن و پیا هەڵدان و پشت گرتنیانە ! لە راستیدا روونیو ئاشکرایی هەڵوێستی نووسەر لەم حاڵەتەدا زۆر شت لای خوێنەر دەگۆڕێت .. بگرە هەڵوێستێکی وا سەرانسەری چیرۆکەکە دەگۆڕێت ، هەر ئەم مەسەلەیەشە خوێنەر تووشی دوودڵیو رارایی دەکات لە بەردەم ئەم چیرۆکەدا و وای لێدەکات نەتوانێت (دەستخۆش) بە نووسەر بڵێت و چیرۆکەکە بە چیرۆکێکی پێزو سەرکەوتوو دابنێت ـ هەر چەند لە رووی تەکنیك و بینای درامیو دارشتنەوە کۆك و پتەوە ـ چونکە نووسەر لە سەرانسەری چیرۆکەکەیدا تەنیا رستەیەك تاقە وشەیەکی نەنووسیوە دەلالەت لە نارەزاییو دژایەتی کردنی ئەو جۆرە مرۆڤە سلبیو بێ هوودەییانە بکات ، بەڵکە بە ئاسانی هەست بەوە دەکرێت کە نووسەر بە درێژایی چیرۆکەکەی هەوڵی ئەوە دەدات جۆرە بەزەییو (تعاطف)ێك لای خوێنەر بخولقێنێ بەرامبەر پاڵەوانە سلبی و (نامۆ) کەی ! بەمەش بەیەکجاری مەبەست و ناوەرۆك و مەغزای چیرۆکەکەی ئاوەژوو کردۆتەوەو سەر لەبن هەڵی گێراوەتەوە .

## خەون

لەمەو بەر سەبارەت چیرۆکی «چەند ساتێك لە یادداشتەکانی نامۆیێك» باسی تەوزیف کردنی خەونم کرد لە چیرۆك دا ، هەمان بابەت لەم چیرۆکەش دا خۆدەنوێنێتەوە ، گەر لە چیرۆکی یەکەم دا خەونەکەم تەنیا بەشێکی بچووکی چیرۆکەکەی گرتبووەوە ئەوا لەم چیرۆکەدا سەرانسەری چیرۆکەکەی داگیرکردووە ، تەنانەت باڵی بەسەر ناوی چیرۆکەکەشیدا کێشاوە «خەون» .

ئاشکرایە مرۆڤ کاتێك خەون دەبینێت کە لە سەرەتای خەوتن دا بێت و خەونەکەی هێشتا قووڵ نەبووبێت ، هۆی فسیۆلۆژیی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە (چالاکیی بیرو هۆشی مرۆڤ هەر بەردەوام دەبێت و بەتەواوی لە کار ناکەوێت لە حاڵەتی خەونی تەنك دا «النوم الخفیف» چونکە ئەو خانانەی مێشك کە تایبەتن بە دروست بوونی خەون هێشتا کرداری کپ بوون «الکف» یان نەگەیشتووەتێ)[٧] ، هەر بۆیەشە لە خەون دا هەر وەك لەکاتی شیکردنەوەی چیرۆکی یەکەمیش دا باسم کرد ـ کۆمەڵێك وێنەی سەیرو نالۆجیك و ناماقووڵ بە تێکەڵ و پێکەڵی دێتە سەر رووپەری مێشك ، هەر ئەم نارێکیو ناماقووڵیەتەی خەونیشە پاڵ بە نووسەرانەوە دەنێت پەنای وەبەر ببەن و لەبەر هەمە جوداکانیان دا تەوزیفی بکەن بۆ وەدەست هێنانی چەند ئامانجێکی فیکریو ئیستاتیکی کە دووبارە باس کردنەوەی بە پێویست نازانم . بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە .. پاش خوێندنەوەی چیرۆکی «خەون»ی کاك «حەسەن جاف» هەست بە هیچ جۆرە دژایەتیو نارێکی ناماقووڵیو ناواقیعیەتێکی خەونەکەی نووسەریان راستتر پاڵەوانی چیرۆکەکەی ناکەین ، بە پێچەوانەی خەونەکەی نێو چیرۆکی «چەند ساتێك لە یادداشتەکانی نامۆیێك» کە زۆر بەروونی ئەو نارێکیو ناواقیعیەتەی تیا بەدی دەکرێت و نووسەر لەم لایەنەوە لەویان دا زێتر سەرکەوتوو بووە . بە رای من ئەم چیرۆکەی بەر دەستمان بە خەورایی بە «خەون» ناوزەد کراوە ، چونکە رووداو کەسان و وێنەکانی نێو چیرۆکەکە هەموو واقیعیو ماقووڵن و بە پێی بەدوایەکدا هاتنێکی لۆجیکی ریزکراون .

## راو

لەم چیرۆکەش دا هەمان تەکنیکی چیرۆکی «سێبەری داربەروو» بەکار هاتووە .. واتە ئاوێتە کردنی ئێستاو رابردوو لە هاوکێشەیەك دا ، بەڵام ئاوێتەکردنە کە لێرەدا جیاوازە.. لەم چیرۆکەدا هەموو رابردووی دوورو نزیك لە کۆمەڵێك یادو بیرەوەریو وێنەی هەمەرەنگ دا زیندوو نەبۆتەوە بەڵکە لە رێی تەنیا وێنەیەکەوە رابردوو لەساتەکانی ئێستادا رەنگ دەداتەوە، ئەویش دیمەنی راوەکەیە .. ئەم دیمەنەش پەیوەندییەکی بەهێز بە ساتەکانی ئێستا وەی هەمان دیمەنەکەی رابردووە

لەگەڵ هەندێك ئاڵوگۆڕدا ، شوێن هەر هەمان شوێنە (جەبەڵ بۆرو خاڵە بازیانی) ، کاتیش لە چەند ساتێك زێتر ناخایەنێت ، لە دیمـەنـەکـەی رابردوودا پاڵەوانی چیرۆك راوچی‌یەو لەگەڵ چەند هاورێیەکی‌دا دوای کەرویشکێك دەکەون . تا لەدوایی‌دا دەیپێکن ، بەڵام لە دیمـەنـەکـەی «ئێستـا»دا پاڵەوان خۆی نێچیرەو بەر گوللەی راوچی‌یان دەکەوێت .

لەراستی‌دا لەم چیرۆکـەشـدا تەکنیکی مۆنتاج کردنی دیمەن و یادەکانی رابردوو لەگەڵ ساتەکانی ئێستای رووداوی رووداوی چیرۆکـەکەدا بە رێك و پێکی ئەنجام دراوە . بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و مایەی مشت ومرە ئەوەیە کە هەر دوو دیمـەنەکە تەنیا لەرووکەش دا لێك دەچن و واتە تەنیا دیوی دەرەوەیـان «مـەسەلەی پێکرانەکە .. لە دیمەنی یەکەمیان دا پاڵەوان تفـەنـگـی بە دەسـتــەوەیــەو هەرەشــەی مەرگ لە کەروێشکێك دەکات ، لە کاتێکدا لە دیمەنی دووەم دا ئەم خۆی دەبێتە نێچیر لەبەر رۆشنایی ئاگرەکەی جەبەڵ بۆردا هەرەشەی مەرگی لێدەکرێو دەپێکرێ»، ئەگەر بەراوردو لێك چوونی دوو لاکـەی ئەم هاوکێشـەیـەی نووسەر بۆمانی خوڵقاندووە تەنیا لەلایەنی روخسارەوە بێت ئەوا بەرای من لە قووڵی‌و گەورەیی دیمەنی دووەم کەم دەکاتەوەو تەنیا پێ لەسەر خاڵێکی بچووکی هاوبـەش لەنێـوان هەر دوو دیمـەنەکەدا دادەگرێت ئەویش مەسـەلەی بێ گونـاهی‌یە .. بێ گوناهی‌ی کەوەکەو پاڵەوانی چیرۆکەکە ، هەر لەم روانگەیەشەوە بروام وایە کە نووسەر لە هەڵبژاردنی دیمەنی یەکەم دا ـ واتە بیرەوەری‌یەکەی رابردوو ـ سەرکەوتوو نەبووەو نەیتوانیوە مەبەست بپێکێ ، چونکە گەرچی هەر دوو دیمەنەکە لەروخساردا لێك دەچن بەڵام لە گەوهەرو ناوەرۆك دا زۆر لێك دوورن. ئەم نارێکی‌و ناهاوتایی‌یەی نێوان هەردوو دیمـەنـەکـەش کاریگـەری سلبی‌ی خۆی لەسـەر سەرانسەری چیرۆکەکە بە جێ‌هێشتووەو وای لەخوێنەر کردووە وەك کەوێکی بەسـزمـانی لە گوللەی راوچی هەڵاتوو سەیری پاڵەوانی چیرۆکـەکـە بکـات و لایـەنێکی هەرە سەرەکی لە کەسـایـەتی‌ی پاڵەوانەکە فەرامۆش بکات ئەویش ئەو هۆیەیە کەوای لێکـردووە بەو نیـوەشەوە بێتە نێو ئەو دەشت و دەرو گردۆڵکەو بەرزایی‌یە چۆڵ و سامناکاذەوە ژیانی خۆی تووشی مەترسی بکات . هەڵبەت ئەم لایەنە هەر لەبنەرەتەوە فەرامۆش کراوەو وەك پێویست بایەخی پێ نەدراوە لە لایەن نووسـەرەوە .

**لاوچاك**

خەڵکی گونـدێـك لە دەریـای تەمبـەڵی‌دا نوقم بوون .. گوندەکەیان بۆتە وێرانەو ژیانیان بۆتە خەوو خواردن و خەون بینـین بە رابردوویەکی دوورەوە کە گوندەکەیان تێیدا کانگای پیت و بەرەکەت بووە ، بەڵام بەرەکەت دا لە ناکاو هەر وەك لە ئاسمـانـەوە دابـەزی بێت «لاوە» دێتـە نێـو گونـد ، لاوێکی باڵابـەرزی گەنـم رەنـگـی چاوشینی قژزەردە ، خەڵك فێری خاوێنی‌و کارکردن بەرهەم هێنان دەکات .. لەپاداشتی ئەمەش دا لەلایەن چەند گوندیەکی دەروون رەشەوە دەکوژرێت .

ئەمە پوختەی چیرۆکەکەیە . بەر لە هەموو شتێك دەبێت ئەوە بڵێم کە ئەم بابـەتـە لە چیرۆکی کوردی‌دا زۆر دووبـارە بۆتـەوەو تەنـانــەت دەتـوانم بڵێم سواویشە ، زیندووترین و نزیکتـرین نموونە بۆ تەوزیف کردنی ئەم بابەتە لە چیرۆك دا چیرۆکی «ئـەفسـانـەی رێگای هات و نەهات» ی کاك «رەئوف بێگەرد»[7] ی چیرۆکنووسە ، چیرۆکەکەی «بێگەرد» لە رووی تەکنیك و دارشتن و ناوەرۆکیشەوە زۆر لەم چیرۆکەی «جاف» پتـەوترو بەپێزترەو «حەسەن جاف» لەم چیرۆکەی‌دا نەك هەر نەیتـوانیـوە لە چیرۆکـەکەی «بێگەرد»ی تێبپەڕێنێت یان بە تەکنیـك و دارشتنێکی جیـاوازو کۆکتر بابەتەکەی بخاتە روو بەڵکە لە ئاست چیرۆکەکەی ئەودا دەسەوسان و بستە باڵایە.

نووسەر بابەتی چیرۆکەکەی لەسەر چەند رەمزێك بنیات ناوە ، واتە مەبەستی سەرەکی‌ی چیرۆکنووس ئەو واتایە نی‌یە کە خوێنـەر پاش یەکـەم خوێنـدنەوەی چیرۆکەکە لای گەڵاڵە دەبێت بەڵکە ئەوەی نووسەر مەبەستێتی واتای شاراوەی ئەو دیوی ووشەکانە ، بەڵام سەد مخابن نەیتوانیوە لەم کارەی‌دا بە تەواوی مەبــەست بپێکێت و خۆی لە گەڵێـك هەڵەو ناکـۆکی ئاڵاندووە .

چیرۆکنـووس گونـدێکی کردۆتـە رەمـزی بێ‌هوودەیی‌و سستی‌و دواکـەوتــوویی ، ئەوەشمـان پێ‌رادەگـەیـەنێت کە سەردەمانێك ئەو گوندە کانگەی خێرو بەرەکەت بووەو «دەشتە

# گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان و وەرێبێژکرنەکا نە ل وەخت

مراد خوال

**د ژمارەیەکا گوڤارا بەیان دە (ژمارە ١٢٣ / ١٩٨٦) هێژا عزمت فندی کتێبا «گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان» ل بەر تیڕێ رەخنەی کێل و بێژنگ کربوو گەه ب نەرمی و گەه ب گهرمی چەند دەرگەهەك ل سەر ناڤەرۆکا کتێبێ ڤەکربوون ، ودانەرێ کتێبێ هێژا حەجی جەعفەر ل سەر بەرپەرێن ژمارە ١٣٦ چری‌یا پێشی ١٩٨٧ ژ گوڤارا ناڤبری ودبن ناڤ و نیشانێن «هەمی شوڵ ب راستی روین دکەڤتە ماستی» کێل و بێژنگ کرنا هێژا عزمت فندی هلسەنگاندی‌یە**

ئەژی ژکناری وی باوەری‌یێ کو «هەر پەرتووکەکا دکەفتە بازارا ئەدەبیاتێت کوردی دبیتە ملکێ گشت خوێندەڤان و نڤیسەڤانان ، لەوما هەلسەنگاندن و رەخنە لێ گرتن ژی ماڤێ هەمیانە» مینا دانەرێ کتێبێ دبەرسڤا رەخنەگرتنا کاك عزەت دە دبێژت ، دێ چەند دەرگەهەکان ب ناڤێ رەخنەی ل سەر کتێبا «گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان» ڤەکم وب هزار من ڤەکرنا وان هەکە دەرەنگی ژی هاتبت ئەڤ دەرەنگ هاتنە ب چو رەنگان نابتە ئاستەنگ درێکا ڤەکرنا وان دە چونکو کتێبا «گوتنێت مەزنان ل ....» بازارا وێ تم وتم گەرمە ونە کتێبا رۆژەك ودو رۆژانە مروڤ پشتی خواندنێ لێدتە قورنەیەکێ تاری وئێدی لێ نەزڤرت .. کتێبا ناڤبری بێدەرەکا ب ڤەرێژ ژڤەسەو گوتنێن مەزنان هلینایە ب چەند ئاخفتنەکێن سەرپێ‌یی بهایێ وان نائێتە دیارکرن . گولێن بەرپەرێن کتێبێ پێ هاتینە تفتڤاندن بۆ مە هەردەم دیاردکن کو راستە «ڤەسە شەکەرە بەلێ نە ل هەمی زمان و سەرا» ـ گوتنەکا مەزنانە ـ ئەز ب باوەرم ب دەرکەتنا ڤێ کتێبێ و یێن بەری وێ خواندەوارێ کورد ترسا بەرزەبوونا گوتنێن مەزنان ب یەکجاری هلینا .

هەکە ئەم بێن ومینا خواندەوارەکی داتراشی بەرپەرێن کتێبا ژێگوتی ڤەدن ، لەنگ و لاوازی دێ ل سەر ئێنە گرتن لێ ئەو لەنگ و لاوازی ل بەر خاسیەتێن باشێن کتێبێ ل خوە جڤاندین نابنە چو ژبەر کو سوختەیێن ئامادەیی‌یا پیشەسازی ل دەوکێ دەستێ هاریکاری‌یێ دبوارا کۆمکرنا تێکستان دە بۆ بەرهەڤکەرێ گوتنان درێژکری‌یە ـ بەرهەڤکەری بخوە ئەڤ چەندە دبەرپەرێ (١٨٠)ێ دە دەسنیشان کری‌یە وخالا یەکێ ژسوپاسا دبەرپەرێ سوپاسیێ‌دە هاتی بۆ وان سوختەیان تەرخان کری‌یە ـ نەدوورە نەشارەزایی‌یا هندەك ژوان درێنڤیسا کوردی‌دە ولەزا هندەکێن دی دایە بەرخوە ژبۆ کۆم کرنا گێیارەکا (تڤاڤەکا) بەرچاڤ ژبەر هەر ئەگەرەکا هەی ل پشت لەنگی‌یێن ئەم ل بەر دەسنیشان کن راوەستت . درووشمێ کێم شارەزایی‌یێ وخوە بەهبیرکرنێ ب ژمارەیەکا بێخێرڤە دیارە ئەز ب باوەرم هەکە بەراوردکرنەکا ل سەرخوە وبێ چاڤ گرتن بهاتا کرن دگەل وان بەرهەمێن بەری «مشتاخا چیا ژ گوتنێن پێشیار»[1] دەرکەفتین ؛ کتێبا «گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان» راست و دروست ژناڤ و نیشانێن پێ‌هاتی‌یە ناڤکرن دەرنەدکەفت . ل ئێرە تێ‌هەیە خواندەوار بێژت : چو گومان ناچنە ناڤ و نیشانێن کتێبێ هەتا تو ئاخفتنا بۆری بکی ؟ قوتانا ڤی دەرگەهی بێ هلسەنگاندنا ئاخفتنا بەرهەڤکەری ئەوا دبێژت «ئەڤ گوتنە هەمی تێکرا ، ل دەڤەرا بەهدینان ، هاتینە کۆمکرن و خرڤەکرن ، لەوما مە ناڤێ وێ دانی «گوتنێت مەزنان ل ....»[2] بێ بنیاتە

. هەكە ئەگەرا گۆتنا بۆری ئەوبت ناڤێ وەرگرتنێن (اقتباس) ژ كتێبێ بدتە پاش و مەوە تێ بگەهنیت كو گۆتنێن ١١٨ بەرپەر (ژ ب ١١ - ١٢٩)پێهاتینە ڕەش كرن ب دەربەكێ ل دەڤەرا بەهدینان تێنە گۆتن ، گۆتنەكە ب پشت ڕاستی نائێتە وەرگرتن . چونكو گەلە گۆتن ژوان ئەون یێن ژ ژێدەرەكێ دی هاتینە وەرگرتن ، هەكە وان گۆتنان شوونمایەكا خوە ل دەڤەرا بەهدینان هەبت ، ئەو شوونكایە گۆتنێ دقالبێ پێهاتی‌یە پێش چاڤ كرت . ل بنێ گوهی‌یە هنە گۆتن هەمان ڕامانێ چ دوور چ نێزیك بدن لێ نە ب هەمان داڕێتنێ . جودایی‌یا دناڤبەرا وان و یێن ل دەڤەرا بەهدینان تێنە گۆتن (ب وێ ڕامانێ تێن) خوە ل جودایی‌یا فۆنەتیكی ژی ناگرت ، چونكو نە جودایی‌یەكا فۆنەتیكی‌یە . نێزیكی (٧٠) گۆتنان ژكتێبا «كۆمەڵە تێكستی فولكلۆری كوردی»[٣] هاتینە وەرگرتن . ل ئێرە ئەمێ وان بەرچاڤ كن یێن دروشمێ وان هەتا ڕادەیەكێ پێڤە مای مینا :

● ئاگر بێ ئالاڤ نابە (ب ١١) دەق ب دەق ژكتێبا «كومەڵە تێكستی فولكلۆری كوردی» بەرپەڕێ (٢٢٢) هاتی‌یە وەرگرتن .

[بلا ژ ئێرە و پێدە خواندەوار بزانت دەقێ دووێ تم یێ كتێبا «كۆمەڵە تێكستی فولكلۆری كوردی»یە بێ كو هەرجار ناڤێ وێ بێتە ئینان]

● **ئاش دشغولی،ل سەر ئاڤێ،كور دگەڕیێ ل شغولێ بابێ (ب ١١)**
ئاش دشخولی ل سەر ئاڤێ ، لاو دگری شخولی باڤێ (ب ٢٦٣)

● **بلا نە ژمندابە ، بلا ژئالێ دایكا من دابە (ب ٢٣)**
برا نەژمندابە ، برا ئالیێ دایكا مندابە (ب ٢٢٥)

● **بلا مێرێ من كال بە ، بلا كراسێ من ئال بە (ب ٢٣)**
برا مێرێ من كال بە ، برا كراسێ من ئال بە (ب ٢٢٤)

● **چرایێ چ كەسا هەتا سوبێ ناشغولیت (ب ٣٨)**
چرا هەر كەسی هەتا سبێ ناشخولە (ب ٢٣٠)

● **دەڤێ وی ژشیر دشەوتە ، پف دكەتە دەو (ب ٥٠)**
دەڤێ وی ژشیر دشەوتە ، ئەو پف دكە دەو (ب ٢٣٤)

● **دەستێ وی نە ژدێرێ دقەتە ، نە ژمرگەفتێ (ب ٥٣)**
دەق ب دەق (ب ٢٣٤)

● **دونیا گولە ، بیهن كێ‌و بدەڤ هەڤالێ خۆ (ب ٥٣)**
دونیا گولەكە ، بهێن كە ، بدە هەڤالێ خوە (ب ٢٣٣)

● **ژنا دل‌گر ،دیوار قول كر ،مێری دل گر دیوار خواركر (ب ٦٤)**
ژنە دل گر ، دیوار قول كر،مێر دل كر ،دیوار خواركر (ب ٢٣٧)

● **ژهەسپ كەڤتن عەیبەك ژكەركەڤتن دو عەیب (ب ٦٥)**
ژهەسپ كەتن عەیبك ، ژكەركەتن دوو عەیب (ب ٢٦٥)

● **شەڤ ل مرۆڤا ڕەش بوو ،كەلەك مرۆڤ ژشەڤێ ڕەش ترن (ب ٧٣)**
شەڤ ل مەرڤان ڕەش بوو،گەرەك مەرڤ ژشەڤێ ڕەشتر بە (ب ٢٤٠)

● **كچا میرا ب قەلەنێ گاڤانا ، ناچتە مێر (ب ٨٣)**
كەچا میران ، قەلەنێ گاڤانان ناچە مێران (ب ٢٤٢)

● **كی دخەوێدا ، ئاڤێ بدەت تە وێ دەستگرتیا وی‌بە (ب ٨٤)**
كی خەونێدا ئاڤێ بدەتە ئەوێ ببە دەستگرتی (ب ٢٤٣)

● **هەر كەسەك دبێژت بلا بەرێ كەڤچی ل ئالێ من بە (ب ١١٨)**
هەر كەس دەبێ بلا بەرێ كەڤچی بەلایێ من بە (ب ٢٦٦)

● **هەچیێ بلەزینت ، دێ چەرخا خوە قەتینت (ب ١٢١)**
هەچی بلەزینە وێ چارخا خوە بقەتینە (ب ٢٥١)

چەندەك ژكرمانجی‌یا ژێری ژی (سۆرانی) هاتینە وەرگرتن و وەرگێڕان ژوان :

● **گۆتن هزارە ، بەلێ یەك ل كارە (ب ٨٩)**
دەقێ سۆرانی دبێژت :«قسە هەزارە ، دوانی بەكارە»[٤]

● **هەكە گول نەبی ، ستری ژی نەبە (ب ١٠٨)**
دەقێ سۆرانی دبێژت : «ئەگەر گوڵ نیت ، دركیش مەبە»[٥]

● **ئەوێ من پێ‌ی دكر خێر ، ل من بوو گورگ و شێر (ب ١٥)**
دەقێ سۆرانی دبیژت :«ئەوی پێم ئەكرد خێر لێم بوو بە گورگ و شێر»[٦]

ڕاستە «پەندێن كوردی هەر چەندە ل گۆر جودایی‌یا دیالێكتا دەڤەران جودانە ، بەلێ ناڤەرۆكا وان هەر یەكە» مینا د. شوكری‌یە ڕەسوول دبێژت[٧] . گۆتنا مەزنان دەربڕینا كەسەكێ‌یە دبوارا ڕەفتارێ كەسەكێ یان كۆمەكێ‌دە وەڤێشكی‌یا دەروونی و جڤاكی‌یا (التكوین النفسی‌و الاجتماعی المشترك) كوردێن مللەتی نەكوو بەس جانا بەلكوو تێ‌هەیە گەلەجا وان دبەر هندێ‌ڕە بكت هنە باوەرو دیتن بۆچوونێن یەكگرتی دبوارا هەڵوێست و دیاردێن دتێكەلی‌یا جڤاكی‌دە (التفاعل الاجتماعی) دكەڤنە پێشی‌یا وان داڕێژنە قالبێ گۆتنا مەزنان . ئاخفتنا بوری ب چو ڕەنگ و ڕوویان ڕێ نادتە مە ئەم پەندەكێ ژ دیالێكتەكێ وەرگێڕنە سەر دیالێكتەكا دی بێ ئەم بزانن كا ئەو پەندە ددیالێكتا مە پەند وەرگێڕانە سەر دە هەیە یان نە !!! سەرباری ڤێ چەندێ دڤێ ئەم بزانن كو ئاخفتنا د. شوكری‌یە هندێ ناگەهینت كو پەند نین دقالبێ داڕێتنا خوەدە دچارچۆڤێ دەڤەرەكێ‌دە بێنە قەفاندن (حصر) بەلكوو هندێ دگەهینت هەكە دكرمانجی‌یا خوارێ دە بێتە گۆتن «قسە هەزارە ، دووانی بەكارە» ل دەڤەرا بەهدینان وەهەر ب وێ ناڤەرۆكێ تێتە گۆتن «ئاخفتن بیست و شەشن ،سێ ژێ د خوەشن» وەهەكە دكرمانجی‌یا خوارێ‌دە بێتە گۆتن «ئەوی پێم ئەكرد خێر لێم بوو بە گورگ وشێر» ل دەڤەرا بەهدینان وب ناڤەرۆكەكا نێزێكی ناڤەرۆكا گۆتنا بۆری دبێژن «م عەلماندە مەلەڤانی‌یا دڤێت م بخەندقینت» وەهەكە ل قولانجەكی دەڤەرا بەهدینان و ب كارێ ئەنجاما كریارەكا بێ دلی یێ گۆتن ژرێڤە (ئەولی) كری یان ب كارێ خوە چێتر دیتنەكا (تفاضل) ل سەر بنیاتێ عەشیركانی (التعصب القبلی) هاتی‌یە كەركرن وەختەكێ هاتبنە گۆتن وەهەتا ئەڤرۆژی بێتە گۆتن «سندی ددینن ، سووژن و بسووژنا دچینن، یا ژ وانڤە سیسن و بەیبوونن»

سەردەمـەکێ ل قولانجـەکی تاری‌یێ دەڤەرا سلێمانی‌یێ کابرایەکێ ب کارێ دیتنا رەفتارەکی بێخێر ژکابرایەکی هەورامی یان ب کارێ خومچێتر دیتنەکا نە گەلە ژیا بۆری جودا مینا دانەرێ (واضح) گۆتنا بەری نوکە مە بەرچـاڤ کری ژسنویرێ دەرکـەفتی‌یە و ب چێلەکا رێخەلۆك گارانەك هەرماندی‌یە وگۆتی‌یە :«هەورامیی لەبەر مەرامی کاری ، بن کلکی کەری خۆی ماچ ئەکا»[8] وگۆتنا وی هەتا ئەڤرۆ ژی دناڤ خەلکێ دەڤەرێ‌دە مایە !! ب کێش وپیڤـانێن وی وەختی خودانێ گۆتنێ هەکە ژگونەهێ هاتبتە شوشتن ئەڤرۆ ب کرنا گۆتنێن هەمان ئەگەر (غاية) ل پشت ، ب کێش و پیڤانێن ڤی چەرخی کەس ژمە ژگونەهێ نائێتە شوشتن و پشتا کەس ژمە ل سەر گۆتنا وان ـ م گۆ گۆتن م نەگۆ نڤیسین ـ نائێتە گرتن نەمازە هەکە ژدلێ مە دەرکەڤن !!

ژ سەرێ ئاخفتنا بۆری کەس وەتێ نەگەهت کو ئەز دنەیبەنەکێ دە دژی رێـزکرنا پەندێن دیالێکتەکێ تەڤی (دگەل) پەندێن دیالێکتەکا دی راوەستایمە .. بەلکوو ئەز دژی هندێ راوەستایمە پەندێن دیالێکتەکێ ل سەر حسێبا دیالێکتەکا دی بێنە رێز کرن . ب رامانەکا رۆنتر : هەکە هێژا ح . جەعفەر کتێبا خوە ب ناڤێ «گۆتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان» ب ناڤ نەکـربـا نەبـەس هاتنـا چەند پەندەکێن ژدیالێکتا سۆرانی هاتینە وەرگـرتن پشتی وەرگێرانی دناڤ بەرپەرێن کتێبێ‌دە بەلکوو هاتنا گەلە پەنـدێن نەوەرگـێرای ژی ژدیالێکتا سۆرانی یاهەر دیالێکتا دی‌یا زمانێ کوردی دا کریارەکا ئاسایی (اعتيادى) بت .

هنـە گۆتنـێن دی دکتێبێ‌دە هاتینە درووشمێ وان نە درووشمێ گۆتنێن مەزنانە ـ ل ئێرە مەبەست ئەوە کو نەژوان گۆتنانە ئەوێن ئەم ب ناڤێ گۆتنێن مەزنان ب ناڤ دکن ـ ناڤەرۆك ورەنگ و رووبارێ هندەکان ژێ ژێکا بیرو باوەرێن پێشی‌یان دەرکەفتی‌یە ، ئەم دشێن بێژن فلقازەکە (قفزة) ب سەردەمێ کەڤن نائێتە هاڤێتن . ب رەنگ و رووبارەکی ئەدەبی هەڤچەرخ هاتینە دارێتن و هندە زاراڤێن زانستی ب خومرە کێشاینە هێژ قنیاتا گەلەك ژمە پێ نەهاتی‌یە ڤێچا هەتا یا باب و باپیرێن مە !! تڤاڤەك ژێ ب سەرچێکرنێ ڤە دچن کەتا مایین بێنا وەرگێرانێ ژێ تێت بۆ نموونە :

● ئەو بازێـرێ پشیـك حاکمێ وی بت ، هەمی مشکێت وی بازێـری دگونهبارن (ب ١٤)

● **خوێندەواری روون دکەت ژینا تاری (ب ٤٦)**

● **ژن نیڤەکا کۆمەلی‌یە (ب ٦٢)**

● **ژن هێنان نیڤەکا ئیمانی‌یە (ب ٦٣)**

● **ژیـان دارەکە دبێژنێ ئاوات ، ژ بەرێ وێ ناخۆی بێ هەول و خەبات (ب ٦٤)**

● **ژیـان شتلەکـا تەرو نازکـە ، هەکە نەهێتە سەخبێرکرن ناهێتە بەرین (ب ٦٥)**

● **شاعیر راستی‌یێ ژدو لێڤێت ژەهرکری دمێژیت (ب ٧٣)** دەقێ ڤێ گۆتنێ ب عەرەبی ب بەرچاڤێ من کەفتی‌یە . ب خوە گۆتنەکا هۆزانڤانێ ئەمێریکی ولیام رۆزە (١٨٨٦ ـ ١٩٥٠) دەقێ من دیتی دبێژت «من يكتب الشعر يمتص الصدق من شفتي الحياة المسممتين»[9]

● **مرۆڤی بێ دەنگ فەیلەسووفە ! (ب ١٠٠)**

● **هەکە مالا تە شووشەبیت ، بەرا نەهاڤێژە مالێت خەلکی (ب ١١١)**

گۆتنەکا ئینگلیزی‌یە دەقێ وێ یێ دروست ئەڤەیە :

( Those who Live in glass houses should not throw stones ) ئانکو ئەڤێن دخانی‌یێن شووشەڤە دژین دڤێت بەرا دکەسێ وەرنەکن ـ ساكنوا البيوت الزجاجية يجب أن لايرشقوا أحداً بالحجارة .[10]

● **یەکێتی کلیلکا سەرکەتنایە (ب ١٢٧)**

راستە گۆتنێن مەزنان ـ ب تایبەتی پەند ـ دبنکارا خوەدە ژدەڤێ هنە فاماو دنیادیتی‌یان هاتینە وەرگرتن وکەفتینە سەر زمانێ خەلکی ، پشتی وەختەکێ وەخت ب سەرڤەچۆی ناڤێ خودانێ ئاخفتنێ بەرزەبوونەو قەسا وی وەکە خوە دنێڤ خەلکی‌دە مایە وبوویە پەند .. لێ ئەڤە رێکا هندێ نادتـە مە راست ورێ (یـەکسەر) گۆتنەکا ب خودان تەڤی پەندان ئەم رێزکن .

«گـۆتنـێن مەزنان .. چەند بیرو باوەرەکێن هەڤپشکێن (مشترك) سەرەتایی‌نە ـ بدائی»[11] نەینکا دیتن و رێنانا کۆمەلیشکێن سادەو ساکارە (الجماعات البسيطة) لەورا بەرچاڤ کرنا گۆتنەکێ یان دووان دکراسەکی فەلسـەڤی یا نەتـەوی هەڤچـەرخ دە تەڤی گۆتنێن مەزنان نابتە نیشانا هەڤپشکی‌یـا ژێـدەرێ وێو یێ گۆتنا مەزنان . دان و ستاندن ل سەر گرێـدانا دێنانا گۆتنا مەزنان ب هەمی دەمان ڤە ول هەمی جی‌یان هێژ نەگـەهشتی‌یـە چو ئەنجامێن ژگومانێ شوشتی . یەك ژ فولکلۆریستێن کوردان یێن دێنـانـا پەندێ ب هەمی دەمان ڤە گرێدای د . شوکری‌یە رەسـووله ، دەمێ تێتـە سەر دابێشـا پەنـدێ دڤی چەرخی‌دە دبێـژت «بێگومان لەم چەرخەدا پێویست بەپەند داهێنان زۆر لە جاران کەمترە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پەند هەر دایەت و لەمەو پاشیش هەر دایەت»[12] دگەل هندێ ژی ژگۆتنەکێ پێڤەتر نابینت پشتا خوە پێ ئاڤنەهـ بکت . ژبلی د . شوکری‌یا رەسوول هەنە دێنانا پەندێ یان دروست کرنا وێ دچەرخێ ئەم تێـدە دژین مانـدەلا دکن ، دێنانا پەندێن هەیی هەمی یان ب بال سەردەمـەکی پێشترڤە لێ ددن ژوا نەمر (علاءالدين سجادى)یە دەمێ دبێژت «.... مێژوو باسێکمان بۆ ناکا لە ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆزدەهەم بەم لاوە پەنـدێك دروست بووبێ ؟! ئەم پەندانە کە هەن هەمووی هی پێشتـرە ، پەنـدی‌تـر ئێستە دروست نەبوو کە تا بۆ بەرەکانی داهاتوو ئەمەش بێ بەپێشینان بۆ ئەوان وەکو ئەوانەی پێشوو بوون بەپێشینان بۆ ئێمە ؟!»[13] بێ گومان رەحمەتی ع . سجادی ئاخفتنا خوە هۆ ترسی

نەهاڤێتییە بەرمە . چەند ئۆشت وئەگەرەکێن دیارکرین و بریارا راوەستانا چێ بوونا پەندێ دچەرخێ ئەم تێدە ل پشت وان ئۆشت و ئەگەران دایە، وبەری وان ئۆشت و ئەگەران بدێنتە سەر بەرکێ ، مەدکێشتە سەر وێ

راستیێ کو نەخـوانـدەوار ژخـواندەواران زێدەتر ب گۆتنا پەندان ڤە دگرێداینە ، کوردێن دووری باژێران و دووری خواندنێ چ گاڤا دکەڤنە کێش و ڤەکێشـەکێ یان دان و سـتـانـدنـەکێ ب لەز ژبـۆ پشتەڤانیو چەسپاندنا ئاخفتنا خوە گۆتنەکا مەزنان تینن و دبێژن : مەزنا هوگوتییە ، یان مە ژمەزنا گولێبوویە دبێژن ....[14] ئانکوو هلاتنا گوتنا مەزنان ب ژیانا گوندو ئوجاخان ڤە ، ب رەوشت و ساکاریا کوردێ دوی چارچوڤەی دە دژیت، گرێددت . ڤێجا مادەم «ژیانە سادەکە باری کرد ...... رەوشتی ناوچە نەما»[15] ب گۆتنا رەحمەتی ، نێزیك بوونا خەلکی ـ نهۆ ـ ژێك و زووگەهشتنا دەنگ و باسێن هەمی جیيان بوجهێن دی پشتی نێزیك بوونا رێو رێباران و بەلاڤبوونا داهاتییێن نووژەنێن (المخترعات الحديثة)بیانی ب هەمی ئەردان ڤە ژرەخەکێ وکەفتنە تۆرا بۆشاتییا تەنگ و ئاستەنگێن ژیـانێ ژرەخەکی دی رێ ل سەر دروست کرنا گوتنەکێ ب ناڤێ گۆتنا مەزنان گوهارت .[16] ب راستی گرێدانا دروست بوونا پەندێ ب رەوشت و سادەو ساکاریا ژیانەکا دەرتەنگ مینا یا رەحمەتی ژێ گۆتی گرێدانەکە ژپێ راستییێ دەرناکەڤت لێ بەلێ شوونماییێن سادەو ساکاریا وێ ژیانێ هێژ ب دروستی ژناڤ مە نەهاتینە هلینان (راکرن) ، ئەم وئەو ژیانە ب دروستی ژێك نەهاتینە شوشتن . ژبەر هندێ دروست بوونا گۆتنا مەزنان دچـارچوڤێ ژیانەکا نەگەلە ژیا بۆری جودا دهەمی دەما دە بەرئاقلە . ودیسا ژبەر هندێ زاراڤێن زانستیو رێژمیێن راستییێن تەڤایی (الحقائق العامة) دەرپێش دکن مینا : خوێندەواری ، نیڤەکا کۆمەلێیە ، ژیان دارەکە دبێژنێ ئاوات ، یەکێتیو ..... ب رەنگەکی گشتی هەڤچەرخن وهاتنا وان دگـۆتنـەکێ دە هنـدێ دگەهینت ئەو گۆتنە نەگۆتنا مەزنان بت . ل ئێرە مەبەستا من ئەوە : هەکە ژێدەرێ هنە گۆتنێن مەزنان نەباب و باپیرێن مە یێن نەخواندەوارین دسەردەمەکی پێشتردە ؛ هەڤپاکێن وانە دسەردەمەکی پاشتردە و ب هندێ دهەردوو سەردەمان دە ـ ئەم بێژن و نەبێژن ـ رەنگ و رووبارێ گۆتنێ دێ یەك بت .

یەککـرتنـا (وحدة) ژین و ژیارو رەوشت و تیتالێن هەردوو کۆمەلیشکێن (جماعة) ژێ گۆتی شێوازەکی یەککرتی دخوازت ، ئەو شێوازە سەداسەد ژڤەسەو پەیڤێن رامانێن هەمەکی (المعاني الكلية) دگرت ـ مینا یەکێتی ، کۆمـەل ، ... ـ شوشتییە . «زمان ل پەی رووکارێن گشتییێن میللەتی (اتجـاهـات الأمـة العامة) ؛ ل پەی داخوازو دیتنا وی دژینێ دە تێتە کەرکرن»[17] ، ڤالاییا شێوازێ مە بەری نوکە دەسنیشان کری ژڤەسەو پەیڤێن رامانێن هەمەکی دگرت دژڤرتە سەر بەرو بەیاڤێ رەوشەنبیریو پێکا هزرکرنا (مستوى التفكير) خودانان .. پەیڤێن مە ل سەلال بەرچاڤ کرین

ـ مەبەست یەکێتی ، کۆمەل ، و ... ـ ژڤەرێژا کولکەشییێ (الازدهار) و بەلاڤبـوونـا بیرو باوەرێن نووخـوازە ئەمـازە پشتی هزرکـرن ب کارێ پێشکەفتنێ زێدە زێدە گەرم بووی وپێ زانین (الادراك) ژبەرێ کوورتر لێهاتی و پشتی رەوشەنبیران گەلە پەیڤێن فەرهەنگا زمانێ خوە ـ کۆمەل یەك ژوانە ـ ژبەر پێدڤیێن (متطلبات) ژینا نوو ژرامانا تەنگ دەرخستین و رامانەکا ماستر پێرادای .

ژچەندا بۆری بۆ مە دیاربوو گۆتنێن سەیدا ح . جەعفەر کۆم کرین هەکە هەمی ل دەڤەرا بەهدینان ژی هاتینە خرڤەکرن ، هەمی نەئەون یێن ل بەهدینان تێنە گۆتن وب رێکا بهیستنێ هاتینە وەرگرتن . چەندەك ژێ ب چ رێکـا هەی هاتینـە وەرگـرتن (اقتبـاس) بێکـو ژێـدەرێ وان بێتـە دەسنیشان کرن .

لەنگ ولاوازییێن کتێبێ یێن دی ئەمێ ژئێرە و پێدە ل دوو ئاخفتنێن بەرهەڤکەری ب خوە هلسەنگینن و ل گۆر بۆ چوونا خوە ئەمێ وان ئاخفتنا کێل و بێژنگ کن کا هەتا چ رادە ئەو ئاخفتن و ناڤەرۆکا کتێبێ دکەڤنە یەك

١ـ هێژا ح . جەعفەر دپێشگۆتنا کتێبا خوەدە دبێژت : «ژدەست کارێ خوە دور ئێخستیە [ژکرا گۆتنێن وی کۆم کرین] ، چەوا مە گوە لێبوینە ، وەلێ مە دانیە قەلەم ، چونکی ئەم ل سەر وێ باوەرێنە کو فلکلۆرێ کوردی سامانەکێ بلندو پیرۆزە ، نابیت دەستکاری تێدا بێتە کرن ، لەوما هەتا پەنـدەکا لەنگ ژی بیت، مە دەست نزیك نەکریە»[8] . وهەمان گۆتنێ ب دارێتنەکا جودا دپەراوێزی بەرپەرێ (٧٨)دە دوبارە دکت . هەکە ئەم بێن و ئاخفتنا بۆری ل بەر کەرستێ (مادة) کۆم کری وەربێش کن گەلە پسیار دێ خوە هلدن ژوان :

یەك ـ ئایـا هنـە گەتنـێن کتێبا ئاخفتن ل سەر ب بەر دەسکارییێ کەفتینە یان نە ؟

دو ـ دورستە گۆتنەکا لەنگ بکەفتە بەرمەو وەکە خوە لەنگ بمینت بێ بێتە راست کرن ؟

سێ ـ ئەگەرا لەنگیا هنە گۆتنان چییە ، هەکە هەبن ؟

دبـەرسڤـا پسیـارا یەکێدە ئەم دشـێن بێـژن بەلێ هنـە گۆتن ب بەر دەسکـارییێ کەتینـە، هنە زاراڤێن هەڤچەرخ کو نەژمێژا هاتینە دێنان یالێکدان پێرە هاتینە بۆ نموونە :

● **هەمی شۆل ب تێبینی (ب ١٢١) تێبینی پەیڤەکا نولێکداییە .**

● **هووش چەکەکی زێرییە ، ددەستێ هەمی کەسادا نیە (ب ١٢٣)** دبێژن «ئاقل تاجەکی زێرینە ل سەرێ هەمی کەسی نینە» .

فلکلورێ کوردی سامانەکێ بلندو پیرۆزە ، نابیت دەسکاری تێدا بێتـە کرن» لێ بەلێ تشتـەکی ئاشکـەرایـە کو فولکلۆرێ ناڤبـری سەرەکوهییەکا وە ژێ نەهاتییە کرن کو هەمی بێتە سەرکاغەز کرن و نڤیسین سەبا ڤێ یەکێ هێژ ب خوە دچارچوڤێ تێکستەکی نەگوهۆریدە

نەهاتی‌یە راگرتن خوە ژپێش و پاشی وکێم زێدەیی‌یێ پارێزت . هەکە هێژا ح . جەعفەر تێکستێن ب خوە ژدەڤێ خەلکی بهیستین وێین ب رێکا شاگردێن خوە بەرهەڤ کرین ب تێکستێن راست و دروست وبێ دەسکاری بزانت دڤێ هزرا لەنگی‌یێ ژچو پەندان یاگوتنان نەکت . تێکستێ دورست خوە ناکێشتە لەنگی‌یێ .

ددەرگەلا (ددەرهەڤێ) پسیارا دووێ‌دە ، چەتنە بەرسڤا وێ ب (ئە) بێتە دان چونکو کارێ بەرهەڤکەری ل کوم کرنا تێکستان راناوەستت . دڤێ بەرهەڤکەر بەری هەر تشتەکێ ل دوو رامانا گوتنێ بچت و هەکە چیروک و سەرهاتی‌یەک ژی یێ هەبت سەرکاغەزکت ، دا خواندەوارێ خوە نەهێلتە دناڤ کومەکا پسیاران رە .. دڤێ گوتنێن بەردەست کرین یەک ب یەک ـ نەمازە ئەڤێن رامانا وان ب مژوموران وئەڤێن ب ئیدیوم (درکە و تەشبیە) تێنە ژمارتن ـ ب دەستکیسی‌یا چەند کەسەکێن دان عەمر وب ناڤ سالان دەچوی وفولکلورزان سەرراست کت وپاشی شروڤەکت . هەکە لەنگی ب هەر مهانەکا هەی بمینتە هلاویستی بێ‌بێتە چارەسەرکرن ، باشتر ئەوە بێتە دەسنیشان کرن هەکە نە ... هەر کەسێ ماڤێ هندێ هەیە رەخنەی لێ بگرت ، کەس ب گوتنا «هەتا پەندەکا لەنگ ژی بیت ، مە دەست نزیک نەکریە» بارێ بەرپسیاری‌یێ ژبەرهەڤکەری ڤەناکت و بدتە سەر یەکی دی .

بەری ئەم خوە ب بەرسڤا پسیارا سی‌یێ بکن پێدڤیە گوتنێن لەنگ بێنە بەرچاڤ کرن دا سەروبنێن پسیارێ ب سەرەکێ بکەڤن و ب بەرسڤەکێ ڤە بێنە دالەقاندن نەهەر سەرەک بو خوە بچت . ژگوتنێن لەنگ چەندێن خوارێ ب نموونە مە هلبژارتینە :

● **هەڤرکێت مێرا مێرن ، هەمرکێت ماقویلا کرمانجێت تێرن (ب ١١٦)**
هەمزکا دگوتنێ دهاتی هەڤرکە . سەبا نەخوەش خواندنێ بوویە هەمزک ـ هەکە ئەڤ پەیڤە دڤەرهەنگوکا کتێبێ‌دە نەهاتبا راڤەکرن مەدشیا ئەم بێژن خەلەتی یا چاپێیە ـ دوبارەکرنا پەیڤا هەڤرک دگوتنا بوری‌دە بڤێ‌نەڤێ‌یە (حتمیة) کراسێ گوتن تێدە دخوازت .

● **تاڤێت بهارا ، سەرلەڤێت سیارا (ب ٣٢)**
گوتنا دورست دبێژت «تاڤێ‌بێت بهارا ، سەلەڤێت سوارا» سەلەڤ کوما سواران ب پێکڤەیە .

● **دەرمو ل مروڤی دبن ، ل مریا نابن (ب ٥١)**
ئەڤ گوتنە ب خەلەتی هاتی‌یە وەرگرتن . گوتنا دورست دبێژت «بێ‌بەختی ل مری‌یا دبن ، ل زێندی‌یا نابن» هەکە دەرمو بەس ل مریان دبن وەری ژی هەر چەندە کومەکا هەستی‌یە دگورا تەنگ و تاری‌دە لێ ئەوژی هەر دساخی‌یا خودەدە مروڤ بوو .

● **مێر چوویە ، ژن قابویە (ب ٩٦)** گوتنا راست و دورست دبێژت «مێر جویە ـ جویا ئاڤێ ـ ژن قابویە ئان ژی قافویە» ئانکو مێر تشتی تینت وەکی جوکێ کا چاوا دارلەییکا تینت و ژن دقەڤینتە سەرێک ورادگرت .

● **هەمی دبێژت لولو ئاغائو ، کەس نابێژیت لێ لێ فەقیرو (ب ١٠٩)**
هندی (لێ) یە ئالاڤێ بانکرنێ یە ژبو مێیان و هندی (لو)یە ژبو بانکرنا نێرانە . دبێژن :

**لو شڤانو ، لو خالو ( لو ـ و )**

**لێ کچکێ ، لێ لێ کنێ ( لێ ـ ێ )**

فەقیرو مینا دیارە ژبو نێر ل کارە ، لەورا دڤیا (لو) بکەتا پێشی‌یێ نە (لێ) .

● **فەخو فنجانا ژەهرێ نەفەخو فنجانا قەهوێ (ب ٧٨)**
ئەڤ گوتنە مینا من گولێ بووی شوونا قەهوێ قەهرە . قەهر دنڤیسینێ‌دە ب سانەهی دبتە قەهوە . گوتنا من گولێ بووی دبێژت «ڤەخوە فنجانەکا ژەهرێ ڤەنەخوە ئێکا قەهرێ» هەمان گوتن ب «ڤەخو هەفت فنجانێت ژەهرێ ، نەڤەخو فنجانەکی قەهرێ» دکتێبا کانی یا ئەحمەد قەرەنی دە هاتی‌یە [19] .

پشتی مە گێبارەکا لەنگی‌یان بەرچاڤ کری ، دجی‌یێ خوەدەیە ئەم ل سەرێ پسیارا سی‌یێ بزڤرن و سەرژنوو بێژن : ئەگەرا لەنگی‌یا هنە گوتنان چی‌یە ؟ ئەگەرا لەنگی‌یێ هاتینە دەسنیشان کرن ئەم دشێن لێدنە سەر رێنڤیسا لەنگ هەکە ژێدەرێ وان . شاگردبن وهەکە نە دزڤرتە سەر هندێ کو نەهاتینە تویژاندن !!

٢ـ نەهەر ئاخفتنەکا گەلە بێتە دوبارەکرن گوتنا مەزنانە ... مەرجێ سەرەکی‌یێ گوتنا مەزنان نەهەر بەربەلاڤی‌یە (الا نتشار) نەهەر لێک ئینانە . پەند ب ئاوایەکی تایبەتی بیرو هزرەکا پەندیارە (حکیم) ب رەنگەکی کورت و رێک و پێک وسانەهی هاتی‌یە دارێتن ، هشمەندی وفەلسەفا وان کەسان رون و ئاشکەرا دکت یێن بو جارا یەکێ هلرێتین ، لێ مەرج نینە ب سەردەمێ دارێتنا خوە ب تەنێ‌ڤە بەند بت . پەندێ دو خاسیەتێن سەرەکی پێڤە دیارن : یەک ـ رەنگی هووکرن (هین کرن) وشیرەت کرنێ . دوو ـ کورت بری و دەربرینا تێرو تەژی [20] گوتنا مەزنان ب ئاوایەکی گشتی (چ درکەبن چ تەشبیە) ئاوێنەیەکە گەلە خووو رەشت وتیتالێن جڤاکی چ ساخ چ مری ب رەنگەکی نەپەندی تێرە خویا دکن وگەلە کریار وپێڤی‌یێن روژانە دقالبێ درکە (کنایة) و خواستن (استعارة) وتەشبیهان دە بەرچاڤ دکت ژبو کو رامانەکا دلکێش وپرپێڤەهاتی (صالح) ئاراستەی مە بکت . هەر ژبەر هندێ تەڤای‌یا گوتنێن مەزنان کارەکی مەزن دژیانا روژانەدە دکن «بنگەە و بناخا خەبەردانێنە .... بو کوردان مینا قانوونێد ژینا مەرڤانە [21]» .

چاڤیکێن (عینات) شروڤەکرن و ڤەکولانا بەرمایێ کەڤنەژینا نە نڤیسی‌یا پێشی‌یانە ، کێلایی‌یا (مظهر) گەلە روویێن ژینا جڤاکی ـ ئابوری ب رەنگێ دەسنیشان کرنەکا نەپەندی دەرپێش دکن . کورت کرمانجی : گوتنا مەزنان ئاخفتنەکا کورتە پرێ جارا لێکدای و لێک ئینای و راماندارە ،

سەرەنجـام و کاکلکا روودان و سەرهاتی‌یەکێ‌یە ب سەر کەسەکێ یان کۆمەکێ‌دە هاتی‌یە راستی و بۆچوونەکێ بەرچاڤ دکت ژبۆ ئەنجاما کارو کریارەکی ، جوونە رەفتارەکێ بدتە زانین . کتێبا «گۆتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان» چەند گۆتنەك بەرچاڤ کرینە هەکە ئەم ل بەر ئاخفتنا بەری نوکە هاتی‌یەکرن بکێشن هند سادەو ساکارن نەدکێشا هندێ ب گۆتنێن مەزنان بێنە ژمارتن مینا :

**● چ نەمایە مەزنا نەکوتی (ب ٣٦)**

**●خۆ ژراستیێ نەدە پاش (ب ٤٤)**

**● دیارە کەس ل گوندی نەمایە (ب ٥٠)**

**● قەنجی ل جامێری ناهێت (ب ٧٩)**

**● هەر بۆ دیوارا بێژە (ب ١٢٢)**

**٣- دبەرپەرێ (٨) دە هاتی‌یە «من بهاوێ بابەخ دایە پهیڤ و دارشتنا ڤان گۆتنـا [ژکـرا گۆتنـێن مەزنـان] ، لەوما دێ بینی پەندەك خوە دووبـارە دکـەت ب هەمـان مەعنێ ، بەلێ ب راشتنەکا جودا و ب پەیڤێت جودا» مرۆڤ بەختێ خوە خراب نەکت ، گۆتنێن دوبارەکری کێمن نەکوو نینن ، ودوبارەکرنا هەمان رامانێ ب دارشتنەکا جودا وب پەیڤێن جودا مینا «خەتا خوار ژکاینێ پیرە» و «بچووك چاڤ ل مەزنـان دکەن» ب بەرگلی وگازنان ناکەڤت ویەکەتی‌یا مەبەستێ دو گۆتنـێن ب دارشتنەکا جودا (دچو سەران دە یەك نەگرت ناڤەرۆك نەبت) هاتینە داریتن چوجا نڤیسینا گۆتنەکێ ب تەنێ تاڤیر (حلال) ناکـت ، ونڤیسینـا گۆتنـەکێ بتنێ بەس نینـە مینـا کاك عزمت درەخنەگرتنا خوەدە بۆ چۆی . لێ بەلێ جودانی‌یا ژرەنگ و رووباری گۆتنێ دەرنەکەڤت و چو ژ رامانا وێ نەگوهۆرت ، جی‌یێ وێ یێ دروست پەراوێزە . دانەرێ کتێبێ دبەرسڤا رەخنەگرتنا کاك عزمت ڤندی دە دبێژت «مائەز چبکەم هەکە ل ناڤ مزۆیریا بێژن : (بێدەر خەمـا بابە) ئۆ ل ناڤ نهێلیا بێژن :(جوخین هەر خەما بابە) یان هندەك بێژن «خەملا دارێ ژبەلگانە» ئۆ هندەك دی بێژن «رەوشا دارێ ژبەلگانە»؟ دبەرسڤا پسیارا بۆری‌دە ئەم دشێن بێژن : تەدشیا تو یەکێ ژهەردووان دپەراوێزێ دە بنڤیسی یان هەر ب رەخ گۆتنێ ب خوەڤە ب رێکا دەسنیشان کرنەکا نێزیکی یا خوارێ :**

**●بێدەر خەما بابە .(جوخین هەر خەما بابە)**

**●خەملا دارێ ژبەلگانە .(رەوشا دارێ ژبەلگانە)**

**جودانی‌یا قەسەیەکێ ددو گۆتنان دە کو دهەمی تشتێن دی‌دە یەك بن نابتە ئەگەرا هندێ هەردوو گۆتن ب دو گۆتنێن جودا بێنە دێنان . تێ‌هەیە دیەك گۆتنێ‌دە یەك ناڤی پێش بخێت ، یەك جیناڤی .. تێ‌هـەیـە یەك ئامـرازی بێختـە پێش ناڤی ویەك ناڤی ب پێش ئامرازی بێخت ئەڤە هەر هەیەو چوجا ناکێشتە دوبارەکرنێ .**

**هندی من هەژمارتین نەه دەه گۆتنەکێن دوبارەکری دکتێبێ هەمی یێ دە هاتینە بۆ نموونە ئەمێ چەندەکان ژێ بێ لەك و لۆمە تەڤی هەڤ بەرچاڤ کن :**

**● چ دوّل دبێ گورگ نابن (ب ٣٦)**

چ نهال نینن گورگ لێ‌نە (ب ٣٩)

**● خالەتێ بێهنا دایکێ ژێ دێت (ب ٤٢)**

خالەتێ زکاکێ ، ژێ دێت بێهنا ماکێ (ب ٤٣)

**● زل ژکادینا خلاس نابن (ب ٥٩)**

زول ژکادینا نابرێن (ب ٦٠)

**● مری لبەرە ، کەنی ڤەرە !(ب ١٠٠)**

مری لبەرە ، میستن ڤەرە (ب ١٠٣)

**● تڤنگا دوورحوکم ، نەدە دەستێ نەزانی (ب ٣١)**

تڤەنگادویرحوکم نەدە دەستێ نەزانێ ، دێ بیت قەتلێ سەرێ خودانی (ب ٣٢)

راستە گوهۆرینا گۆتنێن بۆری (مەبەست یێن هاتینە دوبارەکرن) ژ رەخێ دانـەرێ کتێبێـڤـە نەهاتینە کرن «بەلکو دارشتنا خەلکی‌یە مینا دانەر دبەرسڤا رەخنەگرتنا کاك عزمت دە . لێ بەلێ دارشتنا خەلکی دبوارا هەر گۆتنەکێ بۆری تێ‌هەیە ل دورەنگێن دارشتنێ (داریتنێ) رانەوەستت ، ل بنێ گوهی‌یە هەتا چار رەنگان ژێ بگرت .. مار مواپە هنگێ گۆتنەك ژبەر جودایی‌یا قەسەیەکێ بێتە چاربارەکرن ؟!

٤- چەنـد ئاخفتنـەکێن ڤێك نەکەفتی (متناقض) دکتێبێ دە بەرچاڤن . بەرهـەڤکەرێ گۆتنان دپێشگوتنا خوەدە (ب ٨) دبێژت : «ئەڤ گۆتنێت دناڤ ڤێ کتێبێ دا هاتین ، یێت هاتینە ڤاڤارتن و بەراوردکرن دگەل کتێبا (مشتـاخـا چیا ژگۆتنێن پێشیا) ، لەوما ئەو پەندێت لویرێ هاتین لڤێرە دووبارە نەبووینە، ژبلی هندێ کو جارجار مەپێتڤی زانیە دووبارە بکین ، هەکە دارشتنا وان و ئەڤان ژیەك جودابیت و مەعنا وان یەك بیت ، ئەڤە ژێ ژ (٥٠) گۆتنا نابورن ، ئەمما یێت دن کو (٢١٥٠) پەندا پترن هەمی تێکرا ئەون یێت کو نەهاتینە چاپ کرن و بەلاڤەکرن .. من ژ دەڤێ ڤی‌و ڤێ وەرگرتینە» . ئارمانجا کتێبێ ب خوە مینا بەرهەڤکەر دبێژت ئەوە «ئەوان پەنـدێت نەکـەفتینە سەرکاغەزێ بنڤیسیت»[٢٢] ئەرێ باشە کتێبێ ئەڤ ئارمانجە بجی ئانی‌یە یان نە ؟ خواندەوارێ ژسەرێ پێڤە ئەڤ رەخنەگرتنە ئاژۆتی ل بەرسڤا ڤێ پسیارێ نامینتە ئاسێ . دسەرێ رەخنەگرتنا خوەدە مە دیارکر کو پەند هەمی ـ ئەوێن بەرهەڤکەری دگەل یێن کتێبا (مشتاخا چیـا ژ ....) بەراوردکـرین و دوبارەکرنا وان ژبەر جودایی‌یا دارشتنێ ورامانێ ڤەردیتی تێنە ـ نە ئەون یێن ب بەرچاپێ نەکەتین ئانکو ئاخفتنا (٢١٥٠) گۆتنان یان پتر دکێشتە خانا گۆتنێن هێژ ب بەر چاپێ نەکەفتین ئاخفتنەکە ئەو و راستی ئاڤێ ژدەراڤەکێ ڤەناخون .

٥- چەند لەنگی‌یەکێن بێخێر ژی دکتێبێ دە هاتینە هەر چەندە دیارکرنا
وان نەگەلە فەرە لێ هەر باشە خواندەوار پێ ئاگەهدار بت ژوان :
یەك - سالا ١٩٦٤ د سەرێ بەرپـەرێ (١٣٥) دە بۆ مرنـا ئەحمەدێ
نالبەند هاتی‌یە دانین . نافبرێ خوە دروژا (٩) ی ئێلوونێ ژ سالا ١٩٦٣
یێ خوە کوشتی‌یە [٢٢] .
دو - دفەرهەنگۆکا پاشی‌یا کتێبێ دە چەند گۆتنەك ب رامانەکا لەنگ هاتینە
راڤەکرن .
«بوٚر» ب روٚبار هاتی‌یە راڤەکرن و ب خوە ئەو ئەردە ژ]روٚباری یێ مروٚڤ
لێ دەرباز دبت ب عەرەبی دبێژنێ «معبر»
«بـاڤی‌یـا» ب گونـدەکی نێزیکی شێخان هاتی‌یە راڤەکرن . ئەز نابێژم
گوندەك ب ڤی نێزیك شێخان نینە ، تشتێ من دڤێ بێژم ئەوە : باڤی‌یا
گۆتنا دبەرپەرێ (١٩) دەهاتی گوندەکی بەربنی‌یێ چیایێ بێخێرە دکەفتە
هێلا ئاسهێ . چیروٚکا مەلایێ باڤی‌یا یێ دوکچ داینە ب بیژنەکێ چیروٚکەکا
ب ناف ودەنگە ل دەشتا دوبانێ .
«خویندار» ب نەیار هاتی‌یە راڤەکرن وب خوە ئەوە یێ خوونەك ل سەر
ئانکو خودان نەیارە ، نە نەیار .
سێ - هەرچەندە ئەز ل وێ باوەرێمە : گۆتنێن مەزنان ل پەی بابەتان بێنە
رێزکرن چێترە ، دایێ ب چاڤێ

شروٚ فەکرن و ڤەکوٚلانێ خوە بەردتە ناف رێکەکێ ببتە بیر و باوەرێن دنێڤ
قالبێ گۆتنان دە ودابشێت نەخشێ ژینا جڤاکی - ئابوٚری ل سەر بگرت .
لێ ژێهاتن و شیانا زێدە ئەوا لێکفەکرنا گۆتنان ل سەر بابەتان دخوازت و
دەرکەتنا وێ ژێهاتن و شیانێ - ب هزرا من - ژچارچوٚڤێ شیانا کەسەکێ
ب تەنێ دروٚژگار و قوٚناغا ئەڤروٚ ئەم تێدە رێ نادتە مە ئەم وێ داخوازێ
ب پشت گەرمی ژبەر هەڤکەرێن گۆتنێن مەزنان بکن . ژبەر هندێ رێزکرنا
پەندان ل پەی ئەلیف و بێتکان هەر چەندە رێزکرنەکا پاشکەفتی‌یە - هەکە
ئەم ب چاڤێ ڤی چەرخی بەرێ خوە بدنێ - بەس بوٚ کوٚم کرنا تێکستان ب
رەوش دیـارە تێتە بەگەم کرن (پەسند کرن) لێ دانەرێ کتێبا «گۆتنێت
مەزنـان ل دەڤـەرا بەهـدینـان» یەك ژهـەردوو رێیان ژی ب دورستی
نەگـرتی‌یە ، لەورا هەر خواندەوارەکی ماڤ هەی رێزەنەکرنا گۆتنێن وی
بەرهـەڤ کرین ل دوو رێـزکرنەکا فەرهەنگی مینا بێ ڤاڤێری‌یەکێ بێتە
بەرچاڤان .

دبەرسڤ دانا دانەرێ کتێبا «گۆتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان»
ل سەر رەخنەگرتنا هێژا (عزمت فندی) دە و ب هەڤ نەکەتنا وان (دوێ
بەرسڤ دانێ دە) ل سەر جوداکـرنا پەندێ ومەسەلێ ئاریێشا جوداکرنا
گۆتنا مەزنان ل سەر چەند جوونگان تێتە بیرا و مە دبەر هندێ رە دکت ل
ئێرە ڤاویشا جوداکرنێ ژ چارچوٚڤێ پەندێ ومەسەلێ دەربێخن چونکو ب
هزار من دسەری‌دە یەکێ مەسەلە ب سەرهاتی لێکدایە و یێ‌دی کێشایە
سەر ژێدەرێ دبینیات دە پەیف ژێهاتی کو پەیڤا «مثل» ە . ب هندێ
دابێشا وان دچو سەران دە یەك نەگرتی‌یە .

جوداکرن و ڤاڤراندنا گۆتنێن مەزنان ل سەر چەند جوونەکان هەکە
بێتە کرن کریارەکا پرۆپر دچی‌یێ خوەدمیەو دێ گەلە تاری‌یێ ژڤی چەڤێ
فولکلوٚری دتە پاش . گۆتنێن ب ناڤێ گۆتنێن مەزنان تێنە بەرهەڤ کرن
نەپەند (حکم) ب تەنێ‌نە خواندەوار یەکسەر درامانا وان بگەهت . گێبارەك
ژێ ئیدیوٚمن (خواستن و درکە و تەشبیهن) ؛ هندەك پەیڤێن یەکگرتینە
رامانەکا تایبەتی ددن ،

ب رەنگەکی بەرهەڤ و ولێکدای د زمانی‌دە هەنە . دگەل ئاخفتنێ تێنە
گۆتـن وب خوە بەری دەمێ ئاخفتنێ هاتینــە داریتن . ئانکــو ددەمێ
ئاخفتنێ دە دورست نابن ، دئاخفتنێ‌دە ئاخفتنکەر مینا کەرستەیەکی
بەرهەڤ هەستا خوە پێ دەردخت [٢٤] . وپرێ جارا مروٚڤ ب باشی درامانا
وان ناگـەهت نەمـازە هەکـە رووت بێنـە گۆتن (بێ‌کو سەرهاتی‌یەك یا
راڤەکرنەك پێڤە بێتە دالەقاندن) لەورا گۆتنێن ژڤی نفشی پێتڤی ب راڤەکرن
و دیارکرنا هەلوێستێ (موقف) گۆتن ل سەر تێت هەیە . سەربارێ هندێ
پێتڤی‌یە پەند وئیدیوٚم ب رێکا دەسنیشان کرنێ ژێك بێنە ڤاڤارتن. هندی
پەندە پرێ جارا راست ورێ (یەکسەر) رامانێ دکتە ددەست مەدە. رامانا
وێ نەڤـەشـارتی‌یـە مینـا یائیـدیـوٚمی . «ئیدیوٚم دیاردەیەکە ژدیاردێن
رەوانبێژی یێ [٢٥] » دەستەکی بێ هەمتا دهێت کرن (قاهیم کرن)و بنەجی
کرنـا زمـانی دە هەیـە . زمـانێ ژئیدیوٚمان ڤالا هێژ خودان تێ شارەزا
نەبوویە. جوداکرنا پەندێ ژئیدیوٚمی ودابەشکرنا ل سەر خواستن وتەشبیە
و درکان پێنگاڤەکا پێشکەفتی‌یەو نیشانا پێشدەچوونێ‌یە ددەراڤێ کوٚم کرن
و بەهەڤ کرنا فولکلوٚری‌دە . ودەرگەهێ جوداکرنا ژێکوٚتی نەمایە گرتی
گەلەجا ب هزرا ژێك ڤاڤراندنا پەندو ئیدیوٚمێ‌و جانا ژی ب هزرا کوٚم کرنا
ئیـدیوٚمان ژرەخێ گەلە توٚرەڤانێن مەڤە هاتی‌یە ڤەکرن مینا ئەمر سادق
بهائەددین (کتێبەك ب ناڤێ ئیدیەمێت کوردی سالا ١٩٧٣ێ دایە چاپ
کرن) د. شوکـریـیـە رەسـوول (دڤـەکوٚلینەکا دوورو درێژ دە ب ناڤێ
«مێژووی کوٚکردنەوەو لێکوٚلینەوەی پەندی پێشینان .....» ، گوٚڤاری کوٚری
زانیاری کورد ، بەرگی چوارەم ١٩٧٦) جەلال مەحموود عەلی (کتێبەك ب
ناڤێ «ئیدیوٚم لە زمانی کوردیدا» سالا ١٩٨٢ ێ دایە چاپ کرن) پێتڤی‌یە
بەرهـەڤکـەرێن گۆتنێن مەزنان رێکا خوە ب بەرهەمێن توٚرەڤانێن ناڤبری
بێخن دامفایەکێ ژێ وەرگرن .

ل دووماهی‌یێ بەری ئەم دەرگـەهێ دابێشـاخوە دادن (بگرن)
داخـوازا مە ئەوە ئاخفتنـێن مە ب دلەکی بەرفرەە بێنە وەرگرتن وکەس
دابێشـا مە ڤێ ب چاڤێ (ب ئنیـەتا) پێ‌رادانا کرێتی‌یێ تێ‌نەگەهت .
ئارمانجا مە درەخنەگرتنا مەخوە پێ‌کری دە بەری هەر تشتەکی دیارکرنا

چەنـد ئالۆزیـیەکـانە درێکا بەرهەڤ کرنا گۆتنێن مەزنان دە . ژبۆ ئەو ئالۆزی بێنە خاڤ کرن مە رەخنەگرتنا خوە ب چەند خالەکێن گرنگ تام دایـیە ، ب هزرا من ئەڤ تام دانە ژسنیۆرێ ئارمانجا مەیا سەرەکی دەرنەکەفتیە ؛ پێکۆلەکە ژبۆ بەرهەڤکەرێن گۆتنێن مەزنان رێو نیشانێن زانستی ب بەرهـەمێن خوە رادن . رەنکێشێ (محاولة) بکن خوە ژ چاڤ لێکرنێ دوور بێخن . ئاخفتنا بۆری ب چو رەنگان من ژوێ باوەرییێ ناکت کۆ هەر بەرهەڤ کرن و ڤەکۆلانەکا ددەراڤێ فولکلۆریدە بێتە کرن - یەچەند بت و چاوابت - جییێ شانازییێیە ؛ نیشانا دلبێشی (إخلاص) ودلسۆژییێیە . فولکلۆر ب هەمی چکل و چەڤێن خوەڤە گەلە دەستوور و ئاوا نیشا مە ددت و ب رێکا ڤان دەستوورو ئاوا مەفێری جوونە ژین و ژیـارەکێ دکت ، تەڤـەز (موحەققەق) ژ خزمەتا داخواز و ئارمانجێن مە دەرناکەڤت . ژبەر هندێ نڤیسینا هەمی چکل و چەڤێن فولکلۆری ب گشتی وگۆتنا مەزنان ب تایبەتی چ ڤەنج چ خراب پێتڤییە وجییێ رەزامەندی یا هەر ئەدەب دۆستەکێیە .. ل ئێرە مادەم سەرشەڤێت دابێشا مە خوە ل ڤەنجی وخرابییا فولکلۆری ب گشتیو یا گۆتنا مەزنان ب تایبەتی دا ، راستی مە دِ بەر هنـدێرە دکت ئەم بێـژن : نەجییێ گومـانێیـە کو پێشکەفتنا پشتی . شۆرەشا تەکنەلۆجیو رەوشەنبیری ئەوا رێکا خوە ب پرانییا (اغلبية) کۆمەلێن مرۆڤایەتییێ (المجمعات الانسانية) خستیو سەرهلدانا (ظهور) گەلە دەزگەهێن رەوشەنبیری وپەروەردەیی (المؤسسات الثقافية والتربوية) ئەوێن دەستەکی درێژ دنەخش کێشانا (تخطيط) ژیانا کەس و کۆمـان دە هەی ، گەلە گۆتنـێن سەردەمـەکێ جهـانی یاسـاو دەستووران ل کار ، ژبەر دەرکەتنا ناڤەروکا وان ژڤلقازێن (قفزات) وێ پێشکەفتنێ ، رژاند . دگەل هندێ ژی ئەو گۆتنە مینا سامانەکی ئەدەبی وکەلەپۆرەکی شارستانی (حضاری) هەژی وەرگرتنێنە ، ووەرگرتنا وان ژبۆ هندێیە کێشا کەڤنە ژینا کەسێن گۆتن دارێتێن ل بەر بێتە دیارکرن ، دا رێکا بابکێن نوو (الأجيال الحاضرة) پشتی دیارکرنا تەنگ و تاریستان و شەمتینا (تەحسین) بابکێن کەڤن کەتینێ ل سەمتا پێڤییێن (متطلبات) سەدێ بیستێ بێتە ئاژۆتن .

## پەراوێز

١ـ مەبەست کتێبا دێرشەوی «مشتاخا چیا ژگۆتنێن پێشیا» نە ئەوا سالا ١٩٨٠ یێ ل (مطبعة شفیق) بەغدا هاتییە چاپ کرن .

٢ـ حجی جعفـر : گۆتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان ، بەغدا (مطبعة علاء) ١٩٨٦ / ب ٨

٣ـ کتێبـەکـا ق . کورۆیـە سالا ١٩٧٦یێ شکور مستەفاو ئەنوەر قادر محـەمـەد ئانییە سەر تیپێن عەرەبیو ل چاپخانا کۆری زانیاری کورد هاتییە چاپ کرن .

٤ـ محمدی خالّ : پەندی پێشینان ، چاپی دووهەم ، سلێمانی (چاپخانەی کامەرانی) ١٩٧١ / ب ٣١١

٥ـ ژێدەرێ بۆری / ب ٣٥

٦ـ ژێدەرێ بۆری / ب ٦٥

٧ـ د. شوکـرییـە رەسوول : مێژووی کۆکردنەوەو لێکولینەوەی پەندی پێشینان و .... ، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد ، بەرگی خوارەم ١٩٧٦ / ب ١٥٨

٨ـ محمدی خال : ژێدەرێ بۆری / ب ٤٩٨

٩ـ برێنـە : سمـیر شیخانی ـ من حصاد الفكر العالمی ، ط ٢ ، بیروت (دارالآفاق الجدیدة) ١٩٨٠ / ب ٦٨

١٠ـ برێنە : منیر البعلبکی ـ المورد (پشکا ب ناڤێ مصابیح التجربة) ،ط ٢٠ ، بیروت (دار العلم للملایین) ١٩٨٦ / ب ٨٩

١١ـ الدكتور حسین الحاج حسن : علم الاجتماع الأدبی ، ط ١ ، بیروت (المؤسسة الجامعیة للدراسات والنشر والتوزیع) ١٩٨٣ / ب ٢١٤

١٢ـ د. شوکرییە رەسوول : ژێدەرێ بۆری / ب ٢٢٠

١٣ـ علاء الدین سجادی : دەقەکانی ئەدەبی کوردی ، بەغدا (چاپخانەی کۆری زانیاری کورد) ١٩٧٨ / ب ١٥١

١٤ـ برێنە : علاء الدین سجادی ـ ژێدەرێ بۆری / ب ١٤٩

١٥ـ علاء الدین سجادی : ژێدەرێ بۆری / ب ١٥٢

١٦ـ برێنە : علاء الدین سجادی ـ ژێدەرێ بۆری / ب ١٥١ دا دەقێ ئاخفتنا مە کری ببینی .

١٧ـ الدكتور حسین الحاج حسن : ژێدەرێ بۆری / ب ١٧٥

١٨ـ حجی جعفر : ژێدەرێ بۆری / ب ٨

١٩ـ ئەحمەد قەرەنی : کانی ، پرتایەکێ ، بەغدا (مطبعة اسعد) ١٩٨٤ /ب ٨٠

٢٠ـ کەریم شارەزا : پەنـدی بەراوردکاری ، چاپخانەی (سمیر أمیس) ١٩٨٣ / ب ٦

٢١ـ ق . کوردۆ : کۆمەڵەتێکستی فولکلۆری کوردی ، بەغدا (چاپخانەی کۆری زانیاری کورد) ١٩٧٦ / ب ٣١

٢٢ـ حجی جعفر : ژێدەرێ بۆری / ب ١٧٠

٢٣ـ برێنە : صادق بهاءالدین ـ هۆزانڤانێت کورد ، بەغدا (چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق) ١٩٨٠ / ب ٥٤٨

٢٤ـ برێنە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ـ لەبواری فەرهەنگ نووسیی کوریدا بەغدا (مطبعة الزمان) ١٩٨٧ / ب ١٤١ و ١٤٢

٢٥ـ جەلال مەحموودی عەلی : ئیدیۆم لەزمانی کوریدا (مطبعة حسام) ١٩٨٢ / ب ١٦



# سێ نویشکە شیعر ...

○

مدحت بێخەو

○

« پەلکە زێڕینە »

پەلکە زێرینەکەی ڕەنگین
لە ئاسمانی پڕ لە رازی
نهێنیشین ..
لەم رۆژەدا وا نەبێکە
بۆ یەکبوون و راستی ئەوین
بەڵام کاتی مرۆڤی گەندەڵ
لە رێی هەورازی ئەم ژینە
ئەبێ بە پەلکە زێڕینە
لەناو تەلار
بۆ بەرەو خوار
بەفیزەوە
لەناو ئەندێشەی گومرایی
ئەسورێنێ دیدەی بایی
وادەزانی شادەو خەنی
نازانی رەنگەکان لە رووی
هەموو گۆڕاون بە تەنی ..!

★★★

« ڕووناکی»

ئەی رووناکی ..
ئەی بۆ کڵۆڵ مایەی شادیو
بۆ ستەمکار جێی سامناکی
بەرلەوەی ورشەی بیر هەبێ
تۆ هەر تاریکیت راو ناوە
لەدەورەی دێ ..
لە رێگەو بان ..
دەمەو بەیان
دڕندەی شەوت قاودا وە
ئەمڕۆش بۆ هانات شەوقی بیر
جەرگی شەوی شەق کردوە
پەی بە داوی بێ نیهادی
ناو دیوارەکان بردوە
گەر هەوری رەش خۆریش بگرێ
لەخۆر پتر رێی هەورازمان رۆشنا دەکا
گەر دەستی (زۆر) دەنگیش ببڕێ
لەدەنگ پتر جارو هەڵەت
بەرپا دەکا ..

★★★

« ورە »

گەڤینی هار
لەشەوی تار
بۆ هەنگاوی رێگەی سامناك
گڤەی رەشەبای نالەبار
زریانی دژ خەوو خۆراك
گوێزانەبای دۆڵی سەهۆڵ
شالاوی تەم
ژاراوی زۆڵ
ژانی ستەم
ئەمانەو هەزار هەندەیتر
لای ئەو گوردەی بروایەکەی
ئاوێتە بووی ئەم خاکەیە
لای ئەو رۆڵەی جەربەزەیە
وەڵامەکەی یەك بزەیە ..!

★★★

# ئەستێرە .. چاو ...

● محمد امين پينجوينى ●

ـ ئاسمان پڕە لە ئەستێرە ...
هێمن و کڕ ئەجریوێنن
ڕازو چپەو نهێنییان
بۆ یەک و دوو ئەدرکێنن ...
هەندێ کزە هەندێ چاو کەش و بەخومارە
هەیە ئەکشێ ئەڵێی بارگەی شوێن هەوارە ...!
حەوتەوانە ، کێ‌کاکێشان ...
ـ کە ڕۆژ هەڵدێ
تۆری زێڕوزیو ئامێزیان ..!
بۆ هەڵئەدا ...!
سرکن،شەرمن،داویان ناوە ..!
هەموو خامۆش ئەستێرەکان
ـ زەویش هەروا ...
لەچاو ئەستێران جمەی دێ
گڕەی دڵی چەراوشەتەک
نیازو ئاواتی لوقمەی گڵ

لەیەکتری حەشار دانە ..!
مرۆڤ وایە دژی خوتەن ..!
هەندێ ئاوێنەی بالانما
هەندێ زەری و فریشتەیان
لەگیرفانی چەپیان ناوە ...!
ـ وەلێ تۆی مانگ کە هەڵهاتی
شەلاڵی ئارەقەن لەرزۆک
تارای ئەرخەوانی شەرمە ...!
پەچە پۆش چاو بەلەکان !
بە بریقەی خەرمانەی «ڕووت»
کریستاڵی ڕوو شەقارە ...!
ـ بۆیە خونچەی دڵی سەرکێش
تاڵی قوزاخەی ونجری
هەزار کلافەی ئالۆزاوە
دابین نابێ سەرە ڕۆیە
پەپولەی مۆمی ڕوی تۆیە ...!



# بەفرو .. فرمێسك

سەلام محەمەد

شەوە .. ئاسمانەکەی «بەرلین»
پەلە هەوری بەفری سپی دایپۆشیوە
بەفر ورد ورد دێتە خوارێ
زۆر لەسەرخۆ
وەك پەریەك ..،
کراسێکی تەنك تەنکی لەبەردابێ
بەسەر رووومەتی کەلێساو
دارچناری بالابەرزی گەلاوەریودا ، ئەبارێ
شەقامەکان
چۆڵ و .. جێهێڵراو .. و .. تەنیان

جار جار وەك ئەوەی بەردێکی بچکۆلانە
فڕێ دەیتە سەر ئاوێنەی گۆمێکی مەنگ
کوڕو کچێك ، کپ و بێدەنگ
دەست لە ملان و
لە شێوەی جووتەمارێکی ئاشقەو ماشقەی
لەیەك ئالاو
خێرا خێرا رێ ئەکەن و
هەڵمی هەناسەیان بۆتە
چەتری رازونیازی جوان

منیش لەم دیو پەنجەرەوە
لەگەڵ شیعرێکی گۆران و
پەرداخێکی نیوەپڕو .. پشکۆ داگیرساوەکانی ، بیرەوەری
وڵاتی خوێن و .. زریانا
بوومەتەوە :
دڵدارە چۆغە لەبەرەکەی جاری جاران
سەرچۆپی ئاهەنگی شایی
گوندە دوورەکەم گرتووەو
بە دەم بەستەی :
«کراس کودەری ئاوریشم
با بەس ئاخت بۆ هەڵکێشم»
سەمای مەرگم پێکەوتووەو
وەك لق و پۆپی دەرەختێك
لە دارستان دابڕابێ ، ئەلەرێمەوەو
خەنجەری هەناسەی ساردیش
ناخم ئەسمێ و .. دڵم پارچە پارچە ئەکات
وام لێدێ ئەڵێی گوڵێکم
هەر لە هاویندا شین ئەبێو
هەرگیز زستانی نەدیوە
لەودیو پەنجەرەکە شەوە
ئاسمانەکەی بەرلین ... تەم و
پەڵە هەوری بەفری سپی دایپۆشیوە
منیش لەم دیو پەنجەرەوە
پەرداخێکی نیوەپڕو ..
ئاوی شیعرێکی گۆرانم هەڵنۆشیوە
بوومەتەوە:
کورە چۆغە لەبەرەکەی ، دەشتی گەرمیان
ئەمجارەیان
سەرچۆپی ئاهەنگی خوێنی گشت رۆژهەڵاتم گرتووەو
هەدادانم پێکەوتووە
چ ئاگرێکە ئارامی لێم بڕیوە
چ سۆزێکە هۆش و هەستی لێم دزیوە ..
دڵم بۆکێ بکەمەوە ؟
کێ لە زمانم تێئەگات ؟
کێ ئەزانێ :
«لەچی و بۆچی .. وام بەسەر هات»
چ ئافرەتێك ..
چ شۆڕە کچێکی بەرلین
کام ناوقەد باریکی چاوشین
ئەتوانێ بۆ تەنیا ساتێ
ئاسوودەم کاو
دڵیم بۆ بکاتە سەرین !!.

● ● ●

وەرە خوارێ ، ئەی بەفری جوان
بەدەم نەرمە پرووشەوە ..
وەك فریشتەی نیوەشەوان ، وەرەخوارێ ..
وا پەنجەرە ئەکەمەوەو
تێر تێر بە روومدا بباریێ ..
مەگەر تەنیا تۆ بتوانی
وەك پەری‌یەك ،
کراسێکی (تەنكتەنك)ی لەبەردابێ
شەوەزەنگی بیابانی
دڵم ئاوەدان کەیتەوەو
تروسکەی رووناکی پیابێ ..
ئۆخەی گیانە ، .. ئەوەتانێ :
کاتێ پڕ بە سی‌یەکانم هەڵتەمژم
بۆنی رنووە بەفری دووری
لووتکەکانی کوردستانیش لەگەڵتا دێ ..

● ● ●

**بەرلین رۆژئاوا**
**١٩٨٢**

# گەر تو زین بی

گەر کوڤ کەوەلە بی
بجیای و کەڤرم ئەز
دەمی قەبوونانە دیستم
پولا و ئاسنم ئەز!

* * *

گەر رووباری درێ و هار بی
ژێرو ژوور پێلا بهاڤێژی
گەرمیڤانی مەلەڤام
دهاژووم بەلەز
دائگەدەم کاروانی هێلام
تو حزانی... !
سیاری قوناغا دوورم ئەز.
ئەڤە مە ئەز
لەو دیێژم
(زیرەڤان و چە لەنگم ئەز).

گەر تو زینا کەزی شور بی
گەردەنا تژی مەرجان و موور...
مەمی مە ئەز،
عاشقی تەمە نەفی زینی
گریندابە لگەل تە بفینی
گەر تە بێتم
بێ بیرو باوەرو پیچ و پە لاشم ئەز!

* * *

گەر حاکما حوکم دار بی
هەر دوو رەشار سیدارە بن
هەر ئەم من بێ بهلابیی
ستو خویل و رەبەنی
فەرمانا تەمە ئەز!

* * *

زهير محمد سلمان

# ڕۆڵەی بەفر

مەهاباد قەرەداخی

٣٠/٣/٩٨٦

ئەی مرۆڤ تۆ ڕۆڵەی بەفرو من شاعیری گەرمەسێرم
لەهەر کوێ بی من لەوێدا چاوی تاسەت بۆ دەگێرم
کە دەتبینم پشکۆکانی ووشەم یەك ، یەك دادەگیرسێن
چرۆی شیعرم ، حەزی سەوزن لە سیمای تۆدا دەبزوێن

سەر بلندیو بەرز فری لە بالای بەرزت ڕافێر بووم
سل نەکردن لە تاریکی لەگلێنەی تەرزت ڕافێر بووم
گۆرانی ڕاستی و ئەوین و هەڵبەست لە دەنگت ڕافێر بووم
هێمنی و ئارام و هیوا لە کانی مەنگت ڕافێر بووم

دەگەڵ تۆدا کام شەوەزەنگ زۆر یەلدایەو زۆر تاریکە
ڕەوگەی ژیان و هیوامە هەرچەند تولە ڕێ و باریکە
ڕێکەوت پەیامی ئەوین و خۆشەویستی تۆی بۆ هێنام
خۆشەویستی پڕ بەدەروون ، بوی بە هاوڕازو ئاشنام

سۆزی دەنگت چرپەی حەزو لوتکەی هیواو ڕازەکانمە
گوڵی ڕەنگت ئیلهامی نوێی هۆنراوە بێ نازەکانمە
ڕەشی چاوت نهێنیگای گشت خەمێکی پیرۆزمە
گەشی دڵت پەناگامی گشت سرودێکی پڕ سۆزمە

هەرچی هەن کۆیان کەمەوە لەووشەی ئەوین و تاسەم
هێشتا ناتوانن دەربڕن چەندم خۆش دەوێی هەناسەم
عەشقێکی بەم شێوەیە سەوز وەك ئەوینی پەرستگابێ
چۆن دەبێ سەرچاوەی شیعرم لەم ئەرینە بێ ئاگابێ

ڕۆڵەی بەفر ـ دەست هەڵبڕە بابەڕوت کەم بەرەو ئاسمان
با دڵی هەوری هۆنراوەی خۆمت بۆ بکەم بەنیشتمان
با باخچەی هەست و سۆزت گوڵی شیعرم چرۆ بگری
لەناو دڵما تۆ گەورە بی و بلندتر بیو تاسە بمری

ڕۆڵەی بەفر ، ئەتۆ ڕوگەی دوا حەزو دوا ئەوینمی
چرایەکی هەڵکراوی سەر ڕێگای ڕاستی ژینمی
تۆ ئەو خەونە سپییانەی دەیبینم و نایەتەدی
چۆن لات و بێ ئاوات نەبم تاقە هیوای ژینم ئەدی

تۆ خۆریت و منی شاعیر بەندی عاشق بەروناکیم
تۆ شادیت و منی شەیدا دیلی ئازارو خەمناکیم
خۆم و وشەو هەست و سۆزم هەموو ساتێ ئەبین بە تۆ
تۆش هێندە بێ میهر مەبە گوناهمان مەگرە بە ئەستۆ

تۆ خوێنمی و لە لە شمانیت کوا لەشی هەڵ دەکا بەبێ خوێن
هەناسەمی و لە سیمانیت کوا شانەی هەستم دەبزوێن
ئازارێکی بەردەوامم ، تۆ هەتوانی ناسۆرمی
من شارێکی بێ ڕوناکیم ، تۆ ڕوناکیمی ، خۆرمی .

# داره‌به‌ن

مه‌سعوود په‌ریشان

ڕۆژهاتا - ڕۆژچوو
سه‌فه‌ری گه‌لاڕزانیش به‌رده‌وام بوو
گوڵکه‌ی ڕه‌نگی گه‌ڵی ده‌ڕه‌حت
له‌ قوڕو لیته‌دا خنکان
گه‌ڵی ووردۆ خه‌ون و بوورژان
له‌ ئاره‌قه‌ی قورس و خه‌ستا تواته‌وه
که‌چی ڕه‌نگی پیره‌داره‌که‌ی سیداران
مێژووی له‌ بالای خوی ئالاند
چه‌ند سه‌ده‌یه‌که‌ ڕه‌شه‌با ده‌یهه‌ژێنی
ئه‌م تا ئێستاش هه‌ر له‌ گه‌لیا ده‌شنێته‌وه‌و
هه‌ر که‌ژاوه‌ی خه‌ نه‌به‌ندانی تازه‌یه

ئه‌مڕۆ بالای داره‌به‌نێکی تر هه‌ڵچوو
که‌لا هه‌ژاوه‌ی ده‌م لووره‌و
هاژه‌و ... سه‌کوه‌ر
ڕه‌نگی تیژتر ، لق و پوپ ته‌ر
سێبه‌ر دزه‌ خوی له‌ ئه‌وکی ده‌نالێنی
که‌چی هه‌ر خوی ده‌خنکێنی
فریشته‌ی ژینوو ڕه‌ندوڵ

له‌ ئامێزیا ،
ووشکه‌ ژانیان شانه‌ ده‌که‌ن
خه‌مێکی قورسی نه‌مه‌ییو
له‌ کلاو ڕۆژنه‌ی چاوانیا ، ده‌ترووکێنێ
ئه‌م شینگێڕتر
ئه‌بوونی له‌ بوون ده‌خووسێنێ
سروودیکی خوایی زیندوو
له‌وه‌ته‌ری که‌زیه‌ی کچانی شه‌نگ ده‌چرێ
ڕه‌مانێ خه‌وی - ئێلی - بوو
ئێستا خۆی ڤینوس ئاسایی
ئه‌شکه‌وت و هه‌واره‌ به‌رزه‌ی
خه‌نده‌ ئاسۆی به‌یانی یه

وێزه‌ی به‌فری
داستانی دایکی ژووان و خه‌چه‌و و داکو
له‌به‌ر ده‌رگاییکی سواقدراوی بێ ته‌قه‌
تامۆیی خاکێکی مه‌نگی هه‌لده‌کوڵی
سه‌ری به‌رزتر له‌ ئاسمان
بتێکی خنکاوی به‌فر

رۆحی زیندوو
دەنگێکی هەڵچووی بریندار
چەنگە ڕنەی قژی مێژوو

ئەی دارە بەنە ئەتیاکە
سیمای بەفرو گوتا چیتر
ترسباری جورئەت نابێ
چاوی کارمامزی تێژڕەوی شەپۆلەکان
چیتر بەندەی ،،
دەست و پەنجەی سووتاوی تاج داماڵ نابێ
گوایە ڕەوەی قولینگە مێینەت نەدیبێ
چۆن بەدەوری کانی ئەڤینی سەرلێوی
سێدارانی خەنەو خەرمان سەما دەکەن
قاسپە نابڕێ لە کێوێکا
هەمیشە بەفری تێ کەوێ

بۆ دامێنی ، بەدیار خۆڵەمێش و پەنگر
قەت سووتانی گیانی قەقنەست نەدیوە
چۆن وەك ڕامی بخور ئاسا
دووکەڵێکی بەرزەفرە
گومای ئاسمان دەشواتەوە
پایزیش بێ
گەڵای زێرباو
ڕێزەی دەوری باڵا دەگرن
ڕۆحی ڕەگە ڕۆچووەکان
ئاوشۆری زەمزەم دەکەن و
خوێیان چوێی لە دایك بوونی نوێ دەگرن

شەوان ئەستێرەی وەریویش
دادەبەزنە ئامێزی لق و پۆپەکان

سەگوەڕی دووری ئاوایی
بێنەقاقای
گەردنی ئەسرین تێ زاوی
بلوورێنی بۆ ئاگری
ڕەنگ خاکێکی پەلە خواردەی
لەسەر سەردا هەڵگرتووە
کام ڕووناکی حنگای شەوی
تێر تێ نەچن دەگرینەوە
کامە خەندە
گەرمی دڵۆپە فرمێسکێ
دەبەخشێتە ناوەداتی

مێردەزمە
تراویلکەی بۆ ئاگرێ
ڕەشەبا یا بلوورێنێ
تا دەگاتە مێشك پڕبوون
گمەی ڕەوە کۆتری سپی
لە دواتە تا هێسك شەق بوون
ڕەنگە دەرگای چاوەڕوانی
تەقەو ڕەقەی لێوە نەیێ
بەڵام دڵنیام سێدارانی
دارەبەنێکی زیندووتر
لەسەر سەری خۆی هەڵدەگرێ

بەعقووبە - ١٩٨٨

# دەنگت متوربەی دەڵگم کە !؟

● حمە أحمد جاف ●

کیژگە ، ئەی جوانی بەنازم
هۆ ئاورنگی سەرپەری دڵ.
تروسکەی زەردەخەنەی خاو...
هەی ئاسك و کارمامزی سڵ .

★★★

جوانی تۆ هەزار ئەستێرەی ،
کاروانکوژەم ئەخاتە خەو!
کەژاوەی ـ سێ ساڵ ـ ئازارو...
شەونخونیم ئەخاتە رەو!

★★★

ئەسمەر ، لەوەتەی تۆم دیوە
جڵەوی ئارامم بەر بووە
نەك هەردڵ ؛ بەڵکو سینەشم
گڕی سۆزتی تێ بەر بووە.

★★★

لێم روونە ، نەشتەری وژەت
پەردەی نهێنیم پێ ئەدرێ!
جوانترین شیعری ناسکم...
لە ژێر پێتا پێ سەر ئەبرێ!

★★★

دەکچێ وەرەو بەسە ئیتر
چیتر بە خۆتا مەنازە!
لە روانگەی بەرزی ژینتەوە
پەڵپی گەورەم لێ مەخوازە!

★★★

چونکە من خاوەنی خۆم و ...
کەشکۆڵ شیعرە ، پێ ناسم!
لە شیعریش زیاتر چیم نیە
بە گەردنتا ؛ هەڵی واسم!

★★★

گەر چاوێکی بەزەییتم
لە سوچێکەوە تێ بگری.
نابینی : کە جارێکی تر ...
چاوی شیعرم بە کوڵ بگری.

★★★

ئازیز ؛ هەتاکەی شەنی خەم
ئەم کاتە خەرمانی دەم با؟
تاکەی ئەو زریانە تووشە
لەگەڵ خۆی هەڵەگرێ ، دەمبا؟

★★★

سەرتاپای تەمەنی ژینم
ئەشکەنجەو ماڵ وێرانیە!
ئەنجامی هیوای ئەم دڵەش
کڵۆڵی و سەرگەردانیە!

★★★

لەوەتەی تۆشم ناسیوە
( خەم ) هاودەم و میوانمە!
خورجینی ژانەکانی تۆش
بارێکەو لەسەر شانمە!

★★★

نەمزانی لە باخی سنگتا
هوزاری دڵ ، هەڵفریوە.
قەڵای سێ ساڵ عیشق و ئەوین
بەسەر یەکا تێك چەمیوە!

★★★

نەمزانی زیندانی دیلی!
بۆتە هاورازو دیدی تۆ!
کۆتی کۆمەڵی دواکەوتوش .

بۆتـــە سنـــوری زێـــدی تۆ !

★★★

زەبــرو زەنــگــی نەریــتــی کۆن
بارگــەی خەم ئەخـا لە ژوانــتـا
مافی ژیــنــت ئەســوتــێــنــێ و...
تارای رەش ئەدا بە شانــتــا

★★★

کە دێــیــتــە ناو ئەوکــی یادم
گریــان بیرم ئەشــێــوێــنــێ.
خەنــدەی لە ئەشــکــا شۆراوت
کڵپــە لە دڵ هەڵ ئەســێــنــێ!

★★★

ئەشـکـی یادت ؛ زەنگــوڵ زەنگــوڵ
دێــتــە خوار بە زەڵــی چاومــا
پشکــۆی گر ؛ ئەبــا بە لەشمــاو...
تێــپــەر ئەبــێ بە هەنــاومــا

★★★

کێ بێو لە ئەلبــومــی ژیــنــا
پەرەی یادت هەڵداتــەوە؟
جگــە هەژارێــکــی وەك من
جار جار بەســەرت کاتــەوە!

★★★

نەمــزانــی کە میــوانــی دڵ
تەنــهــا ژان و شکــســتــیــیــە!
نەوەی یەك تۆزە رووونــاکــی
ســەخشێ ، ( خۆشــەویــستی ) یە!

★★★

دەکــچــێ وەرەو بەســە ئیــتــر
کۆتــی بێــدادی بپســێــنــە!
دەنــگــت متــوربــەی دەنگم کەو...
دەروازەی خەم بتــرازێــنــە!

★★★

وەرەو بســکــی چاوکــەیــیــت
بدە بە کەشــتــی هێــمــنــمــا
با هەنــاســەم بیــشــەکــێــنــێ
بەســەر سیــنــەی شاری ونــمــا

★★★

دەوەرەو لە کانــی مەمــت
پرکــە دێــمــکــەی بەر پەرێــزم.
بەدوای زولف و پەرچــەمــت
لێــك بەســتــە ، مەڵۆی ئامــێــزم .

★★★

تۆ هەنــاســەی ئەو هەڵبــەستــەی؛
نوقــمــی خوێــن و خاك و گڵمــی!
کیــژۆڵەیــەکــی سیــاچــارەی؛
کوردی ؛ نیــشــتــمــانــی دڵــی!

★★★

نازانــم چۆن و تا کەنــگــێ
لە دڵتــا شی ئەکــرێــمــەوە؟
داخــۆ چ زەمــانــێــکــی شیریــن
وەڵامــی پێ ئەدرێــمــەوە؟

★★★

گوێــچــکــەت بێــنــە با پێت بڵێم
گەر پەیــمــانــی راســتــیــت ئەوێ!
بێو ... لێــشــم بچــی بە قیــنــا
هەتــا مردن تۆم ( خۆشــەوێ).

★★★

# هاوارەك ژ عەمۆی را

عەمبوو داوۆ
تۆ بزانە
نەمن خانێ لەب زێرینە
شیری زکڤانی بکێشت
نەمن بەدرخانە . . .
بێژت : —

**شەر دەهوەتا مە مێرانە**

م پارێزت
هەی هۆ هەی هۆ
ئەڤە سەرێ جەند سالانە
هەبی و نەبی
بشارێ جەتوو دەستەکا خۆەنە
هزرەتا وان . . . .
هەرۆ بن زكو پارەنە
ج بیانیێ هات دگۆندا
بێ پس و پسیار
دنێڤ کووجکا من پالددا
دبوو مۆختار
لۆ لۆ عەموو
من هیڤی یە
ژدەبێ میرێ مرادا[1]
بەر سپێدەکێ
رەشکووتێ راکی[2]
خوە ژبەهەشتێ . . . . .
بەردەی خار .
بژڤرینی جەرخا ڤی هەلەکێ
بکەی بەهار



کرمانج هەکاری

# خۆشەویستی

محمود خسرو کا انی

کە دەوڵەمەند
لەگەڵ کچێ ژوان دەبەستێ
باسی خەونی گەنجینەی قارون و سامان
لەمێشکی کچە دەچەسپێ .
بەلام کە شاعیرێ هەژار
دەگا بە دیداری دڵدار
گشت خەون و هەستی پڕ ئازار
بەرامبەر یار
دەکا بەسۆزی هەڵبەستێ بۆ یادگار

کە دەوڵەمەند
لەگەڵ یاری دێتە گوفتار
باسی گەردەنی پرخاڵ و ماچ و موچی
لەدەم بەلێشاو دێتە دەر
دوا ووتەشی بۆ رژوازیەو سواری (سۆپەر) ،
بەلام کەشاعیرێ هەژار
لەگەڵ یاردێتە گوفتار
باسی باسی هەژارانەو...
چەوساندنەوە بەدەست زۆردار .

# تابلۆیەك

علي صالح میران

دەبینم لەو ناوە ئیمرۆ
خەڵك بەجارێ سەرخۆشن
لە سەیری ئەم دیمەنانە
کچ و کور مات و مەدهۆشن
ئاسمانی شین
بەجوانترین شێوەی رەنگین
سەوزەگیای جوانی پۆشیووە
پرشنگی رۆژ هەوارەکەی داگرتووە
درەختەکان
لەگەڵ باخە پڕ مێوەکان ..
پڕ لە دەمی ئاو کردووە
چنارو ئەسپینداری جوان
لەبەر سەوزیو لەبەر بەرزی
ئاوی چاوانی بردووە .
چیاکانی هەردوو بەری هەوارەکە
بوتە پەرژینێکی بەتین بۆ شارەکە
دوو دڵداری تینوی ئەڤین
لایێ سۆرك و لایێ سەفین
پۆپەی بەرزیان .. سپی بەفرین
کەسێ نیە دڵخۆش نەبێ لەم بەزمەدا
هەموو چینێك تێکەڵاوە لەم کاتەدا
بەلام هەموو ئەم شادیە
کە نیشانەی ئازادیە
قەت بینابیم پێی هەڵنایێ
کە ئیمرۆکە دڵخوازی خۆم
لام دەنگ و ئاوازی نایێ

# شۆرشا ئەڤینێ

چیایێ بێستون
نەڕختێ شرینا
فەرهاد بوو ؟ ! !
گیانێ وی ژی خەلات بوو . . .
ئو چەندەها
ئەڤیندارا
گیانێ خو کرەگوری
لڤێ رێدا
ژ بەر بەکروکو نەیارا
کو نەدڤیا
بگەهن کاروانێ ئومێدا . . ؟ !

ئەگەر وەبیت . . . . ! !
بوچی . . . . . ئیرو
تە ئەڤیندارێن
جیهانێ
ئیك ناگرن . . !
بن ئێك دەست
شورەشەکا
ڤینێ راکەن
بو ئێك مەبەست
پەیمانەکێ
پێکڤە چێکەن
سەرێ نەیارێت
ئەڤینێ
هەمیا ژێکەن
هەمیا ژ یکەن

٥٠

- هاشم ڕێکانی -

# وانەیەکی نوێ

ئەمیر حسین رەحیم
« رانیە »

دەڵێن: ئەگەر
ئەستێرەیەك ..
لەو دیو هەر حەوت چینی ئاسمان
تاڵە کانی قژی زەردی
لە نوچی زێرینی ئاڵاندا
خستیە ناو هەبکەی شریەوەو
نایە سەر شان
خزی بەرەو تویکڵی زەوی و
نیشتە سەرکێلی گۆرستان
ئەوە هێمای سارد بوونەوەی
جەستەی گەرمی مرۆڤێکەو
لەو شەوەدا یەکێك دەمرێت .
ئەوە وانەیەکی کۆنەو
لە حوجرەی مزگەوتەکاندا
هەتا ئەمرۆش منداڵانی
پێ گۆش دەکرێت .
بەڵام هاوڕێم ..
هەرئەو شەوەی
پارچە یەك کانزای ژەنگ گرتوو
تەنی گەرمی وەك پەنگری
لێکردی بەبەفری مردوو
ئەستێرەیەکی چوار نوچی
بەخوێن سووربوو
لەسەر سوێیانەی
دارماوی مزگەوتێکدا
چەخماخەی داو
لەرێگای کاکێشانەوە
هەڵز تا تابڵندی ئاسمان
ئەستێرەی رەنگ
بەخوێن سووربوو
هەتا ئەمرۆش
راستی وانەی ،
هەموو حوجرەی فەقێیەکان
پێ شێل دەکات .
منداڵانیش فێری یاسایەکی نوێی
مردن لەپێناو ژین دەکات .




# چیرۆکنووس

عەبدوڵڵا سەراج

جاران وا دەست پێدەکرا : هەبوو نەبوو . لە چاوی هەڵۆ تیژتر نەبوو . لە کەمتیاریش دزێوترو گەندە خۆرتر نەبوو . هەبوو بەپیاوێك ، سەر سپی . دڵۆ دەروون سپی . بەڵام با لە نووکەوە دەستپێبکەین . تۆ چیتداوە لە سوپەرو ڤاڵڤۆو ... تاکسیش رامگرە . بەپەنجا فلسێك خۆت بهاوە ناو ترومبێلێکی ترحێوەوە . لە «ئەحمەدئاغا»ی کۆنەوە وەردەچەرخێی بۆ شەقامی ئەتڵەس . لە چوار رێیانەکەی کن پردی دووەمدا ، ترافیکەکە رێگا بە هەندێ شوفێر دەدات بریکی دیکەش پێ بە بریکەوە دەنێن یان دەیدەنە بۆش . وێجا سوور دەبێ بە سەوزو ترحێوە شلۆقەی تۆ تەکان دەدات ، بە لای چەپدا دەسوورێتەوە ، راست بەرەو رەحیماوا . لەشانی راستدا «تۆپ قەڵا» پێدەکەنێ بەرووی «باخچەی مەجیدیە»وە ، تێدەپەرێ . کتێبخانەی گشتی، پردی یەکەم ، هەورازەکەی کۆرنیش . هەندێك دادەبەزن ، برێك تەکانی سوار بوون دەدەن . تۆ لە جێگای خۆتی کارگەی کۆلاو ... پاش نەختۆکەیێك دابەزەو روو لە بازارەکە بکە . لە هاوشانی راستت دیوارێکی بلۆکی بڵند سەرنجت راکێش دەکات . دیوارەکە نوسراوی جۆراو جۆری پێوەیە . پیتەکان کاڵ بوونەتەوە . هەندێکی تریش ، بۆیەی رەشیان پێدا هێنراوە وەلێ دوو سێ وشەی بزێوو سرك سەرەتاتکێ دەکەن ! لەو لاشەوە بەبۆیاخی سوور تیرێك ، دڵێکی نارێکی پێکاوە . بارانی پێشوو روخساری هەندی وێنەی قەد دیوارەکەی شێواندووە . چەند تیرێکی سەوز ئاماژە بۆ دوکانێك دەکەن . کۆڵانێك . بێ ترس تێپەرە چونکە ئەگەر باران بوایە ، ئەوا هانات بۆ بەردەباز دەبرد . دەی تێ خۆت لە چڵکاوەکە بگرەو راست برۆ . ریزێ دوکان . قەیسەری یەکەمو دەرمانخانەیێك . دوکانی دیکەو قەیسەری دووەم . لەوێ بە تەك سەوزە فرۆشەکەوە جاخانەیێکی زەرد دەبینی وەك زەردێنەی هێلکە . دوکانێکی تەنگ‌و کابرایێکی سەر سپی ، قورسایی ئانشکی خستۆتە سەر مێزێکی ئاسنین‌و چاوە کزەکانی لە دیواری بەرانبەر گرتووە . سەرنج بدە، رۆژگار باری کردووە لە ئەشکەنجەو شێوەی شەست ساڵانی پێبەخشیوە . ئەو کابرایە دەیەوێ چیرۆك بنووسێت ، چیرۆکێك ، نە ئاسایی بێ‌و نەسواو ، بۆیە بە سانایی کامی دڵی خۆی بۆ ناهاوێژرێتە روباری وشەوە . وەشەکانی لێدەبنە بەردی هەڵمەقۆو بەهانایەوە ناچن . جارو باریش خۆی لە شەپۆلی وشەکان یاخی دەبێ لە بەر ئەوەی ئاگەنە ئاستی نیازە پیرۆزەکەی . بەهەر حاڵ ، واناسیت‌و گوێی بۆ شلکە .ئیتر لە مەوپاش ، کابرای سەرچەرمووەو دەدوێ . ناویشی ... نا .. چ پێویست بەناو دەکات ..

(۲)

ئەو سەر چەرمووەی دەیەوێ چیرۆك بنووسێت منم کە لە حەفدەی مانگی یەکەمی ئەم ساڵەدا ، بەندەی بە ئێوە ناساند . ئاشنای کردین . وەلێ ئەوەی نوسیومە ، چیرۆکەو چیرۆك نییە . بێگومان گەوهەری چیرۆك هەڵوێستەکەیەتی بۆیە لاوەکی گوێم داوەتە شیرازەی سەرەتاو گرێ ، یان ترۆپك‌و کۆتایی . گرێ ئاوێزانی رستەو وێنە کانە . ترۆپکیش وا بە پەنهانی لە ناو پێنج هەستەکەدایە . قسەکردن نیە ، چونکە کەس متەقی بۆ نەکرا دەق وەکو ئەوەی مومیایێکی فەرعۆن بێت ! لە ساتی وادا سەرەتاو کۆتایی لە شێوەی بازنگی مەچەکی خرینێك یەکدگیر دەبن .. ئامباڵای یەك دەبن . رەنگە ئەمەت بەلاوە سەیر بێت ، ئوبالی ئەم چواندنەش لە ئەستۆی سەردەمەکەیەو هەمان بەڵگە ، پەنای پێبردمە زمانی دیکە ، دراما .. شێوەکاری .. بێدەنگی .. بۆشایی .. مونتاج . کەڵك لە سایکۆلۆجی‌و راستگۆلۆجی‌و .. لۆجی‌و لۆجی وەردەگرم بۆ بتەو کردنی وینەو دەربرینەکانم .

دەڵێن : «زمانەکەت جەنگەڵێکی چڕو ترسناکە !»

بەر گوێم کەوتووە گوایە «وشەکانی بەرداشن‌و وێنەکانی رك‌و سەختن‌و ...»

منیش وەرامم ئەمەیە : بۆ زمان تەنیا زمانی وشەو قورگە ! ئەی زمانی ڕەنگ‌و هێڵ‌و... هێن ! ئەی زمانی پاراوی بێدەنگی ! ئەوەی دەمەوێ بیدرکێنم ئاشکراو روونە وەکو کۆترێکی سپی لە ناو سەوزە گیایێکدا ، گوناحی من چییە ئەگەر ئەو کۆترە باڵی شکێندرا بێت‌و لە پێش چاوی ڕاوکەر خۆی مەڵاس دابێت ! ئەمن پڕ بەدڵ حەز دەکەم ، خامەکەم زمانی لێبێتکی‌و قوژاخەی ئەوین‌و جوانی برەنگێنێ ، کەچی ملۆزمی مەرگچێن بۆسەو مێن‌و کولەوەبیاب دەخاتە چەقی رووگای . گومانیشم هەیە لەوەی کە وشە بتوانێت ئەو دیمەنەم بۆ تۆمار بکات کە دیتم . دیمەنەکەش پێش چاوپی بوو ، زیندوو بوو وەك من‌و تۆ . وەك دیتم ، نەك بە سەرجەمی وشەی فەرهەنگێك ، بەڵکو گشت ڕەنگی هونەرمەندانیشی لە پاڵدا بێت ، هەمدیسان ناگاتە ئاستی ئەو دیمەنەی کە بە چاوانم ، بە هەستەکانی دیکەم ، دەموژقتەوە ... دەمخواردەوە . هەڵمدەمژی .

کات : مەپی بوو . سست دەرۆیی‌و بۆ چوونی ئاینشتاینم لەلا سەلما . چرکەکان هەڵپاتی قورقوشم بوون ، شەست دەبارینە سەر خەڵکە دەم داچەقاوەکە . ٣

جێگا : دیوارێکی لاڵ‌و بڵند .

لەناخمدا کات‌و جێگالە باوەشیان لەیەکتری داو تابلۆکەی «گۆیا» لەبەر چاومدا هەڵواسر .. «سێی ئاداری ١٨٠٨» لە شەقامێکی مەدریددا .

ئێستاکە بیرم ئاودیو دەبێتەوە بۆ هەزاران ساڵی پێشوو ، بگرە بۆ ملیۆنان ساڵی دێرین کە بنیادەمی زەرزی‌و شانەدەریو هەزارمێرد لە ئەشکەوت‌و لێرەوارانداا ، ڕیزی لە ڕواڵەتەکانی سروشت دەگرت . کرنووشی بۆ ئەستێران دەبرد . لێیان دەتۆقا . سام دایدەگرت . لە لێشاو دەترسا . لە بوومەرزە زراوی دەتەقی . لە شەیتان دەترسا . لەنوای بەدکاران چۆکە لەرزەی دەگرت . ترس .. سام .. ترس .. تۆقان .. هەتا ئەو ترسە لە ناوەوە یدابووە . ڕیزو شکۆو پایە لە زەبرو قەمچی تاپۆکران ، لەوانەی چرنووکیان هەبوو ، کەلبەدارەکان ، ئەوانەی چاویان سوور بوو . ئا بەو پێوانە ڕەمەکییە ، مێژوو بووە مێژووی کۆشك‌و دەرباران . ئەو ڕەشو رووتانەی کە بەچاکی یەزدان پەرست بوون ، بە بێ نیازو ترس‌و قەرەبوو دانەوە ، ئەوانە زۆر زۆر زۆر دەگمەن بوون وەکو هێلکەی باڵندەی یەکسانی . وەلێ لەگشت کات‌و لەگشت قوژبنێکدا هەبوون‌و دەشبن .

ئەمرۆ گلێنەی چاوان دەیانویست وەکو خەنجەری دەبان لە کالانەکانیان یاخی بن ، دەرپەرن‌و داخی سپڵە ئاوساوەکان هەڵڕێژن . دیرەکێکی ئەستورم بەدیوارەکەوە دیت ! سەدان چاولە گریان‌و ئەشك ڕژتن تۆرا بوون . قورگەکان وەك ئەوەی کەتیرەیان پێوە لکابێت ، تفیان بۆ قورت نەدەدرا . چوار مەچەك بوونە میوانی دیرەکە چەوتەکە . چوار چاوی زۆر چاو بەستەکەیش ، شینایی ئاسمانیان لێزەوت کرا .. جووتێ دەمیش سروودی بێدەنگیان دەچری . دیدەم بووە پەرەسێلکەو سوورابەوە . بەخۆم گوت : «ئەوە ئەم خەڵکە هەناسە نادەن ! جاران بروام ناکرد خوێنی مردووان هەبێت ، ئەمێستا بەچاوی خۆم دەبینم خوێنی مردوان بە خواریی دەفرۆشن . !» لە کولێنەی چاوانەوە تۆپەڵی گرو قینیان لە نێوچاوانی زەبرو دزێوی دەگرت . تۆ وشەت دیوە گر بگرێت ! قەت نیگات دیوە تیروەشێن بێت ! بێدەنگیت دیتووە لە زمانێکی هەڵەوەر ساکارترو کاریگەرتر بێت ! نەمگوت ساتی ناسکی وا هەرگیز بە تۆری وشەو دەستەواژەکان ڕاو ناکرێت ! هەر وەکو بتەوێ پەیکەر بۆ سێبەر بتاشی ئاوها مایە پووچ دەبی ! تۆ لەشی مرۆڤێکت دیوە ، لە چرکەیێکدا وەکو سیپاڵی سەر تەناف شۆر بێتەوە ! ئای کات ژمێرە هەڵواسراوەکەی سلفادۆر دالی. ئای فوارەی خوێن چۆن دیوارە لاڵە کەت ئاڵکردو چەندین ڕێچکەش هێڵی ستوونیان کێشا بەرەو پیادە ڕێیەکە . ئەی ئەگەر دوو بوخچەی نەکراوە بوون ! دەبزانە چۆن وشە بەو کولییەی خۆشی ، موچرکە بەگیان‌و لەش دەبەخشێ ! دەیەژنێ ! ئیتر لەوە پاش چ دەبێ بابێ ، چش . با تەرمە ساردەکانیان بکرێن بە بێژنگ . باکولەبنەیێك ئاو بدات‌و هەر دوو مێشکەیان بپژێنێ‌ئەوان‌تازە بوون بە دوو باڵداری سەوزی دەنووك سوور .

لەدڵی جووتێ دایکدا ، بوونە دوو هەڵۆی زێڕینی تۆڵەسێن . چیرۆکەکەم لێرەدا تەواوبوو . ئەمە بوو شایەتیی خامە کۆڵەوارەکەم‌و بەبیست پەنجەمەوە مۆری دەکەم . ئەوەی هەمبێت تەنیا خەرمانی وشەیە . ئەوەشی بمێنێ‌هەر وشەیە . چەپکێ گوڵ‌و چەپکێ نێرکز . مەرگتان نەبینم هەرگیزاو هەرگیز .

کانوونی دووەمی ١٩٨٧

تێبینی

١ – (سێ‌ی ئاداری ١٨٠٨) ناوی تابلۆیێکی بەناوبانگی نیگارکێشی ئەسپانی گۆیایە .

٢ – (کاتی هەڵواسراو) ناوی تابلۆیێکی سلفادۆر دالی‌یە .

نوا : پێش

کاڵان : کیف

دیرەك : داری ئەستوور

کەتیرە : سریش (صمغ)

کولێنە : کونی ئەندوور



# بیوەژنەکە

نووسینی :
مەکسیم گۆرکی

وەرگێرانی لە ئینگلیزی‌یەوە
عەلی ئەحمەد رەسول



لە سەردەمێکی لاویمدا کە قوتابی بووم و لە زانکۆی «قازان» دا دەمخوێند ، لە ماڵی هاورێیەکمدا دەژیام «بچکۆف»ی ناوبوو. خانووەکەیان زۆر کۆن‌و داروخاو بوو ، دیوارەکانیشی هێندە رزیبوون ئەوەندەیان نەما بوو کە برووخێن . قەوزە دارو دیوارەکانی سەوز کردبوو ، جۆرە رووەکێکیش لە درزو قڵیشەکانەوە هاتبووە دەرەوە .. سیمای دیوارەکانی ونکردبوو . خانووەکەیان بریتی بوو لە سێ ژوورو یەك نهۆم بوو ، زریان‌و رەهێڵەی زستانانیش جێ پەنجەی خۆیانیان وەك یادگار تیا جێ هێشتبوو ، تا ناوقەدی دیوارەکان نقوومی شێ بووبوو ، کە وەرزی زستانیش دادەهات پێش هەموو کەسێك بادەی سەرمامان دەنۆشی ، چونکە پەنجەرەکان شووشەیان بە ساغی تیا نەمابۆوەو هەوا بە ئارەزووی خۆی دەهات‌و دەچوو .. ئەو ژوورەی کە بۆ من تەرخان کرابوو ، هەرچەندە لەوانی تر کەمتر نەبوو ، بەلام ئێجگار تاریك‌و شێ‌دارو دارماو بوو ، تیشکی رۆژ بە هیچ کلۆجێك نەدەکەوتە ناویەوە . بچکۆفی هاورێشم زۆر خۆشی دەویستم‌و رێزی لێ دەگرتم ، هەمیشە هەولی دەدا لە هەوایەکی خۆش گوزەرانیدا بەختەوەرم بکات‌و ئەو بێزاری‌و دلتەنگیەم بتارێنێ کە دووری رژاندبوویە ناخمەوە .

دایکی بچکۆف تەمەنی لە چلەکاندا دەبوو ، ئافرەتێکی گورج‌و گۆڵ‌و هێمن‌و رووخۆش بوو ، بزەیەکی سازگار هەمیشە بەسەر لێوەکانیەوە بوو لە ناخۆشترین کات‌و لەوپەری توورەیشدا لێی جوێ نەدەبۆوە . گەلێك رێزی دەگرتم‌و بە یەك چاو لەگەل منالەکانیدا سەیری دەکردم ، بگرە لەوان زیاتر لە توێی دلە پر سۆزەکەی دەگرتم‌و زۆر بە تەنگمەوە بوو . هەندێ جار چەند سەعاتێك لام دادەنیشت‌و بە سۆزو خۆشەویستی دایکانەوە پرسیاری لە کەس‌و کارم ناوچەکەم دەکردو هەواڵی داپیرە دوورەکەمی لێ دەپرسیم جار جارەش ئەو بەسەرهات‌و رۆژگارانەی بۆ دەگێرامەوە کە وەختی خۆی لە کچێنیدا دیتبووی ..

مێردەکەی پێنج شەش سالێك دەبوو سەری نابۆوەو مووچەیەکی خانەنشینی کەمی بۆ بەجێ هێشتبوون کە بەشی گوزەرانی نەدەکردن‌و خەمی گەورەش بۆ ئەمی داماو مابۆوە تا پێویستیەکانی ماڵ‌و منالەکانی دابین بکات ، بە تایبەتیش ئێستا کە میوانێکیان زیادی کردووە .

مانگێکی رەبەقم لەگەلیاندا بەسەر برد ، مانگێکی تەواو بەشداری خواردن‌و خۆشی‌و خەمەکانیانم کرد . رۆژێکیان گوێم لێ بوو بچکۆف سەرزەنشتی برا بچووکەکەی دەکرد لەسەر ئەوەی داوای لە دایکی کردبوو خواردنەکەی بۆ زیاد بکات ، پێی ووت : «جوان نی‌یە داوای شتێکی وا بکەیت ، ئەی نازانیت میوانێکی خۆشەویستمان لەگەلدایەو خواردن

ـیکەوە بەش دەکەین!» . ئیتر لەو ساتەوە زۆر نارەحەت‌و خەمبار بووم ،
ـکم لە خۆم دەبۆوە کە بوومەتە بار بە کۆلیانەوەو بارەکەشیان ئێجگار
قورسە .. بریارم دا پاش هەموو نیوەرۆیەك بچمە بەندەرەکە تا کارێك
پەیدا بکەم‌و هیچ نەبێت پارەی خواردن‌و جلوبەرگم دەست کەوێت .
پاش پرسیارو سۆراخێکی زۆر ، سەرەنجام ئەوەی دەمویست هاتە دی ،
بوومە حەمباڵ‌و جانتاو کەلوپەلی تری سوار بووەکانی ناو کەشتیەکانم
دەگواستەوە بۆ بەندەرەکەو لەو ێشەوە زۆر جار لە گەڵ کرێکارەکانی تردا
ـزمان سەرئەخستە ناو کەشتیەکانەوە . ئێوارەیەك کەشتیەکی گەورە لە
بەندەرەکە لەنگەری گرت ، ئێمەش کە بە داگرتنی سندووقە چای
شەکەت‌و ماندوو بووبووین ، ئافرەتێك لە نێو کرێکارەکاندا سەرنجی
ـ کێشام ، لە ناوەندی تەمەنیدا دەبوو ، دەم‌و چاوی هێشتا چرچ‌و لۆچی
تێ نەکەوتبوو ، لە ژێر ئەو سندووقە قورسەدا چەمابۆوەو بە دەم رێگاوە
گۆرانییەکی خامۆشی دەچری تا ئەشکەنجەو ئازاری ئەو ژیانە ناخۆشەی لە
ـیرباتەوە ، تاوێك بێ‌دەنگ دەبوو دوایی تێ دەچرییەوە .. خاوەنی ئەو
هەموو سندووقە چایەش وەك بایەقووش بەسەرمانەوە وەستابوو چاودێری
دەکردین ، هەر کاتێکیش حەماڵێکی ببینیایە لەسەرخۆ دەروات بە سەریدا
ئەیەراندو گۆچانێکی تێ دەسرەواند ، هەر وەکو گاوان چۆن رەشە
وولاخ رادەدات .. بەو چەشنە بوو .

پاش ئەوەی هەموو سندوقەکانمان داگرت ، تاوێك بۆ حەوانەوە
دانیشتین‌و چاوەروانی وەرگرتنی کرێکانمان دەکرد .. کرێکارە ئافرەتەکە
قوولایی دەریای بیرو خەیاڵەکانی دەبری کە هاتە تەنیشتەوە دانیشت ،
هەروا بیری دەکردەوەو لەم جیهانە خافڵ ببوو ، چەند جارێك سەری بەرز
ئەکردەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەمژی‌و بەرەو جیهانەکەی خۆی
دەچۆوە .. هەرچەند تێمدەروانی ئەسپێکم‌دەهاتەوە یاد هیلاکی‌و
ماندوویتی شەکەتی کردبێ .. زیتر خۆم پێ نەگیراو پرسیم :

– ناوت چییە ؟

– ماریانا !

– بۆ ئەوەندە دڵتەنگیت .. ماندوو بوویت ؟

ئاورێکی دایەوەو سەرنجێکی قووڵی پشکێنەرانەی لە جەستەم بری‌و
وەڵامی دامەوە :

– چاوەروانی چی لەو کەسانە دەکەیت کە تەمەنیان لە نێو ئازارو ستەمدا
بەسەر بردووە ؟ ، دەتەوێت وەك ئەو کەسانە دڵخۆش بن کە هێشتا
ماندوویتی پەی پێ نەبردوون ! .

ئەو وەڵامەم زۆر پێ سەیر بوو ، دیار بوو رەنگدانەوەی هەموو ئەو ئازارو
کوێرەوەرییانە بوو کە تڕووسکایی ژیانی لێ بریبوو . سەرلەنوێ لێم
پرسییەوە :

– شووت کردووە ؟

– بەڵێ ، بەڵام وا بۆ ساڵێك دەچێت مێردەکەم مردووە . نەخۆشی گرانەتا
کوشتی .. پاش خۆی تاقانەیەکی جێ هێشت کە هێشتا تەمەنی نەبۆتە سێ
ساڵ . بە هۆی کرێی ئەم کارەشمەوە نەبێت هیچ شتێکی تر شك نابەم تا
منالەکەمی پێ بژێنم .. زۆر هەوڵمدا ببمە خزمەتکاری ماڵان ، بەڵام
هەرچەند لە دەرگای ماڵێکی دەوڵەمەندم دەدا ، دەرکەی دەم‌و دەست
لە رووم دادەخرایەوە ، لەبەر ئەوە نەبوو کە ئیشی ناوماڵ نازانم ، بەڵکو
لەبەر ئەوەی منالێکم هەیە !

– «ئەم ژیانە پر دەردەسەرییەش بە ژیان دادەنرێت ؟ ! ئێمە بە خۆرایی
تەمەنمان وون دەکەین .. تا رۆژێك کارێکم چنگ دەکەوێت سێ چوار
رۆژ بێ ئیش دەمێنمەوە .. منالەکەم نەخۆش کەوتووەو لای دراوسێیەك
جێم هێشتووە تا بتوانم پارەی دەرمانی بۆ پەیدا بکەم ، خوا دەزانێت ئێستا
چی بەسەر هاتووە !» قیرەی خاوەنی کەلوپەلەکان بەرزبۆوەو بانگی
دەکردین تا کرێکانمان وەربگرین .. کاتێك ئافرەتەکە پارەکەی وەرگرت ،
چاوە گەورەکانی رووەو من وەچەرخان‌و ووتی : «هەواکەی سارد
کردووەو ئاسمانیش ئەم هەموو هەورە چرانەی لە ئامێز گرتووە ، دیارە
تەمایەتی بە هەرەشەی خۆی دونیا لەهەموو پیسییەك بشواتەوە ..
منالەکەشم نەخۆشە ، بە خوات دەسپێرم !» .

رەشەبایەکی توند هەڵی کردو ئەو ناوەی خستە گێژاوێکی بێ‌سەرو
بنەوە ، دەنگی شەپۆری کەشتیەکانیش کردبوویانە ژاوە ژاوو غەڵبەغەڵبێك
ترسی دەخستە دڵەوە .. شەپۆلە سەوزەکانی دەریاکەش بەرزو نزم
دەبوونەوەو بێ‌بەزەییانە گاشە بەردی رۆخەکەیان دادەپلۆسی ، هێندەی
پێ نەچوو گرم‌و هوری هەورە رەشەکانیش تێکەڵی ئەو ئاهەنگە سەر شێتە
بوون‌و دایکردە لیزمەی باران .. خاتوو ماریانای ماندووش خێرا رێگاکەی
دەبری تا زووتر بگاتەلای کۆرپە نەخۆشەکەی .. رەشەبا کراسەتەرو
شۆراوەکەی دەهێناو دەبرد وات دەهاتە پێش چاو سە سەرخۆشێکی
ئێجگار مەستە !

دەقی چیرۆکەکە لەم کتێبەوە وەرگیراوە :

Collected Works Of Maaxim Gorky ' Oxford University Press.

London Humphery Milford 1948.





# دار زەیتوونەکەی غەززە

کەمال عەولا

لەناوەندی شاری غەززە دار زەیتوونێکی گەورەو نەقوڵا هەیە. لە بەردەمی چاخانەیەکی کۆن و ئاوەڵا قیت بۆتەوە . ساڵ دوانزە مانگ هەمیشە کەسکەو گەڵاکانی تەرو تازەن . کەس نازانێ لە چ دەورو عەیامێك لێرە شین بووە ، چەندەها پشتەو بە بیری کەس دانایێ . ساڵ بە ساڵ قەدی ئەستوورترو لق و پۆی چرو پرتر دەبێ .

رەگ و ریشەی بۆ بنی‌بنەوە رۆچووەو گەییوەتە سەر ئاوێ . سێبەریشی بەقەدەر خۆی پان و پۆرو گەورەیە . هاوینان پیرو پەککەوتە کە بەوێدا رەت دەبن ، لادەدەن و لەبنی لێ‌پشوو دەدەن . منداڵان کە لەیاری‌و گەمە ماندوو دەبن ، روو دەکەنە ژێر پیرەدارو بۆ تاوێك لێی دادەنیشن ، گۆرانی دەڵێن و دەیکەنە چەپڵەرێزان . کوری گەنج و هەرزەکار لەسەر رێی دەزگیران و دۆستانیان لەبن درەختی هەمیشە پەناگە دەوەستن

و دڵیشیان هەر وەختە شەق بەرێ شار ئیمرۆ جەنجاڵە . جمە دێ . خەڵك وەك مێرووڵە دێن و دەچن . هەندێك بۆ بازار دەچ و هەشە بەخۆو بە زەمبیلەی پر لەشتەوە بەرەو ماڵ دێتەوە.

نوێژی نیوەرۆ دانەهاتووە .. جادەکان پریەتی لەخەڵك زۆربەیان ژن و پیرن . قوتابیەکان هێشتان بەرنەبوونەو مەکتەبەکان خەریکی دەرز خوێندنن . دوو ئۆتۆمبیلی بو بەپرتاوی تێپەرین و دریان بە خەڵکەکەدا. ئەوەندە تیژو خێ رەت بوون ، خەریك بوو یەك دووانێك پان بکەنەوە . پاشکۆ ئۆتۆمبیلەکان پر لە سەرباز بوون ، کەکڵاوی ئاسنیان کردبوو سەرو لوولەی تفەنگە بێ‌قۆنداخەکانیان دەرهێنابوو تفەنگەکانیان سوارو دەستیشیان بە پەلاپیتکەوە بوو . دەم چاویان مرومۆن ، توورەیی‌و ئاگریان لێ‌دەباری . لەبەر دەم مەکتەبێك چەند مێرد منداڵێك سەریان لەبن گوێی یەک

نابووو بە چرپە شتێکیان باس دەکرد . ئۆتۆمبیلەکان کە گەیشتنە لایان هەڵوێستەکیان کردو سەربازەکان هەموو پێکرا چاویان لێزەق کردنەوە قوتابیەکان خۆیان بە کتێبێك خافڵاندو ئاوڕیشیان وێنەدان . ئینجا بۆ پێشیان ئاژاو لەپێش دوکانی تەرەفرۆشێك رایان گرت . ئەفسەرە گەنجەکەی پێشەوە چاوێکیدا ئەو ژنانەی خەریکی شت کرین بوون و لەگەڵ دوکاندارەکە مامەڵەیان دەکرد ، ئافرەتێکی جوان و جحێل سەرنجی راکێشا .. دڵی وەخورپە کەوت .. کڵاوەکەی لەسەر کردەوەو دابەزی . بە لە خۆبایی‌و لوز بەرزی‌یەوە بۆ لای دوکانەکە چوو . کابرای دوکاندار رەنگی هەڵبزرکاو تێك چوو. لەتەنیشت ئافرەتە جحێلەکە وەستاو دەستی بۆ پرتەقاڵەکانی سەر تەختەکە درێژکرد ، هەڵگێرو وەرگێری کردن . بەدزە دزەش خۆی لە ژنەکە نزیك دەکردەوە ، تاشانی بە شانی‌دا ژنە خێسەیەکی لێکردو تفێکی‌خرکردەوەو بە چرو چاوی دادا .

کابرا سوور هەڵگەرا . دوکاندارەکە دەستی لەسەر تەرازووەکە رەق بووو هەموو گیانی وەلەرزە لەرز کەوت . سەربازەکان لەناو ئۆتۆمبیلەکان خۆیان فرێدا . خەڵکەکەی ئەو ناوە دوورکەوتنەوەو لەم لاو لەولا خۆیان بزر دەکرد .

دوکاندارەکەیان داپلۆس . بە شەق و پێلەقە بەربوونە سەری. دووسێ‌یەك شالاویان بردە چایخانەکەو لەوێش ئەوەی بەرچنگیان کەوتبا ، تێرو پریان دەکوتا . لەودەمەدا بەردەمی قوتابخانەکە ئاوەدان بوو ، قوتابیەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بەپارێز دەهاتن ، پری دەستیشیان خرکەو کوچکەبەرد بوو کەوتنە پلارتێگرتن و بەرد راوەشاندن . سەربازێك پێکراو خوێن لەسەریا فرکەی کرد . هاورێکانی پیلیان گرت و بۆ لای ئۆتۆمبیلەکان چوونەوە . بەرگەیان نەگرت و وەختابوو بتۆقن ، بە پرەپرو تەنگەتاوی خۆیان لە ئۆتۆمبیلەکانیان هاوێشتەوە . هێندەی بڵێی یەك و دوو سوار بوونەوەو تێیان تەقاند .

کورێکی باریکە لە کۆڵانێکی تەنگ بە غار دەهات . گەیشتە بن دار زەیتوونەکە ، وەستا . شتێك لەناو مستیا بوو ، توند دەیگوشی . بە هەشتاوی بۆ هەموو لایەکی روانی . لەچاو قوچانێکا ئۆتۆمبیلەکان گەیشتنە بەر دەمی . کورە پێیەکانی توند لەعەرزی گیر کردو شتەکەی ناو دەستی هەڵدا . تەقینەوەیەکی گەورە شاری هەژاند . بۆ تاوێك دنیا کاس بووو شار شڵەژا . لەناوەراستی جادەکە دووکەڵێکی رەش بڵندبوو . ئۆتۆمبیلەکان یەکێکیان سووتاو ئاگری تێبەربوو ، لە ناوێشیا ناڵەو هاواری سەربازەکان دەهات . خەڵك هەر بابابوو رای‌دەکردو خۆی دەگەیاندەوە ماڵێ..

کورەکە هەر بە کۆڵانە تەنگەکە گەرایەوە و بۆی دەرچوو . دەیویست خۆی قوتاربکاو وە بەر دەستان نەکەوێ . کۆمەڵێ سەربازیش کەوتنە شوێنی . هەر چەندی دەیان کرد نەی دەگەیشتنێ . لە پشتەوە چەند تەقەیەکیان پێوەنا ، باش بوو بەری نەکەوت . خۆی گەیاندە گەرەکێکی پڕ لە خانووی رووخاوو کەلاوە . تێدا بزربوو.
شار کش و مات بۆنی خوێنی لێ دەهات . دەنگی تەیرو تووش نەدەبیسترا . بێجگە لە تریقەی پۆستاڵی سەربازو جەندرمەکان، هەست و خوست لە هیچ شتێك نەدەهات . ئەوەی لە جادە و کۆڵانەکان وەبەر دەستان کەوتبا ، دەیان گرت و بێ چەندو چوون راپێچیان دەدا . تا رۆژئاوا خیزاویان لە گەرووی ئەو خەڵکە کرد . ئیدی کەس نەیوێرا سەر دەربهێنێ و دەرگای حەوشە بکاتەوە کورەکە ماوەیەك خۆی لە قوژبنێك مات کرد . پاشان چووە ناو زێرابێکی چڵکاوو بەناو ئاوی پیس و بۆگەن بەکوورە کوورەو خۆ نووشتاندنەوە سەری خۆی هەڵگرت . لە شوێنێکی نیمچە هیشك تاوێکی باش دانیشت . ئینجا دەستی پێکردەوە. بۆنی گەنیوو پیسی گێژی کردبوو . گەیشتە شوێنێك زێرابەکە کون ببوو . سەری خۆی دەرهێنا ، دیتی تەواو لەشار دوور کەوتۆتەوە . ئۆخەیەکی کردو پشتی لە شارکرد . هەر رۆیشت و لە هیچ شوێنێ نەوەستا . بێ ئەوەی گوێ بداتە برسێتی و توێنێتی شەقاوی خێرای دەهاویشت . دەیویست تا زووە بگاتە سنوورو ئاودیو بێ . گەلێ جاران ماندووێتی تەنگی پێهەڵدەچنی .. جگەرەکێشێك دادەنیشت و تێهەڵدەچووە .

لەگەڵ ئەو هەموو ترس و راکەراکەو ماندوو بوونەش ، هەستی

به دڵ فراوانی و حەسانەوە دەکرد . شتێکی خۆش خستووکەی گیانی دەدا نەیدەزانی چیەو لەکۆێ هەڵدەقوڵێ ، بەڵام هەستی دەکرد باری سەرشانی سووکتر بووەو پاداشتێکی چاکی دەسگیر بووە .

بە ئاواتەوە بوو زووترین کات بگاتە جێو بۆ هاورێکانی بگێڕێتەوە .

دوو بەتڵی شەو راشکا . کورەکە هەر بەرێوە بوو . تا دەهات دنیا ساردتر دەبوو . بایەکی وەك گیزانی دەهات و دەم و چاوە ناسك و لاوازەکەی کورەکەی دەزووراندەوە . گوێیەکانی تەزیبوون و نەدەوێرا چیدی دانیشێ ، نەبادا خەو بیباتەوە . دەم نادەم تەماشایەکی ئاسمانی دەکرد . هەورو هێڵ بەری ئاسمانی گرتبوو . ئەستێرەکان بە دەرەوە نەبوون . لەوە دەترسا بباریێ .. هێندەشی نەبرد پرووشکە باران دەستی پێکرد . لەو دەمەوا بیری بۆ ماڵی خۆیان چوو ، تەنیشت باوك و دایك و براکانی ، خواردنی خۆش و بەتام ، نوێنی گەرم و گوڕ .. ئەو گەران و سوورانانەێ کەوتەوە بیر، کە لەگەڵ برادەرەکانی هەموو ئێوارەیەك دەیان کردو لەسوحبەت و پێکەنین نەدەکەوتن. بەڵام لەپڕێکدا، لەنێوان شەوو رۆژێکدا، هەموو شتێکیان لێگۆڕا لە شوێنی خۆیان ، لە. ماڵی خۆیان، لەخانوو بەرەو زەویوزاری خۆیانیان وەدەرنان و تێیان هەڵدان. لەو رۆژە وە هەموو گیانی بۆتە رق و تووڕەیی‌و دەستەکانی بە دوای تۆڵەدا دەگەڕێن . لەو خەیاڵانەدا بوو، چەپکێ رووناکی بەری چاوی گرت . لە شوێنی خۆی حەپەسا.... نەیزانی چ بکاو بۆ کامەلا هەڵبێ .. تازە کار لە کار ترازاو بەداوەوە بوو . پیاو لەکاتی وادا سەری لێدەشێوێ و مەودای بیرکردنەوەی لێ وێك دێتەوە. بەرەو پاش وەرگەراو کەوتە غار .. راوەستە .. نەرۆی . لەگەڵ ئەو دەنگە دەست رێژێکی قایم کرا .

کورەکە کەوت و ترپەیەکی لێوەهات .

کە گەیشتنە سەری لە گیانە لادابوو . لایتەکەیان لەدەم و چاوی دا . دوو سێ دڵۆپ باران لەسەر رووە ئەسمەرو ساردەکەی قەتیس مابوون . نووزەیەکی باریکی لێوە هات و چاوە کاڵەکانی لێك نان .

O

# مـــری

● نزار محمد سعید ●

بشەڤ و رۆژ یێ راپێچایە ، بەرپێکێت وی دگرێداینە ، ئاڤ دراوستیت ئەو ناراوستیت شونێت کالکا وی ل سەرێت وان ریا دخویانە .. چاڤێت وی تم ل سەرێت ریانە .. سەرێت ریا لبەر هندابوینە .. جارنا دێربینێ دهلینیتە بەر وان چاڤێت سۆر : تێهنیێت خەوێ سەرێ هندە سالا .. کاکی تێت .. کی دچیت !! ددلێ خوەدا پڕ جارا دبێژیت :

« خوەزی من بێهنا سەیی‌و چاڤێن گورگی هەبان »

ئەردو ئەسمانێ ل ژێر زێرەڤانیا وی بشەڤ و روژ ، چار چاڤێت هەین ، دنڤیت یێ هشیارو هشیار دبیت یێ نڤستی . هەمی رۆژا لویلیا تڤەنگا خوە کەل دکەت ، چەند گوللەکا دنیشانەکێ وەردکەت .. تڤەنگا خوە دجەربینیت هەکە هات و لێ هلکەت دا یێ بەرهەڤ بیت .

خەنجەرەکا گۆپك زیف یا دبەر شویتکێ‌را .. دوو رەختێن دپشتێ رەنگی کەڤلکێ وان سەرێ هندە سالایە پێڤە نەمایە . رەختاو تڤەنگێ‌و دەبانجێ‌و دێربینێ و خەنجەرا گوپك زیف و چوخکێ دبەر هەر ئێك ژوان رویدانەکێ دئیننە بیرێ .

جارنا دێ بینی چاڤێن وی یێن سۆر دسەری‌را فرە بون .. خون ددەمارێن وی‌دا فویریا .. تان .. خولپێن دارا .. دۆل .. نهال .. کەڤر .. چیا .. جانەوەر .. ئەرد .. ئەسمان .. سها وی ؛ لبەر بونە رەشە زنشکەکێڤە تڤەنك دسەر ملێ خوەدا ئینا .. چرەق .. چرەق فیشەك برە بەر . دبێژن لە پلەپکا تڤەنگێ سەد پاتمانە ، لێ ل با کەسێن هولێ قەت چ سەنگ نینە .

لبن سیبەرا گویزێ فەرشێن ژخوەرا دنیڤا روباری‌دا چێکرین .. پیێن وان یێن ئاڤێدا .. ئاڤ نولا زیڤی‌یە ژوردا دچیتە خارێ .. هەردوو ئالێن ورباری چەمن .. کچکچاپەك خلاس ناکەت .. ل



هەمبەر وان گوندێ ل سەر گرەكی رازایە بخانیكێن بەرێن بازیڤە .. دئێنە پێش چاڤێن مروڤی كو یێ ب ئەسمانیڤە .

هەر چەند زەلاما یا خوە ڤەشەلاندی ، گنجێن خوە ژخوەرا كرینە بالگە ، ئەڤە ژی بەرنامێ وان یێ رۆژانەیە :

پشتی نڤێژا نیڤرو نڤستنە .. پشتی نڤێژا ئێڤاری دامانێیە ، پشتی دامانێ ب هەڤرا بەرەف گوندی دلڤن ، وەختێ فتارێیە ، هەیڤەكا رەبەق ئەڤە كارێ وایە .

ب دامانێڤە دمژولن ، خودانێ تڤەنگێ ژنشكەكێڤە ل هنداڤ سەرێ وان چكلی .. سلاڤ كر .. سەر ئەڤراز چاڤێن خوە هلاڤێتنێ .. سلاڤ ژێ وەرگرتن .. بەژنێن وان دئاڤێدا ول سەر فەرشا راست بون .. دەستێت خوە ل هنداڤ سەرێن خوە بلندكرن .. دەستێن خوە دانە سینگێن خوە .. لەرزكێ لێڤا وان گرت .. نولا بیها دئاڤێدا لەرزین ، «ترسێ بكەنە ئامانێ سفری دێ كون كەت» .. چاڤێن وان ژچاڤێن وی یێن سۆر ڤەنابن .. دبێژن چاڤێن مێركوژا هەمی دەما دسۆرن .. خون ژێ دباریت . ژنكێن وان گوندا زاروێن خوە پێ هاویش دكەن ؛ بنڤن خودانێ تڤەنگێ هاتەوە .. خودانێ تڤەنگێ سەر كرینكە .. پیرا مروڤ خوەرە .. دێ وە خوت .. وەكەتە برمویت و هلكێشیت .. دێ ... دێ ..دێ ..

چاڤێن زەلاما مانە پێڤە .. ژكالكێو هەتا كولاڤ و دەرسوكا مێزەدكەن ؛ ریهێن وی كتەكا مویێن رەش لناڤ یێن سپی ددیارن ، چاڤێن وی یێن سۆر .. كور دوەلێنە هەر وەكی بیبیكا رەش دڤێت خوە ژسپیلكێ پاڤێژیتە دەر .. رەها ناڤچاڤێن وی دێ بێژی كورەمارە .

لەوەندی هشك ل زەندكێن خوە گرێداینە .. سمبێلێن وی یێن بۆق ژبەر دوكێلا جگارا یێن ژەنگاری بوین .

ـ كەرە .... م .. كەرە .... مكە .. ئەزبەنی مادێ ژپێرڤەبی ؟!

ـ نا رونم .. نا رونم .. خوەشە .. هەما من گوت كا هون چ دكەن .. دا سەحكەمە وە .

رێكا خوە گرت و بوهوژتە ناڤ ئاقارێ گوندی ، هزرێ دقاڤ سەرێ ویدا دگوتە هزرێ وێڤە هەرە :

«خنێكێن وە .. نە ل منێ نە ل تەیێ .. من ژی درەگەهی كەسێ نە قوتابا دا ئێرو نولا وە بم .. بستە .. بێ هزرو ترس .. یا رەببی تو ب رەحما خوە ل گەل من بكەی نە ب عەمەلێن من .. بو خاترا ڤێ هەیڤا خێرا .. ژنوی من زانی رح چەندا شرینە» .

★ تەرزەكێ تڤەنگێن بەرێ نە یێن كەڤن ★

لیۆپۆلدۆ ئالاس
وەرگێڕانی لە ئیسپانی یەوە ..حکیم جاسم عبدالله

# ماڵ ئاوا .. مانگا خۆشەویستەکەم

«ئەنتون دیێ چینتە» تێ گەیشتبوو لەوەی کە هەر بە هەژاریو دەردەسەری لە دایك بووە .. لە کاتێکدا لەوەیش بووەوە کە ئەو خەونەی لە دێر زەمانەوە هەیبوو بۆی نایەتەدی ، بەلایەنی کەمەوە بێ بەخاوەنی خانوێك‌و دوو گاجوت . بە هەزار دەردەسەری‌و ئارەق ڕشتن‌و خۆ بێوەری کردن ، گەیشتە ئەوەی گاجوتی یەکەم بەدەست بێنێ ، بەلاّم لەوە زیاترای بۆ بەسەر نەچوو پێش ئەوەی گاجووتی دووەم بکرێت خۆی لە بەردەم توندو تیژی خاوەنی خانووەکەی دابینی یەوە کە زۆری بۆهێنابوو بۆ ئەوەی ئەو کرێ‌یەی دووا کەوتبوو بەزووترین کات بیداتەوە . کابرای خاوەن خانوو ، بێ بەزەیی‌یانە دەی‌ویست ئەو گاجووتەی کە خۆشەویستی‌یەکەی ڕەگ‌و ڕیشالێ لەهەناوی ئەنتۆن‌و منداڵەکانیدا بنج‌بەست کرد بوو ، لە بری کرێ خانووەکە بباتە بازاڕو بیفرۆشێ .

ژنەکەی ئەنتۆن لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا کە گاجووتەکەیان لەماڵی دابوو ئەم دونیایەی بەجێ‌هیشتبوو . تەیمانێکی لە زەلی گەنمەشامی‌و گەلای داری قاوە ، ژووری نوستنەکەی لە تەویلەکە جیادەکردەوە، ژنەکەی ئەنتۆن کە خەمخۆری خیزانەکەبوو هەر لەو جێگە پڕ پەژارەیەدا ئاوزینگی دەداو لەو مەودا شاشەوە کە گەڵا وشکەوە بووەکانی دیوارەکە ڕسکاندبووی لە مانگاکە وورد دەبووەوەو بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەو خێزانە کلۆڵە ڕزگاری دەبێت .

«بیرکردنەوە لەم بارە ناهەمووارەی ئێوە ، تەنها خەم‌و خەفەتە بۆ دەستەبەر کردنی پاروە نانێك» .

مانگاکە بوو بەسەرچاوەی خۆشەویستی ئەو جووتە، کاتێك کە منداڵەکان باوەشیان بەلاملی مانگاکەدا دەکرد وایان دەزانی لە ئامێزی دایکیا دان ، چونکە باوکەکە نەیدەتوانی قەرەبووی ئەو سووزو خۆشەویستی‌یە بکاتەوە کە لەلایەن دایکیانەوە پێ‌یان دەبەخشرا. ڕەنگ‌و ڕواڵەتی مانگاکە لە نێو تەویلەکەو بەسەر دەشتی «سۆمۆنتی»دا ڕەنگی دەدایەوە .

ئەنتۆن زۆر بەنا ئارامی یەوە لەو هەموو شتە گەیشتبوو ، وای بەچاکتر دەزانی کە لەلای منداڵەکانەوە دەربارەی فرۆشتنەکە هیچ نەدرکێنێ . ڕۆژێکی شەممەی ، ڕۆژانی مانگی گەلاوێژ بوو کات دەمەوبەیانی بوو ، ئەنتۆن زۆر بەپەستیەوە لەدەرگاوە هاتە دەرەوەو مانگاکەی دابووە بەرپێ ئەوەی پیرۆزەو زەنگێکی بەملەوە بکا ، بەرەو مەیدانی گاوگۆتال وەرێ کەوت . (پینین‌و ڕۆسا)هێشتا هەر لە ئامێزی خەونێکی شیرین دابوون ، هەموو بەیانیانێك باوکیان بە شولکەدارێکەوە دەچووە وێزەیان‌و لەخەو هەڵێ ئەساندن ، ئەو بەیانی‌یە وەك بەیانی کانی‌تری نەکرد لێ‌یان گەڕا بە ئارەزووی خۆیان چێشتە خەوبکەن . کاتێك کە لە خەو هەستان ، تەویلەیێکی خاڵی بێ مانگایان دی .

(هەبێ‌و نەبێ باوکم بردوویەتی بۆ «بەیتالێ») ، لەمە زیاتر هیچ شتێکی تریان بەمێشکدا نەدەهات . (پینین‌وڕۆسا) وای بۆ دەچون کە مانگاکە لە بارێکی خراپ دایەو ، ئیدی نایەوێت بزێت ، لەبەرئەوەی لەدوای هەموو زاینێك بێ گوێرەکە دەمایەوە ، بێ‌ئەوەی پێ بزانێت چۆن چۆنی‌و لە چ کاتێکدا گوێرەکەکەی دەڕفێنن .

کاتێك کە تاریکی دەواری خۆی هەڵدا ، ئەنتۆن‌و مانگا بۆرەکە گەردی ڕێگاو بانیان لە ڕوونیشتبوو ، زۆر هیلاك‌و ماندوو دیار بوون ، خۆیان کرد بە ژوورا . باوکە هیچ شتێکی لەمەڕ مانگابۆرەوە بۆ منداڵەکان باس نەکرد ، هەر بۆیەش مەترسی‌و ترسناکی لە گەواڵە هەوری بیری منداڵەکان دەبۆوە .

نەی فرۆشتبوو لەبەرئەوەی کەس ئەو نرخەی پێ‌نەدابوو کە لە مێشکی خۆیدا خەملاندبوی ، نرخەکە زۆر زیاتربوو لەو نرخەی شایەنی مانگاکە بێت ، بێ‌گومان زیادەڕۆیی‌یەلە خۆشەویستی ، زۆری لێ داوا دەکرد بۆ ئەوەی زات نەخاتە دڵی کڕیارەکانەوە . ئەوەی کە لێی نزیك دەبۆوە بۆ ئەوەی بەختی خۆی تاقی بکاتەوە هەر زوولێی دەڕەوی‌یەوەو جنێوی دەدا بەو پیاوەی کە بە چاوێکی پڕ لە ڕق‌و قینەوە سەیری ئەوکەسانەی دەکرد کە پێ‌یان لە جەرگی خۆیان دەناو نزیك دەبوونەوە لەو نرخە نەگۆڕەی کابرای کەللە ڕەق بۆی دانابوو . تاهەڵگیرانی بازاڕەکە ئەنتۆن هەر لەو جێ‌یەی

خۆیدا مایەوە ، چاوەڕوانی چارەنوسی دەكرد، «واهەست دەكەن كەمن فرۆشیار نیم .. بەڵام ئەوان خۆیان ئەو نرخە بەمن نادەن كە شایەستەی مانگاكە بێت» ، لە كۆتاییدا ، هەناسەیەكی گەرمی هەڵكێشا ، گەرچی دڵخوشیش نەبوو ، بەڵام بە دڵنەوایی‌یەوە گەڕایەوە ، بەناو ئەو هەراو زەنایەدا ڕێگای گرتەبەر ، كە قوڕەی گاوگۆتاڵ و ، بارەی مەڕو ، كیفەی بەراز سمارتەی دەنگە دەنگی ئەو لادێیی‌یانە دەبوو كە لە ئاوایی یەكانی ئەو دەوروبەرەوە جەڵەبیان لە لەوەڕگا جۆراو جۆرە – كانەوە بۆ فروشتن بەرەو مەیدان هێنابوو ، ئەو پەیوەستی‌یەی كە لە نێوان ئاژەڵەكان‌و خاوەنەكانیان دابوو ، پەیوەستی‌یەكی سەرەتایی بوو .

هێشتا ئەنتۆن لەوەدابوو دەست بەرداری مانگاكەی بێت ، لە دووریانی «ناتاهۆیۆ»دا لووتی بە لووتی كابرایەك هەڵتۆق ، خەڵكی دێیەكانی ئەو ناوچەیەبوو ئەم كابرایە بە درێژایی ئەو ڕۆژە مرخی لە مانگا بۆرە خۆش كرد بوو تا بەهەر نرخێك بێت لە دەستی ئەنتۆنی بكاتەوە ، ئەو نرخەش كە كابرا دانیابوو تەنها چەند قروشێكی كەمتر بوو لەوەی ئەنتۆن داوای دەكرد .

كابرای لادێیی لەوە گەیشتبوو كە ئەنتۆن لە بیركردنەوەدایەو دوو دڵی بەسەری دا زاڵە ، چونكە ناتوانێ سەر پشك بێت لەوەی كە ئایا مانگاكە هەڵبژێرێت یان پارەكە ، ئەنتۆن وەك بەردێكی ڕەق‌و تەق لێ‌هاتبوو .. سەرەنجام گەیشتە ئەوەی پێك بێن‌و دەست لە نێو دەستی‌یەك‌نێن ، لە چەق ڕێیەكەدا ڕاوەستان‌و بواری هاموشۆ كردنیان لە خەڵكەكەیش بڕی .. بەڵام لە دوا ساتی ڕێكی كەوتنەكەدا ، ڕێژەی تەماح بەرزتر بۆوەو پارەیەكی زۆر كەم وەكو درزێك لەیەكی دابڕین ، دەستیان بەدەستی یەكتر بەرداو هەركەسە ڕێگا ی خۆی گرتەبەر . ئەنتۆن ملی ئەو ڕیگایەی گرتەبەر كە بەنێو باخ‌و چەمێكدا دەڕۆیشت تا دەگەیشتەوە ماڵەكەی خۆی

خونچە گوڵەكان هێشتا شكۆفەیان نەدابوو بەری دارەكانیش كڵۆكیان گرتبوو .

(پینین‌و ڕۆسا) لەو ڕوژەوە كە هەستیان كردبوو مانگا بۆرە شتێكی بەسەردێ غایلەیەك بەدڵیاندا هاتبوو ، كاتی نیوەڕۆ وەكیلی خانووەكەی ئەنتۆن پەیدابوو ، زەلامێكی چوارشانەی كەڵەگەت ، دڵ ڕەق‌و تیژ لەگەڵ ئەو كرێچیانەی كرێیان دوا دەخست . هەرچی ئەنتۆنیش بوو مرۆیەك بوو زوڵم‌و زۆرداری پێ‌قووت نەدەچوو ، كاتێك گوێی لە هەڕەشەو گورەشەی وەكیلی خانووەكەی بوو ڕەنگی ڕەش‌دا گەڕا . (پینین‌و ڕۆسا)ش هەر لەو ڕوژەوە كە غایلەیەك بەدڵیاندا هاتبوو ئارامیان لێ بڕابوو .

خاوەن موڵك ئیدی سەبری نەدەكرد .. باشە تەكبیر .. ! ، ئەنتۆن ، ناچار بوو كە مانگا كە بفرۆشێت گەرچی بە نرخێكی زۆر كەمیش بێت ، چونكە دەبووایە كرێكە بدات .. ئەگینا شروشیتاڵی فرێ دەدرێتە دەرەوە .

لە شەممەی داهاتوودا ، پینین لەگەڵ باوكی‌دا كەوتەڕێ ، منداڵەكە بە چاوێكی پڕ لە مەترسی‌یەوە سەیری قەسابەكانی دەكرد كە بریتی بوون لە زاڵم‌و زۆردارانی بازارەكە . مانگا كە بە نرخێكی پڕ بەپێستی خۆی فرۆشرا بە كابرایەكی دەوڵەمەندی «كەستیلیا»یی‌و مۆری خۆیشی بە پێستەی مانگا كە چزان ، هەروەها مانگا كە گەڕایەوە بۆ پشتیرەكەی خۆی لە «پواو» ، ئیدی مانگا كە فرۆشراو بوو بەموڵكی یەكێكی‌تر .. زەنگۆڵەكەی ملی ئاوازێكی خەمناكی دەژەنی ، ئەنتۆن دێ چینتەو پینین ، بەبێ ئەوەی ووڕتەیان لە دەم بێتەدەر ، بە چاوێكی پڕ لە قین‌و خەمەوە بە دووایەوە دەڕۆیشتن ، ڕۆسا ، هەر كە بە مەسەلەی فرۆشتنەكەی زانی باوەشی بەلاملی مانگا كەدا كرد ، ئەویش هەروەك كۆیلەیەك سەری بۆ بەردابۆوە .

ئەنتۆن دێ چینتە ، بە دەروونێكی داهێزراوەوە بیری دەكردەوە : «پیرە .. كەیبانۆی ماڵ بوو ..» «ئەو خۆی ، تەنها بریتی بوو لە مانگایەك .. بەڵام منداڵەكان لەو بەولاوە نەدایكیان هەبوو نە داپیر ..» .

لەو ڕۆژانەدا .. لە لەوەڕگای دەشتە پڕ لە سەوزایی‌یەكەی «سۆمۆنتێ» دا ، كپی‌و بێ دەنگی‌یەكی جەرگ بڕبوو . مانگاكە ، كە بێ‌ئاگابوو لە چارەنووسی خۆی ، لەو دەشتە پان‌و بەرینەدا هەروەكو جاران دەلەوەڕا . هەروەك شتێكی نەمر ، پشوی دەداو تەنها ساتێكیش لە پێش ئەوەی كە دەستێكی دڕندە لە ملی بداو دوا هەناسەی پێ ببڕێت ، دەلەوەڕا .

پینین‌و ڕۆسا ، لە سەر گژوگیای ئەو دەشتە .. بە دەروونێكی داهێزراوەوە پاڵ كەوتبوون .. بەبێ هودەو بەچاوێكی پڕ لە ڕق‌و قینەوە سەیری تەلەكانی كارەباو ، ئەو شەمەندەفەرەیان دەكرد كە تێدەپەڕی . لەو جیهانە پان‌و بەرینە تێ نەدەگەیشتن .

ڕۆژی هەینی ، ڕوژی ماڵ ئاوایی كردن بوو ، لە كاتی خۆر ئاوا بووندا دوا نوێنەری «كەستیلیا» گەیشتەجێ‌و پارەكەی‌دا ، ئەنتۆن‌و نوێنەرەكە ، سەرڕوپێكیان هەڵدا ، ئەنتۆن جامە بادەكەی هەمووی خواردەوە ، سەری گەرم ببوو ، هەروەها قورسایی پارەكەی بەرباخەڵیشی مەست‌تری كرد بوو . دەیویست خۆی سەر خۆش‌و بێ ئاگا بكات . زۆر قسەی دەكردو ، وەسفی مانگاكەی دەكرد . بەڵام ئەوی تر (وەكیلەكە) زەردەخەنەی بەسەر لێوەوە نەدەبڕا . چونكە ووشەكانی ئەنتۆن زۆر نایاب‌و بێ هاوتا بوون .. «چەندین .. چەندین .. سەتڵ شیری دەدا ..؟!» .. «چەند بەهێزو گوێ ڕایەڵ بوو لە كار كردندا ..» .. «ئەڵێی چی .. گەر پاشی چەند ڕوژێكی‌تر بێ بە پاروێكی چەورو بەلەزەت .. ؟!» ، ئەنتۆن نەیدەویست بیر لەوە

بکاتەوە ، گەر بیری لەوەش بکردایەتەوە کەبژێت‌و کاربکات‌و خزمەتی یەکێکی‌تر بکات ، خۆی‌و منداڵەکانی لەبیر دەکات ، بەڵام بەختەوەر دەژیت . پینین‌و رۆسا لەسەر گردی «کوچۆ» هەڵ تروشکا بوون‌و زۆر بەداخەوە بوون بۆ مانگاکە ، دەستیان لە ناو دەستی‌یەك نابوو ، بە چاوێکی پڕ لە قینەوە سەیری ئەو دوژمنە ترسناکەیان دەکرد کە مانگاکەی لە دەست کردبوونەوە . لە دووا ساتی ماڵ ئاوایی‌دا .. بە جۆرێك باوەشیان بە مانگاکەدا کردوو دەستیان کرد بە ماچ کردنی کە بە هیچ شێوەیەك نەدەتوانرا لە یەکتر جودا بکرێنەوە . ئەنتۆن سەرخۆشی‌یەکەی بەری‌دا ، بەهۆش هاتەوەو هەروەك لەشێکی بێ‌گیانی ساردو سڕ دەستەکانی لەیەکتر هەڵپێچاو ، بە دەروازە تاریکەکەدا چووە ژوورێ . منداڵەکان هەر بە دووای مانگاکەوە بوون ، لە لای پەرژینی بەرزی خانووەکەدا ، مانگاکە ، کە لە دۆخێکی خراپدا بوو ، لەگەڵ کەسێکی نەناسراودا لە خانوەکەوە دەرهاتن . لە کۆتایی‌دا هەر دەبووایە لە یەکتر جیا بونایەتەوە .

ئەنتۆن بە دڵێکی تەنگەوە لە خانووەکەوە بانگی منداڵەکانی کرد :

– «بابە .. بابە .. رۆڵەکانم .. ئا ، ئا .. لەگەڵ ئێوەمە ..» «ئەم هیچ‌و پووچی‌یە بەسیەتی» ئا بەم جۆرە .. بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە .. هاواری دەکرد .

شەو داهات ، کووچەو کۆڵان تاریك داهاتن .. گردەکان رەش دا گەران ، ئیدی مانگاکەش هەر بە جارێ لە چاو وون بوو . جگە لە «تین ، تان»ی زەنگۆڵەکەی کە هێدی هێدی دەنگی لێ‌وە دەهات هیچی کەی لێوە بەجێ‌نەما .. هەروەها لەگەڵ دورکەوتنەوەی ، هێواش هێواش دەنگی زەنگۆڵەکەش لە ناو خشپەی مێروو زیك‌و زاکی سیسارکدا دەتوایەوە .

– «بەخوام سپاردی مانگا خۆشەویستەکەم» .. رۆسا بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە دەیگوت – «لە کانگای دڵمەوە بە خوام سپاردی» . بە خوام سپاردی مانگا خۆشەویستەکەم» .. پینین بە هەمان هەڵچونەوە دوو بارەی کردەوە .

– «بەخوام سپاردن» .. زەنگوڵەکەش ، بەهەمان شێوە وەڵامی دانەوە . وورده وورده دەنگە خەماوی‌یەکەی زەنگوڵەکە ، ئاوێتەی قیرەی بۆق‌و هاژەی چەم‌و شنەی شەوێ لە شەوانی مانگی گەلاوێژ بوو .

لە رۆژی دوایی‌دا .. بەیانی‌یەکی زوو بوو ، لە هەمان کاتی رۆژانی‌تردا ، پینین‌و رۆسا بەرەو لەوەڕگای «پراو» لەدەشتی «سۆمۆنتی» وەڕی کەوتن . بەلای منداڵەکانەوە یەکەم جار بوو کە هەست بەو تەنهایی‌یە خەمناکە بکەن .. لەو رۆژەدا لەوەڕگاکە هەروەك بیابانێکی کاکی بەکاکی وابوو ، بەبێ مانگامە .

شەپووری شەمەندەفەرەکە نزیکتر دەبۆوەو دوو کەڵەکەشی وورده وورده بەرچاو کەوت ، پاشان شەمەندەفەرەکەش‌وە دەرکەوت . دوو منداڵەکە ، لە دەلاقەیەکی تەسك‌و بچووکی ژوورێکی شەمەندەفەرەکەدا چاویان بە چەند مانگایەك کەوت کە لە پەنجەرە– کەوە سەریان دەرهێنابوو .

– « ماڵ‌ئاوا مانگا خۆشەویستەکەم» .. رۆسا ، هاواری کرد .. خۆشە – ویستەکەی خۆی بە بیرهاتەوە .

– «بەخوام سپاردی مانگا خۆشەویستەکەم» .. پینین ، بە هەمان سۆزەوە هاواری کرد ، لەو کاتەدا چاوی بریبووە ئەو شەمەندە فەرەی کە لە «کەستیلیا»وە دەهات‌و ئەوەندە تیژڕەو بوو هەر ئەوەندەی نەما بوو جووتێ باڵی لێ‌وە بڕوێ .

کوڕەکە ، کە لە خوشکەکەی زیاتر لە دڵڕەق‌و بێ شەرمی ئەو رۆژگارە گەیشتبوو ، دووبارە هاواری کردەوەو دەستی بەگریانێکی بەکوڵ کرد :

– «دەیبەن بۆ قەسابخانە ، گۆشتی مانگاکە دەبێت بە خواردن بۆ دەرەبەگ‌و قەشەو دەوڵەمەندو خاوەن پارەو پولەکان» .

– « ماڵ‌ئاوا مانگا خۆشەویستەکەم .. !»

– « بە خوام سپاردی مانگا خۆشەویستەکەم .. !»

پینین‌و رۆسا ، زۆر بە رقەوە سەیری ئەو رێ‌و بان‌و ، تەلی کارەباو ، هێماکانی ئەو دنیا نەناسراوەیان دەکرد کە هاوڕێ‌یەکی خۆشەویستی لێ جیاکردبوونەوەو لە تەنهایی‌یەکی ناهەمواردا بە جێ‌ی هێشتبوون ، دووری خستبوونەوە لەو سۆزو هەست‌و نەستە .. بۆ ئەوەی بۆ دەوڵەمەندو چاو چنۆکەکان ، بیکەن بە خۆراکێکی چەورو بەلەزەت .

– «بە خوام سپاردی مانگا خۆشەویستەکەم .. !»

– «ماڵ ئاوا مانگا خۆشەویستەکەم .. !»

چەند ساڵێکی زۆری بەسەر چوو .. پینین بوو بەزەلامێکی تەواوو لە خزمەتی پادشادا کاری دەکردو شەری حیزبی کۆنەپارێز «Carlista»هەڵگیرسا . ئەنتۆن دێ چینتە خزمە تکاری یەکێك لە سەرداره توندوو تیژەکان بوو ، کە تووانای هیچ قەرارێکی نەمابوو کە بۆ پینین بیدات ، کە هەروەکو دار بەڕوێکی لێ‌هاتبوو .

ئێوارەیەکی خەماوی بوو ، رۆسا ، لە کێڵگەی «پراو» دا بە تەنها بوو ، چاوەڕوانی تێپەڕبوونی ئەو شەمەندەفەرەی دەکرد کە لە «خیخۆن»ەوە

دەهاتو ، تاقە خۆشەویستەکەیانی لیٚ‌دا بری‌بوو ، کە ئەویش براکەی بوو ، هەر لە دوورەوە دەرکەوتو هەروەك بروسکەیەك تێپەر بوو .

رۆسا ، هەر ئەوەندەی نەمابوو شەمەندەفەرەکە بیپلیشێنیتەوە ، تەنها بۆ یەك ساتێك توانی لە سیٚ‌یەم فارگۆنەوە کۆمەڵە سەربازێکی بێچارەی بەرچاو بکەویٚت ، کەهەر سەریان بە دیار بوو . هاواریان دەکردوو هەوڵیٚ ئەوەیان دەدا کە زیاتر ببینریٚن ، ماڵ ئاوایی‌یان لە دارو درەختو خاكو خۆڵی ئەو ناوچەیە دەکرد ، کە بەو منداڵی‌یانەوە لیٚ‌یان گەرابوون کە لە شەرێکی برا کوژیدا ، روو بەرووی مردن ببنەوە ، تەنها بۆ مانەوەی پاشاو لە پێناوی ببرو باوەرێك کە تیٚ‌ی نەدەگەیشتن .

پینین کە نیوەی لەشی لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە دەرهێنابوو ، توانی بە حاڵ دەستی بە دەستی خوشکەکەی بگەیێنێتو رۆسایش سەرەرای تەقە تەقی پێچکەکانی شەمەندەفەرەکەو هەرا هەرای سەربازەکان ، توانی گویٚ لە دەنگی براکەی بیٚت کە بە قورگێکی پر لە گریانەوە دەیقیژاند ، هەروەکو چۆن کە رابردوویێکی دووری پر لە خەمی وەبیرهاڵبێنەوە :

– «خودا حافیز رۆسا .. !» ..

– «بە خوام سپاردی پینین ..!» .. «لە کانگای دڵمەوە بە خوام سپاردی .. !»

– «ئەویشیان چوو .. هەروەکو ئەویتر .. هەروەکو مانگا پیرە رۆژگار ئەویشی برد . گۆشتی مانگاکە بۆ دەوڵەمەندو خاوەن پوولەکانە .. گۆشتی سەربازەکانیش بۆ تۆپەکانی ئەم جیهانەیە ، بۆ تەماحی چەند کەسانێکی تر .. !» .

لە نێو بیرکردنەوەیەکی تەماوی پر لە ئازار دا خوشکە داماوەکەی دەستی لە دەستی براکەی بەرنەداو تا ماوەیێکی دوور لەگەڵیا چوو ، شەمەندەفەرەکە دەنگێکی خەماوی لیٚ‌وە بەرز بۆوە ، کە دەنگ دانەوەیەکی کاریگەری هەبوو بە سەردارو درەختو خۆڵو بەردی ئەو ناوچەیەدا .

بە چ تەنهایی‌و بی‌کەسی‌یەك مایەوە .. ! ئا ئێستا .. بەڵیٚ ئائێستا .. کێڵگەی «پراو» هەروەك بیابانێکی چۆڵی بیٚ زیندەوەری لیٚ‌هاتووە .

– «بەخوام سپاردی پینین .. ! ماڵ ئاوا مانگا خۆشەویستەکەم .. !»

رۆسا ، زۆر بە رقەوە سەیری جووتە تووڵی شەمەندەفەرەکەی دەکرد ، کە بە دووکەڵێکی خۆڵەمێشی چڵکن ببوو ، زۆر بە توورەیی‌یەوە سەیری تەلی تەلەفۆنەکانی دەکرد .. ! .

هیٚ ی .. هیٚ ی .. مانگاکە چاکی کرد کە دوورکەوتەوە . ئائەمە بوو ئەو دوونیایەی کە لیٚی نەدەگەیشتو ، لە هەموو کەسێکی کرد ، بەبیٚ ئەوەی هیچ بیرێکیش لیٚ‌بکاتەوە ، لە گۆشەیێکی دەشتی «سۆمۆنتی»دا رۆسا ، سەری شۆر کرد بووەوە بۆ سەر ئەو دارەی کە لە دەستی‌دا بوو ، کە هەروەك ئاڵایەك ئەهاتە بەرچاو .

رەشەباکە لە نێوان دارە سنۆبەرە ووشك بووەکانەوە گۆرانی‌یەکی میتاڵی دەووت ، ئائێستا رۆسا لەو گۆرانی‌یە دەگەیشت ، کە گۆرانی فرمێسكو جیابوونەوەو تەنهایی‌و مردنە .

بەدەنگ دانەوەیەکی یەك لە دووای یەکدا .. کە وەك سەدایەك وابوو ، وای هەست دەکرد کە زۆر لە دوورەوە لە ریٚ‌یەکەی بەرامبەرەوە ، گویٚ لە دەنگێکی پر لە گریان دەبیٚت :

– «خودا حافیز رۆسا .. !» .

– «ماڵ ئاوا مانگا خۆشەویستەکەم .. !» .

**کۆتایی**

* * * *

**نووسەری ئەم چیرۆکە لە چەند دێرێکدا** :

– لیۆبۆلدۆ ئالاس «کلارین» Leopldo Alas, Clarin

– ساڵی ١٨٥٢ لە «ئامۆرە» لە دایك‌بوو ،

– لە ساڵی ١٩٠١ ، کۆچی دووایی کردووە

– شایانی باسە کە نووسەر رەخنەگرێکی بە ناو بانگی سەردەمەکەی خۆیشی بووە جگە لەوەی رۆمان نووسێکی لیٚ‌هاتوو بلیمەت بووە .

– ئەمە جگە لە کورتە چیرۆکەکانی کە دەتوانین بڵێین گەورەترین بەش لە کارە ئەدەبی‌یەکانی دەگرێتەوە .

لە شاکارەکانی :–

ئەم چیرۆکەو «پیپا» Pipa و «بێرتەخان – Dona Berta»

– هەروەها «شازادە – La Regenta» کە یەکێکە لە رۆمانە هەرە بەناوبانگەکانی .

* ئەم چیرۆکە لەم کتێبە وەرگیراوە :

Adios Cordera

Obras Selectas be Leopoldo Alas Clarin

Madred 1947



ئیبراهیم احمد سموّ

# دەقی شانوویو کوّمیّدیاتی ئەرستوّڤانیس

پیّشەکی :
شانـوگـەری ئەدەبە ئارمانج ژیّ زارڤەکرنە ، یاخوّد نواندنە ، شانوگەری چیروکەکە تائیّتە نڤیساندن بەس دا ببیت خواندن ، بەلکو چیروّکەکە ژ بو زارڤەکرنیّ یە «١» .
شانوّگەری گوتنەکە رامان ژیّ بزاڤە «٢» .
شانوگەری قوتابخاناٌ ژان و کەنیّیە (٣) شانوّگەری دئیّت ب رامانا شانوّگەریا دئیّت پیّش کیّش کرن بوّ بینەرا لسەر دەپیّ شانوویّ . ژ بو پیّناسەکرنا شانوویّ ، گەر ئەم پەرتوکیّد کەڤن و نوی ب قولپینن دیّ گەلەك رەنگیّـد پیّناسەکردنیّد شانوویّ کەڤنە بەرچاڤیّد مە ، هەر وەکیٌ ئەم دزانن کو هەر شانوڤانەك ، یاخوّد هەر نڤیسەرەکیّ شانووی و گەلەك روّشنبیر وەکی خوە دشانوویّ دگەهن ، هندەك دبیّژن : «شانو جیهانەکا مەزنە هەر ئیّك ژ مە دەوریّ خوە دکەت و دەوریّد دیتر بوّ ئەڤیّد پشت خوە دهیّلت» و هندەك دبیّژن : (ئەز خوە ب شانوویّ دیناسم) .
ئانکـو ئەز دژیم و هەست ب ژیـانیّ دکەم دەمیّ ئەز کارەکیّ شانوویّ دکەم .
و هنـدەك دبیّـژن : (شانوّ ئاهەنگەکا مەزنە بینەرو زارڤەکەر پشکداریّ تیّدا دکەن ) «٤» . لڤیّ چەندیّ ئەم دشیّن بیّژن چ پیّناسیّد زانستی نەهاتینە کرن کو ببت بنگەهو ئەم لسەر بچن ، ئەرستوّ پیّناسەك دا شانوکەریّ ژ (لاسایا سروشتی) وگرنگی دا هەرسیّ بنگەهیّد پیّتڤی چەهـ
دەم ، جە رویدان ، پشتی وی و لگەل پیّش کەڤتنا جییهانیّ

ئەڤ پیّنـاسـە بهـایێ ویّ کیّم بو نەخـاسمە لدەمیّ «برتولد بریّخت» دەمیّ هاتیو پەحیینەك ل بیریّد «ئەرستوّ» دا و دەور گەلەك دا بینـەری ، ئانکـو شانو وەکا توخمی (تغریب) تیّدا پەیداکر ب عەکسی ئەرستوّ کە گرنگی دا توخمیّ پاککردنیّ .
ئەڤـەو مە یاخـوّد من دڤیّ بیّـژم : ئەرستوّ ستانسلافسکی ، بریّخت ، لورکـا ، چیخـوّف ، یوسف العانی ، قاسم محمد ، ئەحمەد سالار .
هەریەکی ژ ڤانە رایا خوە یا هەی دەربارا شانوویّ وەکی خوە و روشنبیراخوە دشانوویّ دگەهن لڤیّرێ بسیارەك خوە دیار دکەت : ئەریّ چەوا هەر وەکی خوە دشانوویّ دگەهن ... هندەك تشت ژ ڤان دکیّمن دەمیّ دچنە سەر دەپیّ شانوویّ یاخود شانوگەریا دنڤیسن .
هەست دکەن چ کیّماسی نەمان لدەڤ ، چنکی دەمیّ دچنە سەر دەپیّ شانـوویّ وان کیّماسیا دکەنە دیمەنیّد شانوّگەریا خوە (مەبەست نڤیسەرو ئەکتەر) ئەڤا پیّ رابوی و دەمیّ خوە دبینن ل پیّش چاڤیّـد بینـەرا هەست دکەتٌ چ کیّماسی نەمان ، وان کیّماسیا نیشانی بینەرا دەت و شونی بینەر هەست ب کیّماسیّد خوە دکەت .
مەرج نیە ئەکتەر بزانت کەنگی (اسخیلوس) بویە ، یان بزانت بابیّ (ارستوڤانیشی) خەلکیّ ئەسینا نەبو ، یان شکسپیر کەنگی مریە ، ئان مولیّر کوریّ کیّیە ، یان ستانسلافسکی ل موسکو چ خادن دخوار ، یانٌ (ئەحمەد سالار) کوردیّ ماردنییّە یان

دهـوكێ يه ، مەرج ئەوه روٚشنبیر یاخود ب تایبەتی کارکەرێ شانوویێ بزانت بیرێد ڤان کەسا خزمەتکارێد شانودا جیهانی چ بوون ، کیش بیر (جوانیا دەرونی نەروخساری) و لگەل واقعیێ ئەڤـروٚ دگونجن و لگەل مروٚڤایەتیێ ، مەرجێد شانوویێ ژ مە دڤێت چنــه ؟ ب تایبــەتی ئەڤیی خوه بکێشتــه سەر دەپێ شانوویێ پێدڤی‌یه بزانت مەرجێد بنچینەیی ، ژ رێزا خوه بزانت (شانوٚ) جهەکێ پیروٚزەو هەر ژ بەر دەرگەهێ هوٚلێ هەتا سەر دەپێ شانوویێ ب تایبەتی دەپێ شانووی «٥» . کادێ چەوا وەکەت کو هەمی ژێ رازی بن ئانکو کوٚمەلێ مەبەست بینەر .

## دەقێ شانوویێ :

لپێشێ دەق بو (مـەبەست نەدیروکا شانوویێ) بزاڤا شانوویێ دەست پێ دکـر ب هاریکاریا چەند توخمێد سانەوی دەق + دەرهێنان + زارڤەکرن + دیکور + .... هتد ئەڤ توخمێد هەنێ گەلەك ژێـك جودانــه ، بەلێ ئارمانجه هونەریەکه ئەوه کو ئێك خزمەت دکەن ئەوپێکڤـەگرێداینه گرێدانەکا (میکانیکی) و بزاڤا شانــووی توانــایێد هندێ بێد هەین ژ بوٚ کارتێکردنا واقعی ، واقعێ هونەری و ئەدەبی ب تایبەتی و کومەلایەتی ب گشتی ، بڤێ چەندێ خوه دکەته وێنەکردن ژ بوٚ دیاردێد شارستانیێ ، شانوٚ بیٚی ڤی تووخمی نابت و نەبویه ، ئانکو رابونا مروٚڤی ل هەر کارەکێ هونەری ئەوه کو هزرەکه دڤێت پێش چاڤ کەت ئەو هزره ئەم دبێژنێ (دەق) .

شانوٚ وەك مروٚڤی گەر دانن دێ دل دەق بت ، ئەڤ ئەندامێد دیێتر توخمێد شانوٚیی بن .

گەر ئەم پەرتوکێد کەڤن ڤەدەمن ، ئانکو دیروکا دراماێ ، دێ بوٚ مە دیاربت کو (تیسپیس) شعرێد خوه ئێد (حماسی) دنڤیسن سرودێد (دیثرامبوس) ی دەر دهێنان و راهێنان ب تیپا خوه دکر ، هەروەســا هونــەرێ ئاخڤتنێ (الالقــاء) و (تمثیل) دانان و دەرکەڤتن ب عارەبانا خو ژ بوٚ پێش کێش کرنا کارێد خوه ئێد هونــەری ، پشتی هاتــن بابێــد (إباء) درامایێ (اسخیلوس) (سوڤکلیس) (یوربیدس) (ئەرستوٚڤان) .

دراما نڤیسین و دەرهێنان لڤێ چەندێ دیروکا دەقێ (دەقێد) شانوویێ دگەرتا دیاربونا ڤان نڤیسەر سەرێ مە گوتین . ئەم لڤێرێ گەهنه ( بەدیهیەکێ ) کو ئەم نەشێن کارەکی شانووی بکەن ژبلی ئەم بیرەکێ بو نەدانن ، ئانکو وی کاری بیر نەبت هەروەکی مە لســەرێ گوتی دێ چەوا شانو هەبت ژ دەست پێکرنــا گرێیەکا سەرەکی (عقدة رئیسیة) ، سیناریو دان و ستاندن کو بیته (محوره) بو ژارڤەکرنێ و دانوستاندنێ . دەق دشـانوویێ دا بنگەهەکا سەرەکیەو هەروەها هاڤلیەك (علاقه) دناڤ بەرا دانەری و دەرهێنەری دایه ، ئەو هاڤلیه (طردی) یه ، ئانکو لگەل ئێك دچنن ئەگەر هاتت و پێنگاڤێد دانەری دجهێ خودابن دێ رێك پتر ڤەبت بو دەرهێنەری کو پێ سەرکەفتی بت بەرێ تیپێـد شانووی دەڤێد خوٚمالی هەبوون و دزانین کادێ دەرهێنان کی بت .

ئەرێ نڤیســـەرێ شانــوویێ چێـدبت بێ دووروبت ژ دەپێ شانوویێ ، ئانکو ڤەلەمێ وی دێ گرت و دارا وی دێ گەهت ژ دەرڤەی دەپێ شانوویێ ؟؟ بونا نڤیسەرێ شانوویێ نەیا بئاسانه ئەگەر پەیدابت ، ئەڤە مە دگەهینته هندێ کو دەق دله ، کاکلا شانوێ یە ئەم نەشێن شانووا خوه بسەر بێخن بێ ی ئەم دەست پێ نەکەین ژ دەقێن بەرکەڤتی و کاریگەر ئانکو دێ زڤرینه هندێ کو جهێ دەقی د شانــوویێ دا ، وەکی جهێ دلێــه د لەشێ مروٚڤی‌دا .

وئەگەر دل نەما ، مروٚڤ نامینت ، گەر دەق نەما ، شانوٚ نەمـا ،

چنکی شانوٚ بیره ڤینه خوینه ژینه و چ ئەو بیره تەراژیدی بت ، یان کوٚمیدی بت ، یاخود تێکەلاو بت (تراژیدیاو کوٚمیدیا) بت یا گرنگ هەر شانوٚگەریەك ژ بیرەکێ دەردکەفت و دەست پێدکەت ، چ ئەو بیره چارەسەریێ گرفتاریێد کوٚمەلایەتی یان ئابووری ، دیروکی ... بکەن یان نەکەن ژبلی وان دەڤێد خزمەتا مروٚڤایەتیێ نەکەن وەکی وان مروٚڤێد ب دل ، بەلێ وی دلی ب کارئینن بوٚ ئێشاندنا لەشی نه ژبوٚ خوٚشیا لەشی ... گرنگیا دەقی دێ پتر دیاربت گەر هات و دەق هاتە زارڤەکرن .

نڤیسەرێ شانوویێ پێدڤیه دانته پێش چاڤێد خوه ، ئاگاه ژ ڤان توخما هەبت شێواز ، زمان ، پەیڤ ، رستێد دان و ستاندنێ ، چنکی هنــدی شێــوازا : هاڤلییــه دنــاڤ بەرا نڤیســەری وبینەری‌یه . وزمان ژ ساخلەتێد بەرزەنە د کارێ شانوویێ‌دا . پەیڤ (محور)ێ هونەری شانوٚوێنه ، و رسته دئێت نڤین دا بێت گوتن نه دا بێت خودان ، لڤێرێ خالەکا هەی بەشداره د نڤیینــا دان و ستاندنێ و زارڤەکەری ئەوه گەر رستێد دان و ستاندنێ نه د پاقژ بن ئەکتەر نەشێت ب دروستی بێژت دێ بته جهێ نەرازیبونا بینەرا ژ کارێ هونەری . نڤیسەرێ شانوویێ ژ هەمی هەڤــالێــد خوه ئێد دیتر وێنەگر ـ پەیکەر تاش ... هتد چێتره ژ

بەر گەر پەیــدا بوونــا رەنگــا و تشتێد دیتر ئەڤێد پێدڤی ببن ئالوٚزیەك ل دەڤ وێنەگری ئەڤە ناچێبت ل دەڤ نڤیسەرێ شانوویێ چنکی نڤیسەر پێدڤیێ خامەی و چەند پەرانه . نموونه بوٚ وان نڤیسەرێد کارێ وان هەتا نهوٚ ببهانه ژ بەر چنکی دەڤێد وان ئەڤروٚژی وه سوبەهایژی دژین و نامرن نڤیسەرێ گریکی ئەرستــوٚڤــانیسێ کوٚمیــدی یەك ژ وانــەیــه و ژبەر خزمەتا ڤی نڤیسەری کری بوٚ پێش کەفتنا شانووا جیهانی ب شێوەیەکی

گشتی و شانویا گریکی ب تایبەتی ، ئەڤ جا من پێخوشە خوە بکێشمە ناڤ ژیانا ئەرستوڤانیسی و دیارکرنا بیرا ئەرستوڤانیسی کە پەیوەندییەکا موکوم یا هەی ب توخمێ دەقی شانووی و بەری ئەم بێن دەورێ نڤیسەرێ گریکی دیارکەن پێدڤیە ئەم چەند تیروشکا بەردەبینە دەست پێکرنا شانوویێ ، کە ئەوە گەلەک بیرورا دچنە هندێ کو شانو ل (وادی الرافدین) و (وادی النیل) دەست پێکریە و بەلگە بو ڤێ چەندێ ددانن ئەفسانا (طوفان) ... (٦) هەمی نڤیسەرێن درامایێ دبێژن بن و بنکارا درامایێ ژ ئەفسانەو داستانا هاتیە هەییێ ، سومەریا ، ئەکەدیا ، بابلییا ئەفسانە دزانین و بکار دئینان د کارێ هونەرێ دا وەک :

١ ـ ئەفسانە پەیدابونا بابلیا .

٢ ـ ئەفسانە خودێیو بناڤ و دەنگ ترین ئەفسانە ئەفسانا

١ ـ داستانا گلگامش . ٢ ـ گلگامش و « اکا » .

٣ ـ گلگامش ئەردێ ژینێ « ارض الحیاة » .

٤ ـ موغامەراتێت گلگامش و هەڤالێ وی ئەنکیدو .

٥ ـ چیروکا بالندەی « رو » ٦ ـ سەرکەڤتنا (ایتانا) بو ئەسمانی

٧ ـ چیروکا ئادابا . ٨ ـ چیروکا سرجون الاکدی .

٩ ـ چیروکا نرام ـ سن .

ماموستا (فائق الحکیم) د کتێبا خوەدا دبێژت عیراقێد کەڤن چیروک ئەفسانە ب تنێ ب کار نەد ئینان بەلکو بیرو رایێد کەتواری ل (بیت الحکمة) ددیار دکرن ژوان بیرا .

١ ـ چیروکا ئەیوبێ بابلی .

٢ ـ دان و ستاندن د ناڤ بەدا سەیدو بەندێ سەیدی ، پەیڤتن لسەر شانوویێ هنگینە .

ڤینە ـ ژینە ـ خوینە ـ برینە ـ ئەم دێ خالەکا گرنگ داینە بەر چاڤێن ئەدیب و ئەدەب دوستا ئەوکو شانووا کوردی ب رایا من دگەرتە جەژنا نەڤروزێ هەرچەندە گەلەک گەل نەڤروزێ خوە دکێشت مادەم کورد ئێک ژوانا کو نەڤروز دناڤ خوینا وادا دگەرت ڤە نەڤروز یا مەیەو شانووا مە لنەڤروزا مە دەست پێ دکەت گەر گریکیا ژ راوەستیانا خوە بەرامبەر دوو خودیا دانان دەست پێکرنا شانوویێ ، کە ئەو خودیە (یونوسوس) و (ئەپولو) بوون .

بوچی نەڤروز نابت دەست پێکرنا شانووا کوردی بێ بەرامبەر خودیەکی (جامد) راوستن ، بەلکو بەرامبەر ئازادیێ سەربەستی بەرامبەر روژا کوشتنا ئەژدە هاکی ب دەستێ (کاوەی) بەلێ کاوەی .

ئەڤ چیروکا ئەڤرو پیرو جوان کورو کچ بو خوە دکەنە سرودو سترانا پێ دبێژن نەخاسمە دەمێ شاعیرێ کورد پیرەمێرد دەورەکێ گرنگ ئێخستە نەڤروزێ و (طابعەکێ)میللی دایێ «٧» ئەفسانێد کوردی مشە رەوشتێد درامایی تێدا دناشکرا نەخاسمە داستانێن کوردی «داستانا خەج و سیامەند) و «مەم و زینی» .

گریکی ل وەرزێ بەهارێ ، کورد ـ نەڤروز ـ ل وەرزێ بەهارێ .

ب رایا من هەمی ئەفسانە شانوگەرێد پر تراژیدینە هەمی رەوشتید شانووی تێدانە ژ کار (الفسل) و (حوبکە) نەخاسمە حوبکا گرێدای (الحبکە المرتبطة) ئەم هەمی نەشێن راوستن لبەرامبەر گریکیاو راستیا پەیدا بونا درامایی بەرزەکەین لدەڤ وان و ئەگەرا ڤێ چەندێ پەیدابونا سێ نڤیسەرێد تراژیدی و یەکێ کومییدی ، (ئەرستوڤانیس) و بەرێ خوە باڤێژنە سەر بون و کارێ ئەرستوڤانی کری ژ بو خزمەتا شانوا گریکی د کار تێکرنا کارێت ((شانوگەرێد) وی لسەر خەلکی هەر ل وی دەمی وڤی دەمی دژین کو دەڤێد وی ب وێ هێزێ یێد ماین پێدڤیە ئەم بچنە سەر بنکارا پەیڤ دراماو پەیدابونا تراژیدیاو کومێدیا .

دراما گریکی بنکار دگەرتە ژێدەرەکێ ئەو ژێدەرە ژی (طقوسێد) ئاینینە ئەڤێد ب تایبەت ب خودێ (ریونوسوس) ئەڤ ژێدەرە دبت دو چەق : ئێک : ژێدەرێ مەرگەساتا (الماساة) یاخودد تراژیدیا و ئەڤەژی دگەرتە طقوسێد ئاینی ئەڤێد چارەسەریا ژیان و مرنێ دکر : دو : ژێدەرێ بەزمەساتی (کومێدیا) کە ئەڤە ژی چارەسەریا بابەتەکی دیتر دکر ئەوژی (الخصوبةوالتناسل) بو .

پەیڤا تراژیدیا ماناوێ دگەرتە سترانا بزنا «٨» هەمی رەخنەگەر دچنە هندێ یاکو ئەرستو چویێ کو دبێژت : «بنچینەیا تەراژیدیا دزڤرتە (دیثرامبوس) ی کە جورە سەمایەکا گورانیە ب هاریکایا کورسێ و بولولێ دهێت کرن .

ئەڤ کەسێن د کورسیدا جلکێن بزنا ل خوە دکرن لڤێری ناڤ لێهات دانان و گوتنێ (تراجودوس) و ستران بێژی و گوتنێ .

(ترلجودیا) کە ڤەژی بنچینەیا پەیڤا تەراژیدیایە . پەیڤا کومێدیا ، دەمی گریکی رادبون و دگرێدا کەیف و سەما ب تایبەت جەژنەک هەبون دگوتنێ جەژنا شەیتانی و دڤێ جەژنێ دا هەمیا پشکداری دکر تێدا (مەبەست داوەت) ئەڤەو ئەڤ ئاهەنگێد بڤی رەنگی دگوتنێ (کودوس) و ئەڤ کەسێن بڤی کاری رابون جلکێن رەنگاو رەنگ ل بەر خوە دکرن دگوتنێ (گومێدین) بڤی جورێ ژ (کوموس) و (کومێدین) کومێدیا وەکی زارڤەکی درامای پەیدابو .

ویا ژ هەژی بێژن کو ئەڤ رەنگە هونەرە ب شێوەکی (ارتجالی)

بو (٩) .
ئانكو ژبەر دهاتە گوتن و كراسێ دراما ئەڤرو ل بەر خوە كر ؟
دەمێ ئەكتەرەك پەیدا بوكە ئەو ژی «تیپیس» (١٠) .
بو ، و پشتی دانوستاندن د ناڤ بەرا دوا ئەسخیلوس دیاركری
و سێ یا (سوڤسكلس) ی پەیداكری .
دەورێ جوقێ گەلەك كێم بوو هەر بو ڤێ چەندێ نیكول دبێژت
(پشتی دانـوستـاندن دناڤ بەرا رێڤە بەرێ جوقێ وە
جوقێ پەیـدابـوی دەورێ جوقێ كێم بو لگـەل پێش كەڤتنـا
دانوستاندنێ
ئەڤە چەندەك بو :دەربارا دراما گرنكی و پەیدا بونا دو زاراڤێن
هونەری كە شانوێی دكەنە دوو پشك ، ئێك : تەراژیدیا ، دوو
كومیدیا .
و نهوژی ئەم دێ لسەر ناڤ و دەنگترین شانوڤانی گریكی یێ
كومیدی نڤیس بپە یڤن ئەڤێ كومێدێن وی هەمی ب ئارمانج
ئەوژی ( ئەرستوڤاینی) ی « كودی» یە «١٢» . ئەڤێ دناڤ بەرا
(٤٤٤ـ ٣٨٠) پ ـ ز پەیدا بوی ، مەزنترین شاعیرێن گریكیا
بێد « هەزەل» بول ( ئەسینا) بویە ئەرستوڤان مروڤێكی خوە
پارێز بوو رەنگە ئەڤ چەندە یادیارە دشانوگەریا ویدا « بوقەكان
» دا دەمێ ( دانوستاندنێ ) دناڤ بەرا دو نڤیسەرێد تراژیدی
نڤـیس (ئـەسـخـیلوس) و (یـورسیـدس) دكـەت و چەوا
(دیونوسوس) ێ خودی دڤێت ژ ئاسمانی بێتە جیهانا دتیر و
چەوا وەدكەت كو (دیونوسوس) پشتەڤانیا (ئەسخیلوس) دكەت
دبێژت و «یورسیدس» مێشكێ گەنجا تێك ڤەرەت .
بارا پیتر ژ كارێن ئەرستوڤانیس ، دەست پێ دكەت ژ دەست
پێكرنـا شەرێ (البلولونیـزیە) دسالا ٤٣١ ـ ٤٠٤ پ . ز .
ئەرستوڤاینس (٤٤) شانوگەری نڤیسینە یازدە ژێ گەهشتینەمە

١ ـ ئەخابنیەكان ٤٢٦ پ ـ ز ٦ ـ بالندەكان ٤١٤ پ ـ ز
٢ ـ الفرسان ٤٢٤ پ ـ ز ٧ ـ داد گەهاژنكا ٤١٢ پ ـ ز
٣ ـ هەورەكان ٤٢٣ پ ـ ز ٨ ـ لیزستراتا ٤١١ پ ـ ز
٤ ـ ئاشتی ٤٢٢ پ ـ ز ٩ ـ بوقەكان ٤٠٥ پ ـ ز
٥ ـ زركێتكەكان ٤٢٢ پ ـ ز

ئەڤێ شانوگەرێ خەلاتی ئێكێ وەرگرت دە ئاهەنگێد هاتنە پێش
كێش كرن ئەڤێد دگوتنێ اللینایا ٤٠٥ پ ـ ز .
١٠ ـ بەرلەمانی ژنكا ٣٩٢ پ ـ ز
١١ ـ بلوبیوس یاخود پارە ٣٨٨ پ ـ ز «١٣»
دیـار بونـا كارێن ئەرستوڤانی دگەرتە بو مسرێن كەڤن دەمێ
فەتیرا زانستیێ پاش ڤەمایی لدوماهیا چەرخی پێنجێ پ ـ زو
هێرشا ئەسكەندەری .
بو ئەگـەرێ هندێ كو گریكی ژ باژێرن خوە مشەخت بن ـ و
گەلەك ل مسرێ راوستیان .
لڤێرێ گەلەك زمان پەیدا بون وەرگێران زێدەبوو بو ل مسرێ
نەخاسمە كارێن ئەرستوڤانی و دبێژت بطلیموس دویێ گەلەك
گرنگیدا ئەدەبی نەخاسمە كومێدیایێ «١٤» .

شانوگەریا ئەم لدەڤ راوستن «بوقەكان» ن .
نڤیسـەر دڤێ شانـوگـەرێی بو دو «مسـافـرا» دیار دكەت و
راوەستیان لبەرامبەر مالا (هرقل)ی ئەوژی دیولوسوس و بەندێ
لساتشیاس كو هاتین بسیارا هرقل دكەت رێكی نیشا وان بدەت
كا چەوا دێ ئێتە جیهانا بنی ، هرقل بكورترین رێك نیشا وان
دەت .
هرقل : دێ بكیش رێكیێ چی ؟
دیونوسوس : رێكا تو لێ چوی
هرقل : رێكەكا گەلەك زەحمەتە یا خەتەرە .
چنكی تو دێ چیە دەریایەكا مەزن و كویر
دیونوسوس : دێ چەوا بورم ؟
هرقل : دێ پیرەمێرەك مەزن تە دەربازكەت .
هوسـا هەتـا دیونوسوس دگەهتە جیهانا دویێ و دبیت شەرە
دناڤ بەرا (یوربیدیس و ئەسخیلوس)ی پشتی دانوستاندنەكا
درێژ پشتەڤانیا ئەسخیلوسی دهێتەكرن و ژبو چنكی بیروراییت
ئەسـخـیلوسی دگـەل واقعێ ئەسینـا دگـونجن ، چێـدبت
ئەرستـوڤانی ئەڤە دیار كربت چنكی ئەو بخوژی گەلەك رێزا
دینی دكر و خوە تێكەل نەدەكرا
شانوگەرێن گریكی (ئەرستوڤانیس) ئەڤ رەخنا هەنێ تێدا
ئاشكرایە

١ ـ رەخنا رامیاری (دژی كلیون) ی
٢ ـ رەخنا قارەمانیێ (دژی تەكیمیوس)
٣ ـ رەخنا كومەلایەتی (دژی پیرا ، دژی گەنجا)
٤ ـ رەخنا ئایینی دژی (هرمز)
٥ ـ رەخنا فەلسەڤی (دژی سوكرات) (هەورەكان) بو نموونە .
٦ ـ رەخنا ئەدەبی و هونەری (دژی یورسیدس) ی (١٦) .

«بـالنـدەكان» دیار كرنا رەخ و روێد گریكیا ژ لایێ ئابوری ـ
رامیـاری فەلسـەڤی ـ كومـەلایـەتی راوستیـان دژی حاكمی
رامیاری ، گەلێ گریكی گەلەك ئەرستوڤان دڤیا گەهشتە هندێ
كو (كلیـون) حاكمی (ئـەسینا) نەدازیبونا خوە دیار كەت ب

شێـودکی ئاشکـەرا . و سەرکـەڤتنـا کارێن کومێدی دگەرتە دیموقراتیا رژێما ژی سەردەمی لدەست پێکرنا چەرخی پێنجێ هەتـا نیڤـا چەرخی گەلەك نڤیسـەرێد کومێدی دیار بوبون و هەڤپشکی د ئاهـەنگێد دیـونـوسوس دکرن و گەلەك خەلات وەرگرتن ژوانە . ماجنیس ـ کرانیوس ـ یویولوس ـ مزنیموس بەلێ بەداخـەوە کارێن ڤان نەگـەهشتە مە کو ئەم ئاورێك لە بەرهەمێد وان بدەن[11] .

خەبـاتـا ئەرستـوڤـان کاردکی گەلەك کر کو کومێـدیـا جهەکی یە ژ بگریت و بگەهتە ترائژیدیا ئەڤەژی دگەرتە گرنگیا ئەرستوڤانی بو کێروکرفتێن میللی ـ و هەڤرکیا وی یا بەردەوام بو باشیا گەلێ گریکی . ئارمانجا سەردکی یا ئەرستوڤانی دانایە بیش چاڤێن خود ئەو زدحمدان ژبو باشترین مروڤ ژبو کە چەوا مروڤ دێ پێ باش بت بو گەلێ خود چەوا دێ پێ باش بت بو میللەتێ خود ، ئەڤ بیرە محودرێ کارێن ئەرستوڤانی بون[18] .
و دانا ئارمانجا سەردکی بو کارێن خود د ڤێ چەندێ دیار دکەت دەمێ دبێـژت : «ئەم نڤیسـەرێد کومیدیا دشێن بیرێن خوە ب باشتر دەربرن ژ نڤیسـەرێد ترائژیدی ژ لایێ بابەتی »[19] .
لڤـیرێ ئەرستـوڤان بهایێ کومیدیا گەلەك بەرزکریەو وجاران ژتـرائژیـدیـا بەرزتـر کریـە . راستـە گەر مروڤ بدروستی د کومێدیایی بگەهت ب دروستی ب کاربینت ئەوەکی کومێدیا یا ئەڤـرو ئەم دبینیت و یا گەلەك دویـر ژ بابەتێن باش : ژ لایێ رامیـاری ، هەلوێستـا شاعیری یا دیار بوو خەباتا وی دژی کلیـون و راوستیـانـا وی دژی [illegible] (فئـانتێت) دژی ڤێ دیموقراتی راوەست[illegible]ان (دیمەق[illegible] [illegible]) چێدبت ئەڤە بگەرتە ژیانائەرستوڤانی و [illegible] [illegible] [illegible] ئەر[illegible]ستوڤانی[20]

[illegible] بابیـەت [illegible] [illegible] [illegible] [illegible] بو ربو [illegible]دست نیشان کرنـا زوردارێ [illegible] [illegible]دو راستگـویا ژبو دیار کرنا ئاڤاو دیارکرنا رەخنا هەرەشاندنێ ـ کەوەرگرتێن ژ کاودان و خەلەتێد ئەڤینا تێدا ژیای .

**پەراوێز :**

١ـ بروانـە کتێبی (دراسـات في النقـد المسرحی) الاستـاذ محمـدزکی العشماوی لاپەرە ٩ـ٣٠ .

٢ـ بروانە کتێبی (عن اللغه والادب) رؤية تاريخية ،ورؤية فنية. د . محمد احمد لاپەرە ١٨٧ .

٣ـ بروانە کتێبی لورکا مجموعة مقالات نقدية ،اعداد مانويل دوران، ترجمة عناد غزوان ، جعفر صادق .

٤ـ رۆژنـامـەی (الجمهـوریـة)،بێ ژمـارە ،چـاڤ پێکـەتنـەك دگـەل هونەرمەند قاسم محمد .

٥ـ رۆژنامەی (الجمهورية) (شخصيات مسرحية) بهنام ميخائيل ، بێ ژمارە .

٦ـ بروانـە کتێبی (تـاريـخ المسرح) فائق الحكيم ، جامعـة بغـداد ، ١٩٧٩ لاپەرە ٦ .

٧ـ ژ محـازەرەی مامـوستا عزالدين مصطفى رسول ، سالا ١٩٨٧ ـ ١٩٨٨ . کولیجی ئاداب .

٨ـ بروانە کتێبی (الشعر و الفنون) ، ١٩٧٤ يوسف عبدالمسيح ثروت لاپەرە ١٤١ .

٩ـ الشعر والفنون لاپەرە ١٤٢ .

١٠ـ یەکەمین ئەکتەرە ماسك ب کاردئینا بو گوهیرینا دەورا .

١١ـ بروانـە کتێبی (الشعر و الفنون) يوسف عبدالمسيح ثروت لاپەرە ١٤٢ .

١٢ـ ناڤێ ئێـلا ئەرستـوڤانیە ، بروانە کتێبی (ارستوڤان عصره و عمله المسرحى) على نور لاپەرە (١٦) .

١٣ـ ارستوڤان عصره و عمله المسرحي ، على نور لاپەرە ٢٠ـ٢١ .

١٤ـ تاريخ المسرح ، فائق الحكيم ، جامعة بغداد ، ١٩٧٩ لاپەرە ٣٠١

١٥ـ ارستـوڤـان (بوقەکان ، الضفادع) ، دار الفكر العربي ـ بيروت ـ ترجمة امين سلامة ١٩٦٦

١٦ـ موحازەرەی مامۆستا عەزیز گەردی ـ کولێجی ئاداب ، بەشی زمانی کوردی (رەخنەسازی) ٢٠ / ١ / ١٩٨٧

١٧ـ تاريخ المسرح ، فائق الحكيم ، جامعة بغداد ، ١٩٧٩ لاپەرە ٢٨٨

١٨ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٢٨٨

١٩ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٢٨٨

٢٠ـ تاريخ المسرح ، فائق الحكيم ،جامعة بغداد ، ١٩٧٦ لاپەرە ٢٨٩

سەرچاوە :


١ـ الصناعة المسرحية ، تأليف (ستيوارث گريڤش) ـ وەرگێرانی ،. وزارة الثقافة والاعلام ، بغداد ، ١٩٨٦ ، د. عبدالله مصطفى الدباغ .

**٢ـ المرشد الى فن المسرح ، تأليف لوث فار جاس ، مشروع النشر المشترك ، بغداد ، القاهرة ، وەرگێرانی احمد سلامه محمد**

**٣ـ گوڤاری (الثقافة) ژمارە ٣ ، ٤ ، ١٩٨٤ ، جبار صبری العطية .**

**٤ـ (ارستـو فانيس عصره وعمله المسرحى) دار المعـارف في مصر ١٩٦٥ . د. علي نور .**

**٥ـ ارستـو فانيس (كوميديات ارستو فانيس) ترجمة امين سلامه ، المجلد الاول والثاني والثالث وزارة الثقافة والفنون ١٩٧٩ .**

**٦ـ ارستو ڤان (الضفادع) دار الفكر العربي ـ بيروت ـ ترجمة امين سلامه ١٩٦٦ ـ الطبعة الاولى .**

**٧ـ جامعة بغداد ، فائق الحكيم ، ١٩٧٩**




لە ئاسۆی هونەری جیهانیدا

# مانسوو و هونەری ئیتالی هاودەم

نووسینی مێژوو نووسی سۆڤیەتی :
ڤ . ڤ گوریاینۆڤ

○

وەرگێڕان و ئامادەکردنی
لە ڕووسیەوە : محمد عارف

○



● مانسوو ، کۆتایی مرۆڤێك . بەشێکی ریلیفی (دەرگای مەرگ) کلیسەی پێوتر . رۆما ١٩٤٩ ـ ١٩٦٤

هونەری شێوەکاری هاودەمی ئیتالی ، بەشدارییەکی گرنگی لە گەنجینەی هونەرو رۆشنبیری سەدەی بیستەم کردوەو پایەکی بەرزی لە ژیانی دەروونی و جۆری درووست کردنی تێگەیشتنی ئیستاتیکی ئەورووپی وەرگرتوەو لە دەریای شەپۆڵاوی خەباتی زۆر جۆرە قوتابخانەو رێبازی هونەرییدا ، هونەری پێش کەوتن خوازی ئیتالی ، ئەم وولاتەی کە خاوەن مێژوو هونەرو

رۆشنبیریێکی هەرە دەوڵەمەندە ، بەتووندی خۆی چەسپاندوەو و تاکو لووتکە هەرە بڵندەکانی هونەر بەرز بوەتەوە .

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی و لە پاش لەناوبردنی رژێمی فاشی ، هەستی نەتەوایەتی پاك و نیشتمان پەروەریی و خەباتێکی بێوچان لە پێناوی ئاشتی و دیموکراتیەت و دووبارە نەبوونەوەی جەنگ و رژێمی فاشیزم ، لە ئیتالیا ، بە توندی جوولاوەتەوە و دەنگی خۆی بەرز کردوەتەوەو هەموو لایەکی لە ژێر ئاڵای مەزنی نیشتمان کۆکردوەتەوە و هونەری نەمری (ریالیزمی تازە) لەم خەباتە پیرۆزەش دا رۆڵێکی هەرە گرنگ و کاریگەری بینیوە . . .

لە جیهانی سینەمادا هونەرمەندانی گەورە وەك (ڤیتۆریۆ دی سیکا ، رۆسیلینی ، فیلینی ، ئەنتۆنینی ، فیسکۆنتی و ژێرمی) خزمەتێکی زۆریان کردوە ... لە ئەدەب دا (ئەلبێرتۆ مۆراڤیا لیڤی ، پازۆلینی ، کڤازیمۆدۆ ) و لەمەیدانی شانۆی دراماتیکی دا ئەکتەری مەزن (ئەدوارد دیفیلیپۆ) رۆڵی گرنگیان بینوە و بێ ئەم بەهرەدارانە زەحمەت رێی کاروانی ئەم جۆرە ئەدەب و هونەرانە دەست نیشان بکرێ .

هونەری شێوەکاری ئیتالی پاش جەنگی جیهانیی دووەم بەمەڵبەندێکی گرنگی جولانەوەی هونەریی (بەتایبەتی ریالیزمی تازە) دەژمێردرێ . .

نیگارکێشە بەهرەدارەکانی وەك : «پیچیانۆ ، ریناتۆ ، گووتۆزۆ ، مووکی ، ژیگاینا ، فاروولی ، ژانکانارۆ ، کالابریا» و پەیکەرتاشە ناسراوەکانی وەك : «مانسوو ، ژاکۆمۆ ، مادزاکووراتی ، مارینۆ مارینی و کاستێلی » رۆڵێکی گرنگیان لە مێژووی هونەری هاودەمی ئیتالی بینیوە و قەڵای بەرزی ئەم هونەرەیان بەرزکردوەتەوە . نوێنەرورابەرەکانی قوتابخانە هونەریی بە جۆر بە جۆرەکان : «باللا ، بۆسیونی ، سێڤیرینی ، مۆراندی ، کاررا ، کیریکۆ ، کازۆراتی ، سیرۆنی ، سانتاگاتا ، شیپیۆنێ ، پووریفیکاتۆ ، ئەتاردی ، سالڤاتۆرێ ، کاپۆگرۆسی ، گویریسکی و ئافرۆ » چوار چێوەی فراوانی جموجۆڵی هونەریی و ئیستاتیکای هاودەمی ئیتالی و تارادەیەك ئەورووپی یان دەست نیشان کردوە .

پەیکەر تاشی مەزنی ئیتالی هاودەم (ژاکۆمۆ مانسوو) یەکێکە لە مامۆستایانی هونەری پەیکەر تاشنی ئەم وڵاتە ...

مانسوو لە کۆمەڵە پەیکەرەکانی : (کاردینال ، لە خاچ دان و سەماکەری بالیە) دا ، زۆر هۆشمەندانە سوودی لە هونەری ئیتالی کۆن وەرگرتوە و بە شێوەی هونەری هاوچەرخ پێش کەشی ئەم هونەرمەندە ، ئۆبرەزی پاڵەوانەکانی لە شێوەیەکی قوول ، بەرەو شێوەیەکی قوولتر بردووە ، ئەم رێرەوە شادەماری کاروانی هونەریی مانسوو دەست نیشان دەکات .

بەم گیانە هونەرییە پەیکەرە زەقەکانی ، واتە - ریلیفەکانی - (لە خاچ دان و لەخاچ هێنانە خوارەوە) ی درووست کردوە .

مانسوو بەهۆی رووداوێکی کۆن ، کارەساتێکی هاودەمی دەربریوە ... چەندرمەیەکی فاشی چەکدار بەرامبەر شەهیدێکی

● مانسوو . مەرگی ابراهیم . بەشێکی ریلیفی (دەرگای مەرگ) کلیسەی پیتر . رۆما ١٩٤٩ - ١٩٦٤



لەخـاچ دراو وەستـاوە !! پەیکـەر تاش بەم جۆرە هەڵوێستی مرۆڤایەتی خۆی بەرامبەر فاشیزم دەربڕیوە .

پەیکەر تاشی ئیمپرسیانیزمی واتە (تعبیری) (میداردۆ رۆسۆ) ، لەسەرەتادا ، کارێکی قووڵی لە بەرهەمەکانی مانسوودا کردبو مێداردۆ زۆر وەستایانە مۆدێل و جەستەی مرۆڤی دەربڕیوە ، بەڵام مانسوو گەیشتوەتە ئەنجامێکی قووڵتر ، ئەویش مۆدێلی لەخـزمـەت رووداوی تراژیـدی و کاریگـەری مرۆڤـایـەتی بەکارهێناوە و بە (شێوەیەکی یەکگرتووی گشتی) پێش کەشی کردوە .... ئەمەش یارمەتی داوە کە فۆرمایەکی جوان و رێك و پێك و ـ نەپچراو ـ بە چارەسەر کردنێکی پڕ سروشی ـ سێبەرو رۆناکی ـ کە روانگەی «نیگار کێشانی» تێدایە درووست بکات و بەم ئەنجامە هونەرییەیە بەرزو بڵندە بکات .
ئەم شی کردنـەوەیەمان لە پۆرترێتی (ئینگێ) و (کاردینال) دا



● مانسوو . پۆرێتی ئینگێ ، ١٩٥٨

● مانسوو . بەشێکی پۆرترێتی کاردینال ، ١٩٥٥ ، ڤینیسیا گالیرییە جیهانیی هونەری هاوچەرخ .



بەرجەستە بووە .
پەیکـەرەکـانی (ئـافـرەتی سەمـاکـەر) ناوبانگێکی گەورەیان وەرگـرتـوە ، هۆی ئەمـەش لە چۆنیـەتی چارەسـەر کردن و بەرجەستە کردنی لەش و لارو جووڵانەوەی ناسك و پڕ ژیان و پلاستیکیەتی ئافرەتەکانە .
مانسوو لە ساڵی ١٩٤٩ دا دەستی بە پرۆژەیەکی مەزنی ناو (دەرگـای مەرگ ) کردوە. ئەم پرۆژەیـە ئێستـا لە کلیسـەی (پیـۆتر)ە لە شاری رۆما، هونەرمەند پازدە ساڵ خەریکی ئەم بەرهەمە بووە.
(دەرگـای مەرگ) لە شەش ریلیفی یەکگرتوو پێك هاتوە ، کە نێـوانیـان بە وێنەی ئاژەل و رووەکی سیڤۆڵی پڕ کراوەتەوە ، مانسوو پشتی خۆی بە (پەیکەری زەق و رەوانیی هێلی دەرەوە) بەستـووە ، بەهـۆی ئەم تەکنیکـە ناسکـە ریلیفـەکـان وەك (دیمـەنیکی مۆسیقـای بینـراو) دێنـە بەر چاو و لە راستیدا مانسـوو لەم جۆرە هونـەرەدا واتـە (ریلیف) ، کە بەهـرەو تەکنیکێکی تایبـەتی پێـویستە ، بەشۆرە سواری بێ هاوتای هونەری هاودەمی ئیتالی دەژمێردرێ .

ئامانج غازی رواندزی

# گرنگترین رێبازەکانی مۆسیقا کە تازە دەرکەووتون

وابووە هەر یەکێك لە ئێمە لە نزیك خۆشەویستی گیانی بە گیانی دانشتبێ و کوێی لە گفت و لفتی بیٚو کوێی بۆ شل کا بێ ئەودی لێوی ببزوێ . ئەو کاتە هەست دەکا کە هێزێکی ئەوتۆ لە دەنگەکەی هەیە کە وەکو هەژانی کارەبا دڵی پێی دەهەژێ و دەروونی دەداتە شە قەقەی باڵ و لەئاسمانێکی بێ سنوورو بێ مەودا مەلە دەکا، ئەو دەروونەی کە کەردوونی وەکو خەونێك دەبینێو بۆشایی ئاسمانیش وەك زیندانێکی بچووك . ئا ئەوەیە مۆسیقا ئەو مۆسیقایەی کە هاورێی ژیانمانە لە رۆژی لە دایك بوونمانەوە تا مردنمان . لە رۆژی لە دایك بوون کە منالٚ بە دەم واقە واق و لە نێو دەنگی هەلهەلەو هەرای ژنان دا دێتە دونیا ، هەروەها بەرەو گۆریش مالٚ ئاوایی دەکات دیسان لە نێو دەنگی گریان و رۆرۆی کەس و کار . مۆسیقاش کۆمەڵە دەنگێکە ئینجا یان شادی بەخش دەبێ وەیاخود خەماوی دەبێ ، ئەو مۆسیقایەی زۆر جاران بریتییە لە لەرینەوەی ژێیەك کە بەسەرپشتی شەپۆلەکانی هەواوە بەرەو گوێچکەمان دەخزێ . لەوانەیە فرمێسکێك لە چاو بتکێتەوە بە هۆی پەژارەی دوورکەوتنەوەی خۆشەویستێك یاخود وون بوونی ئازیزێك لە هەمان کاتیشدا لەوانەیە زەردەخەنەیەك بێتە دی کە نیشانەی بەختەوەری و خۆش گوزاریە ، مۆسیقاش دەتوانین بڵێین ئەو دەنگە مرۆڤانەیە کە ختوکەی سۆزمان دەداو هەستەکانمان دەجولێنێ بە بەلگەی ئەوەی دەبینی کە یەکێك لە ئێمە گوێی لە ئاوازێك دەبێ سەری دەهەژێنێ و یەکێکی تر بە جولاندنی دەستی یان بە پێی هاوسەنگیەك دەنوێنێو ئەوەی تریان لەگەڵ ئاوازەکان چەپلە دەکوتێ . یەکێکی تریش هەست ناسك دەبێ و هەلئەستێتە سەرپێ و بە پێی ئاوازەکان دایدەمەزرێنێتە سەما ، بەمانەش سەرسام نابین و بەلامانەوە نەنگ نییە چونکە هەر لە کۆنەوە ئەوە سەپێنراوە کە مۆسیقا کار دەکاتە سەر گیان لە بەران بە بەلگەی ئەوەی کە پێش قافلە لەگەڵ کاروانا دەرۆیشت تا ووشتر چالاك تر بکات لە رۆیشتن و بەرگەی برسێتیو تێنوێتی بگرێت ، ئەگەر زانست لەم دواییەدا ئەوەی سەلماند بێ کە مۆسیقا کار دەکاتە سەر رووەك ئاخۆ ئەبێ چەندو چۆن کار لە مرۆڤ بکا ؟ ...

بە مۆسیقا دەڵێن زمانی دەروونان چونکە لەگەڵ هەست و سۆز دەدوێ لەبەر ئەوەی بابەتەکەمان دەربارەی پێناس کردنی ماددەی مۆسیقا نییە ، بەڵکو وە دیار خستنی ئامانجە لە خوێندنی لە پەیمانگا مۆسیقاییەکان بۆیە با روو بکەینە بابەتەکە (گرنگترین رێبازەکانی مۆسیقا کە لەم چەرخەدا وە دیار کەوتن لە بواری مۆسیقادا ، تێبینی یەکیش هەیە کە هەندێ توخمی سەرەتایی ئەبێ هەبێ تا بە ووشەی ئاواز بڵێن «مۆسیقا»

**یەکەمیان ـ ئاواز دانان**

**دووەمیان ـ رەزم «ئیقاع»**

**سێیەمیان ـ ئاوێتە کردنی هارمۆنیایی**

**چوارەمیان ـ دەربرین (ئاداء) واتە دەنگ**

هەر کاتێ ئەم توخمانە بوون کەواتە مۆسیقا هەیە دەمەوێ بڵێم هەر کە گرنگترین ئەو رێبازانەی باسیان لێوە دەکەین تازەکردنەوە بوو لە لایەنی ئاوێتە کردنی هارمۆنیایی کەواتە دان بەوە دێنین کە وولاتانی رۆژئاوا دەست پێشخەرن لە مەدا بەلام لە بارەی توخمی دووەمەوە (رەزم) ئەوا ئێمە لە پێش ترین و تا ئێستاش وولاتانی ئەوروپاو رۆژ ئاواو تەنانەت ئەمریکاش لەم رەزمانەی ئێمە وەردەگرن و لەگەڵ رەزمی خۆیان لێکی دەدەن و مۆسیقایەکی تایبەتی لێ هەڵدە هێنجن کە لە شوێنی خۆیا باسی دەکەین .. کەواتە دەمەوێ بڵێم ئێمە سوودمان لە لایەنی ئاوێتە کردنی هارمۆنیایی مۆسیقای رۆژئاوا وەرگرتوودو ئەوانیش

سوودیان له رەزمی رۆژهەلاتی ئێمە وەرگرتووە

**١- رێبازی یەکەم :-**

واتــە ئەو تازە کردنــەوەی یەکــەم جار دەرکــەوت «دەرهێنانی مۆسیقا بە رووخسارو ناوەرۆکەوە لە رۆمانتیەکی خۆی» واتە دوای ئەوەی کە مۆسیقا جیاَ بوو لە واقیعی ژیانی گشتیو هەر لە کلێساو کۆکشکی میرو پاشاکان لێ دەدرا ، لەبەر گەشەکردن و بەرەو پێش چوونی ئابــوریو ماددی و لەبــەر تونــد بوونی کێشەی نێوان سەرمایەدارو کرێکاران ژیان مۆرکی ماددی و ئامێری وەرگرت ، ئینجا نەوەیەکی تازەی هونەرمەندان هاتن و ئەو رۆمانتکیەیان تێك شکاند کە نوقمی سۆز بوو و ئیتر مۆسیقا لە بۆنەکانا رووەو گۆرەپان و شەقامەکان هاتەدەرەوەو دەستی نایە نێو دەستی گەلَ بە گشتیو ئەو رۆژە ریالیزمی‌یەکی بێ خەون و خەیـالْ بوو بە شێـوەیــەك لەگەلْ کرێکارو جووتیارو سەربــازو قوتــابیو دایك و کۆرپە دەدوا . بە کورتی رێبازی یەکــەم ئەوە بوو کە تیـایـا مۆسیقا تایبەت بوو بە کۆمەلێکی دیـاریکـراو لەم چەرخــەی ئێستــامــاندا بووە مۆسیقای گەل بەگشتی .

**٢- رێبازی دووەم :-**

رزگار بوونە لە یاسای «تۆنالی» ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دانە گۆرانی دادەنێ خۆ بەوە نەبــەستێتەوە کە دانانەکەی لە ژێر دەستــەلاتی مەقــامێکی دیـاریکـراو بێ ، لە پێشدا دانەری مۆسیقـا مەقــامێکی مۆسیقــای دیـاریکراوی وەرئەگرت وەکو (بەیات) یاخود (عەجەم)و دەبوایە گۆرانیەکە لەو مەقامە بوایە ، دەلێــین ئەم گۆرانیــە (بــەیــات)ە وئــەم گزانیــە (عەجەم)ە تازەگــەری لە مەدا ئەوە بوو کە پارچــە مۆسیقــاکــە یاخــود گۆرانیــەکە بگۆرێ لەچەند مەقامێکەوەو بگەرێ بە نێو چەند مەقــامێکــەوە ، ئەم تازە گەریــەش بێ‌گـومان رەنگێکی تازەی بەخشیە گۆرانی

**٣ ) رێبازی سێیەم :- (رەزم)ە**

ئەو رەزمــەی لە مەو بەرو کە ئەمــرۆش بۆتــە ئەو خانمەی کە دەستــەلاتی بە سەر مۆسیقــای سەدەی بیستــەم دا زاڵە .

لێرەشــدا دەمــەوێ بلێم دەستــوورێــك هەیە کە پێویستی بە روونکــردنــەوە هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئێمە هەڵە دەکەین کە مانــای هەردوو وشــەی (رەزم)و (کێش) لەیــەك مانـادا کۆ دەکەینەوە .. کێش چوار چێوەی دەرەوەی گۆرانی‌یەو لەکۆمەلێك جیابەند (فواصل) و رستەو نیشانەی تازەکردنەوەو سوك کردن و گران کردن و خێرا کردنــە ،بــەم واتــایەش رەزم رێکخەری جولانەوەی ئاواز دانانە ،گوتمان تازە گەری لە رەزم هەلێنجانی چەند کێشێکی تازەیە لە گۆرانیەکە ،دانەری گۆرانیەکە دێت و بەشێك لەم کێشە زانراوەو بەشێك لەو کێشە زانراوەی دووەم وەردەگــرێو هەردوو بەشــەکــە تێــك دەیەخێو کێشێکی تازە دەدرێنێو گۆرانیەکەی یان پارچە مۆسیقاکەی لە سەردادەنێ . بەکار هێنانی ئەو کێشانەی کە پێشتر کەس بە لایانا نەچووە هەمــدیس بە تازەکردنەوە دەژمێردرێ ،هەروەها بەکار هێنانی دوو چینە کێش تازەکردنەوەیە لە رەزم ،با بلێین ئەو ئامێرە (کێش ورەزم)ە ئامێزە دەنگی ئەستوورمان دەداتێ کە بۆ گر (قرار) دەست دەدەمن و ئەوی تریــان ئامــێری (رەزم) ئامێزێ تیژەو دەنگە تیژەکان بۆ (بارێکی - جواب) دەست دەدەمن و مۆسیقا ژەن لەیەك کاتدا هەردووکیان لێ دەدا ،تۆ گوێت لەو لێدانە بە جووتە دەبێ کە تیادا مەبەست ورژاندن و تازەگەریو ئاگادار کردنەوەی گوێگرو دەولەمەندکردنی ئاواز دانانە بەشێوەیەکی گشتی .

**٤) رێبازی چوارەم :- (گۆرینی سیفەتی ئاوازە ئاسایی‌یەکان)**

ئەویش ئەو کاتــەیــە کە ئەو هێلە مەنتقی‌یــە نەمــا کە تیـایـا ئەجولایەوەو وای لێ هات کە لە شوێن دەنگی (مناطق صوتیە) لە یەك دوور بجولێتەوە کە هەندێ جار گۆرانی بێژ بۆی نەکرێ بەو ئاســانیــەی پێشــوو بیلێتــەوە .. گۆرانی کۆن لە چەنــد رستەیەکی زانراو دەجولایەوە (٣ - ٤)و دەنگەکانیش سادەو یەك بە دوای یەك بوون، ئەمرۆ گواستنەوە لە نێوان دەنگە لە یەك دوورەکــان هەروەکــو گوتمان وای لێ‌هاتووە کە زەحمەتە گۆرانی بێژ بە ئاسانی بیلێ .

**٥) رێبازی پێنجەم :-**

تطوری هارمۆنیای مۆسیقای تازە ، ووشەی هارمۆنی ٩-Ha)

rmony «ئـاوێـتـە بوونــی دوو دەنــگ یان زێتر . چوار ،پێنج ، شەش ، دەگەیەنێ جا ئەو دەنگانە گونجاو بن یاخود پەرش و بڵاو بن و هەموویان بە یەك ترپە لێ بدرێن»

هەروەهـا مەبـەستیشی بەخشینی دەوڵەمـەندنی مۆسیقایە لە مەداو دەوڵەمەندکردنیو ورژاندن و تازەکردنەوە ،گوتمان ئەو هارمـۆنیـە لە بنـەرەتـدا لە تایبـەتمـەنـدیـەکـانی مۆسیقای رۆژئـاواییـە بەڵام ئێمە لە مۆسیقای خۆماندا هەڵمانهێنجاو سودمـان لێ وەرگرت هەروەکو لە سەرەتادا گوتم کە ئەوانیش سوودیـان لە ردزمی ئێمـە وەرگـرت ،گۆرانی گوتن و مۆسیقا لێدانیش لە دوو چینی دەنگدا هارمۆنیـیە، کۆمەڵێ مۆسیقاژەن دەبینی لە سـەر دەنگی تیژ مۆسیقا لێ دەدەن و کـومەڵێکی تر هەمان مۆسیقاو هەمان رستەی مۆسیقای لە سەر دەنگی گر لێ دەدەن ،هـەروەهـا لە کۆرسی کۆمـەڵە دەنگێکیش گوێمـان لە کۆمـەڵێـك گۆرانی بێـژ دەبێ بە دەنگی تیژ گۆرانی دەڵێن و کۆمـەڵێکی تر بە ددنگی گر هەمـان رستـە دەڵێن ئەمـەشیان جۆرێکە لە ئاوێتە کردنی هارمۆنیایی .

٦) رێبازی شەشەم :ـ

هەڵخلیسکـانی ئامـێرە ژێدارەکـان کە بە بەردی بنـاغـەی مۆسیقای کۆن دا ئەنران و جێ پڕ بوونەوەیان بەئامێری رەزم ، تەنانەت ئەوانەی بۆ دەربرینی سۆزیش بوون وەکو (ڤیولنسیل وپـیـانـۆ) (Piano and cello) وهــەنـدێـکـی تر ،

ئەم ئامێرە ئاواز بەخشانە بۆ دەربرینی گۆرانیە سۆزمەندەکان بوون، بەڵام ئەمرۆ شێوەی لێدانی ئەم ئامێرانە گۆراوەو زێتر کەوتوونەتە ریزی ئامێرە رەزم ئامێرەکان (الالات الایقاعیة) وەك ئەوەی ئامـێری سۆز دەربرین بن ،تەنانەت ئامێرە فوو تێکرا وەکـانیش وەکو (کلارنیت و ساکسفۆن و ئۆبوا) شێوەی فوو تێکردنیان گۆراوەو لەرەزم نزیك بۆتەوە، بەم جۆرە کەوتە پلەی دووەم دوای رەزم و ئامێرە ژێ دارەکان ، وەکو گوتمان خزانە دواوە. ئەو ژێ دارانەی کە پێشتر بێئەوان تیپ بوونی نەبوو وەکو (عود) یاخود ئامێری (کەمانچەو قانون) . کە چی ئەمرۆ تیپـەکـە دەتـوانێ هەر واز لەم ئامـێرانە بێنێ ، گرنگ ئەوەیە پیـانۆو ئۆرگ و چەلۆو ئامێرە تازەکان ببنە ئامێری رەزم ئامێر نەك بۆ دەربرینی سۆز

٧) رێبازی حەوتەم : رێکخستنی ئۆرکسترالیانەی تیپ

تیپ لە لایـەنی چەنـدیو چۆنی رێکخراوە ،لە سەردەمێك دا گۆرانیبێژ ئەوەندەی بەس بوو کە دوو سێ مۆسیقاژەنی لەگەڵ بێت، پاشـان وای لێ هات تیپەکە بگاتە چوارو پێنج و شەش ئەمرۆ ئەم ژمارەیە لەوەش رەتی کردووە بە دەیان مۆسیقا ژەن لە تیپێکـا دەبینین لەگەڵ دابەشکردن لە نێو ئامێرەکاندا ،گۆشەیەك بۆ ژێدارەکان وگۆشەیەکی تر بۆ فووتێ کراوەکان و گۆشەیەك بۆ ئامـێرە رەزم ئامـێرەکـان ،دابـەشکـردنێکی بەرێو جێ لە نێـوان ئامـێرەکان دەکرێ هەتا هەر ئامێرێ بەو رۆڵەی خۆی هەڵسێ کە خراوەتــە ئەستـۆی ،هـەمـان شت سەبـارەت بە کۆرسیشەوە ،پێشان دوو سێ کەس لە کۆمەڵی کۆرسدا هەبووان بەس بوو کە چی ئێستا

دەبینی بە دەیانن جا چ دەنگی پیاوانەبێ یاخود ئافرەتانە کە شان بە شانی تیپی مۆسیقاکە دەرۆن ، جا ئەم ژمارە زۆرەی کۆرس یاخود ئامێرەکان و دابەشکردنی بە رێ و جێ لە نێوان ئامـێرەکـان تەحـرە مۆسیقـایەك و مۆسیقایەکی پاکژو تازەی بەدەستـەوە دا وەکو چۆن ئەو رێبازانەی باسمان لێوە کردن گۆران بە هەمـان شێـوە زۆر لەپەیرەوەکان گۆران ئەمەش لە وانـەیە ببێ بە بابەتی توێژینەوەیەکی تر بەڵام هەر بۆ ئەوەی سوود بەخش بن من لێرەدا باسی هەندێکیان دەکەم .

١ـ ئۆرگـانیـەت لە دانـانی مۆسیقـا : مەبـەستمـان دانانی مۆسیقـایـە بێ ئەوەی رێگـا بدرێتە هیچ سۆزێکی کەسیەتی یاخـود هەڵچـوونێکی زاتی کە دەست لە کرداری . دروست کردنی مۆسیقا وەربدا گۆرانیەکان لە پێشاندا سۆز ئامێز بوون خۆشـەویستیو خۆشـەویست ئاشق و ماشـوق ئەمـرۆ بۆتە بابەتێکی دیاریکراو و بە زەوی و جووتیارو سەربازو خێزان و بابەتی واقیعیو شیرینی تردا هەڵدەڵێ ..

٢ـ گرنگتـرین ئەو پەیـرەوانـەی کە گۆران ئێکسپـریشنیـزم (التعبیریة) کە تیایا مەبەست راستی و توندو تیژی دەربرینە لەگـەڵ خۆ دوورخستنـەوە لە نەخش و نیگارو هۆش و پشت بەستن بە دیارخستنی سۆز ویژدان بەهەر شێوەیەك .

**٣ـ پەیرەوی سێیەم ـ کلاسیکی تازە ـ**

بێ گومان ئەوەش ئەرکی ئەوەی خستە ئەستۆی خۆی کە (کۆن لە بەرگێکی تازە بخاتە روو) هەروەك ئەوەی لەو تیپانە دەبینین کە پشت بە فۆلکلۆرو گۆرانیـیـە میللیـەکان دەبەستن ، ئێمە گوێمان لە پارچە مۆسیقاو گۆرانیەکان بە شێوەیەك بوو ، پاشان ئەو تیپانە بە شێوەیەکی دلڕفێن و سەرسـی ، اکێش پێشکەشیان کردین ، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو بنەمایانەی تێدا

رەچـاو كراوە كە باسمان لێوە كردن كە ئاواز دانان و رەزم و ئاوێتـەی هارمـۆنیـاییو هەڵبـژاردنی دەرخستنی رێك و پێك سەرەرای (تطبیق) كردنی ئەو پرۆگرامە تازانە لەسەر تیپەكە دوایَ ئەوەی لە لایەنی رێك خستنی ئۆركسترالی رێك و پێك بوو ودابەش كردنی تیادا ئەنجام درا لە نێوان كۆمەڵە دەنگی گەورە بۆ ئامـێرەكان ، بە شێوەیەك ئەم راستی‌یە تازانەی مۆسیقای رەچـاو كردو جێبـەجێ كرد ، ئینجـا ئەم گۆرانیـە تازانە بە بەرگێكی دلرفێن خۆیان نواند

**٤ـ پەیرەوی چوارەم :ـ مۆسیقای ئەلیكترۆنیَ :ـ**

ئەمەشیان هەوڵی ئەوە دەدات كە بەپێی توانا بگاتە ئەو تەحرە دەنگـانـەی كە بەسەر نەكراو نەتەوە بە مەبەستی دەوڵەمەند كر دنی ماددەی ئاوازەكان و دەرخستنی هەر چەند بتوانریَ لەو تەحرە دەنگە سەیرانە لەگەڵ تۆمار كردنی لەسەر بەكرەیەكی موگنـاتیس كراو و ئەمـەش بە كەڵكی ئەوە دیَ كە لە شانۆو سینەماو رادیۆ و شتی تر بەكار بێت ... ئەگەر بمانەویَ قسەكان كورت كەینەوە دەڵێین :ـ

مۆسیقـا لەو چەرخـەمـانـدا بەرەو پێش چوو ، لە كڵێسـاو كۆشكـەكان هاتە دەرو رووی كردە شەقامەكان و رووی‌كردە گەل لە ، ئاواز دانانیش دا تەنها پشت بەستن بەیەك مەقام و یەك كێش نەمایەوە ئاوازەكان بەبەكار هێنانی دەنگە دوورەكان و لەگەڵ یەك ئاوێتە كراوەكان كە بە هارمۆنی‌ناومان بردن ، پلەو پایـەی ئامـێرەكان لە نێو تیپ دا گۆران ، رەزم كەوتە پێش و خوو تێكـراوەكان دوای ئەو پاشان ژێ دارەكان ، تیپ لە هەردوو لایەنی چۆنیەتی‌و چەندیەتی رێك خرا .

ئەم رێبازانەم بە كورتی كۆ كردنەوە تا بۆتان كورت كەمەوە بێ ئەوەی روو بكەمە هیچ نوونەیەك یاخود تیپێك یاخود گۆرانی بێـژێـك ، چونكە ئەم جۆرە باسانە سەر سووك ترن و چونكە زەوقی خەڵكیش جیاوازن و رازی كردنی هەموو زەوقەكانیش ئامانجێكە دەست نایگاتێ ، ئەم رێبازانە چەند بیرو راستیەكن هەمـوو مۆسیقـا خوازێـك هەستی پێ دەكـاو تاقی لێ دەكاو بەردەستی دەكـەویَ ویستم بەم رێگـایـە كۆی كەمـەوەوبەم شێوەیە بیخەمە روو

## سەرچاوەكان


| الكتاب | المؤلف | المترجم |
| --- | --- | --- |
| ١ـ دعوه الى الوسيقى | المايسترو يوسف السيسى | |
| ٢ـ الموسيقى في العصر الرومانتيكى | الفرد آنشتين | د . احمد حمدى محمود |
| ٣ـ الموسيقى الالكترونيه | د . على الشوك | |
| ٤ـ تاريخ الموسيقى العالميه | ثيودور فينى | د . سمحه الخولى |
| ٥ـ فلسفة الادب والفن | د . كمال عيد | |
| ٦ـ فن الموسيقى | هيغل | جورج طرابيشى |
| ٧ـ سيكولوجيه الموسيقى | جون بوث ديفز | امال مختار |
| ٨ـ النقد الفنى | اندريه ريشار | صباح الجهيم |
| ٩ـ بحث في علم الجمال | جان برتليمى | د . انور عبدالعزيز |
| ١٠ـ الابداع في الوسيقى | جيزيل برولسيه | |
| ١١ـ الثقافة الاجنبية | العدد الاول السنة الثانية (متغيرات جديدة في الموسيقى) | تاليف/جوناثان كريمر ترجمة سعد فاضل الحسينى |

**١٢ ـ بعض محاضرات مادة ( التأليف الموسيقي )معهد الفنون الجميلة ( موصل ) ١٩٨٤ .**







ئامادە کردنی : خۆشناو عوسمان

# چۆن منداڵەکەت پەروەردە دەکەیت ؟

نووسەری بولگاری «رایتە پێشێڤە» دەڵێت : خێزان تەنیا خانەیەکی کۆمەڵگانی‌یە ، بەڵکو کاریگەرێکی گرنگیشە بۆ پەروەردەی مرۆڤ ، چونکە بنچینەکانی کەسایەتی مرۆڤ دروست دەکا لە ناو خێزان دا .

مەرجی گرنگ لە خێزان دا بۆ پەروەردەی سەرکەوتوانە ئەوەیە ، دایك و باوك بە ئارەزووی خۆیان و بە شێوەیەکی راست و دروست منداڵەکەیان پەروەردە بکەن .

پێویستە هەموو هەوڵێك تەرخان بکرێت بۆ لەناو بردنی ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە رێگا لە پەروەردەکردنی منداڵ دەگرێت و تا ببنە چاکترین نموونە بۆ منداڵەکە .

مەرجێکی گرنگتر هەیە بۆ کارتێکردنی پەروەردە ، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ خێزان ساغ و سەلیم بێت لە رووی تەندروستی‌یەوەو یارمەتی دەری یەکتریش بێت بۆ یەکتری‌و پێوەندی ئەندامەکانی خێزان لە رووی سۆزو هەستەوە پتەو بێت . تا ئەم رووداوانەوە بە شێوەیەکی ئاسایی لەسەر منداڵەکە رەنگ بداتەوە .

پەروەردکاری بەناوبانگی سۆڤیەتی «مەکەرێنکۆ» دەڵێت :

• کۆمەڵی «کۆلێك تیڤ[1]» لە توانای‌دا هەیە یەك بگرن بۆ کارکردن و بۆ خزمەتی کۆمەڵ واتە ، بەرژەوەندی تاکە کەسێك ناخرێتە سەرووی بەرژەوەندی کۆمەڵ و خێزان .

زانیاری‌ی پەروەردە ، هەر لە زووەوە ئاوری لە رۆلی خێزان داوە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و ئاشکرای دەکات کە پەروەردەی چاك و باش لە ئەنجامی پێوەندی‌ی ناوخۆی خێزانەکەیە .

بەرای «پیستالوچی» : پەروەردەی خێزان بەر لە هەموو پەروەردەیەکی ترە ، کە مەسەلەی بنچینەیی لە پێوەندیی خێزان دا ، بەستراوە بەکارکردن ، واتە لە کاتی کارکردن دا ئەگەر منداڵ بەشداری بکات لە کارەکە ، کە خێزانەکە پێ‌ی هەڵدەستێ ئەوا بەهەر حال سیفەتی ئەم کارکردنە بەزووترین وەخت کار دەکەنە سەر منداڵەکە ، دەبێ ئەم کارکردنە تێکەڵ بێت بە خۆشەویستی‌و بیروباوەرو رێز لێگرتن و دەست پاکی و راستگۆیی‌و لە خۆبوردن ، کە ئەمانە مەرجن بۆ پەروەدەکردنی منداڵ و گەشە بوونی هەردوو لایەنی ، دەروونی و فزیۆلۆجی ، هەروەها ئەم جۆرە پێوەندی‌یەی ناو خێزان ، تا رادەیەکی زۆر دیاری دەکا کە ئایا منداڵەکە گەشە دەکا وەك مرۆڤێکی سوودبەخش ،؟ یا خود ، بە پێچەوانەوە ؟ هەڵس وکەوتی خێزان ، وەك سەرچاوەیەکی بەردەوامی راگەیاندە بۆ منداڵ ، هەر لەم روانگەیەوە ، گەشە بوونی ژیری‌و هۆشیاری‌ی منداڵ بەندە بە جووڵانەوەو رەفتاری خێزانەکەی . با پەنا بەرینە بەر چەند نموونەیەك کە پێوەندی‌ی ئەندامەکانی خێزان چۆن کاردەکەنە سەر بیرو هۆش و رەفتاری منداڵ ،

- پلامین ، تەمەنی ١٣ ساڵە ، لە ماڵەوە را دەکات ، جگەرە دەکێشێت ، بەدخووە ، دزی دەکات .

ئەی باری خێزانی چۆنە ؟

باوکی زۆر دەخواتەوە ، دارکاری منداڵەکەی دەکات ، ئەندامەکانی خێزان رێز لە یەکتر ناگرن .

- فیلیپ ، تەمەنی ١٤ ساڵە ،جگەرە دەکێشێت ،جنێو دەدات، ئازاری هاورێ‌یەکانی دەدات ، رێز لە مامۆستایەکەی ناگرێت، چونکە پێوەندی ناو خێزانەکەی ناتەواوە ، باوکی زۆر ئازاری دەدات - ئەلێکسەندەر ، تەمەنی ١٢ ساڵە ، منالێکی زیرەك و گورج بوو ، هیچ کەموکوریەکی نەبوو ، بەڵام دوای بەسەرچوونی ماوەیەك ، باوکی ، زۆرجار نەدەگەرایەوە بۆ ماڵ ، چونکە دەستی لەگەڵ ئافرەتی‌تر تێکەڵ کردبوو ، زۆریشی دەخواردەوە ، مەرجەکانی ژیانی بۆ منالەکەی مسۆگەر نەدەکرد

، دوایی ، بارەکە وای لێهات دایك و باوك لە یەکتری جودا ببنەوە . ئەم رووداوە یەکسەر کاری کردە سەر رەفتاری ئەلێکسەندەر ، تا وای بەسەر هات لە قوتابخانە را بکات ، جگەرە بکێشێت و دوورە پەرێز بێت لە خەڵکی و دزیش بکات !!..

ئەم چەنـد نموونەیە کە دەروون زانایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردوون بێگومان بایەخێکی زۆری هەیە بۆ هەموو لایەك کە پێـویستـە بەووردی رەچاوی کۆسپ و تەگەرەکان بکرێت کە دەبنە هۆی گۆرانی رەفتاری منداڵ بەرەو لایەکی خراپ ..

بۆ راستیی ئەم قسـانـە «پـرڤـان پرڤانوڤ» لێکۆڵینەوەیەکی کردووە و دەڵێت :

کە ٢/٦٥٪ لە کور ، ٨/٥٢٪ لە کچ ، رەفتاریان تەواوە چونکە لە خێزانێکی بێ قسورن ، بەڵام ماوەکەی تر کە ٨/٣٤٪ لە کورو ٢/٤٧٪ لە کچ بە پێچەوانەن بە کورتی ، خوو رەوشتی هەر منداڵێك ئاوێنەی هەڵس و کەوتی خێزانەکەیەتی .

رێك و پێکی ناوەخۆی خێزان ، پاك وخاوێنی ئەندامەکانی ، جل و بەرگی جوان ، رەفتاری چاك ، رێبازی پێوەندی نێوان یەکتری لەگـەڵ خەڵکیـترو چۆنیـەتی خوێندن و کارکردنیان ، ئەمانە هەمـووی کارێکی چاك دەکـەنـە سەر پەروەردەی منـداڵ ، هەروەهـا باری دەروونی فزیۆلۆجی دایك مەرجێکی گرنگە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ .

نووسەری سۆڤیەتی «ئارکین» دەڵێت : ژیانی منداڵ ، یارییە، چونکـە یاری بۆ منداڵ ، کارکردنە ، بیرکردنەوەیە ، هونەرە ، ئەفسانەیەو سەرچاوەی دڵخۆشییە . یاری ، ئەو ژیانە بەتام و چێژەیە کە منداڵ خۆی تێدا دەدۆزێتەوەو گەشەی پێ دەکات .

پێویستە مەرجەکانی یاریکردن بۆ منداڵ ساز بکرێت وەك : کەرستەی یاریکردن ، جێگای دیاریکراو ، کاتی پێویست ، هەروەهـا لە کاتی یاریکردن دا زۆر گرنگە کەس و کارەکانی بەتـایبەتی دایك و باوك بەشداری لەگەڵدا بکەن ، بۆ ئەوەی هەست بە تەنیایی نەکات و زیاتر لەگەڵ یارییەکە بگونجێت و دڵخـۆشتـر بێت . بەڵام یاری کردنیش تاکـە مەرج نییە بۆ نەشونمابوونی منداڵ ، بەڵکو کارکردن بایەخێکی زۆری هەیە لەم رووەوە و دایـك و باوك لێـپـرسراون بە ئامـادەکـردنی منداڵەکەیان بۆ کارکردن کە هۆیەکی سەرەکییە بۆ پێگەیشتنی



کەسایەتیی منداڵ بەتایبەتیو پێشکەوتنی کۆمەڵ بەگشتی ، بەڵام بەداخەوە زۆر لە دایك و باوکان سەرنجی ئەم لایەنە گرنگە نادەن .

وەکـو دەبینـین هەر لە سەرەتاوە منداڵ ئارەزووی کارکردن و جووڵانەوەیە ، ئەگەر لەم تەمەنە هانی خۆشەویستیی ئیش و کار نەدرێ ئەوا بە گەورەیی هەرگیز هەوەسی لەگەڵ ئیش و کار نایەت ! زۆر جار وا رێکەوتووە منداڵ دەیەوێت یارمەتی دایکیو یان باوکی بدات بۆ هەرکارێك ، کەچی رێگەی نادەن و پێی دەڵێن وازبێنـە ئێمـە جێبـەجێی دەکـەین !!! بەم شێـوەیە منداڵەکە پەیتا دوورە پەرێز دەبێت لە ئیش و کار ، کە گەورەش دەبێت بەلایەوە زۆر گران دەبێت ئیش و کار بکات .

لەسەر دایك و باوك پێویستە منداڵەکەیان بە شێوەیەك فێر بکەن کە بەبێ کار کردن مەحاڵە لە شێکی ساغ دروست ببێت : کار کردن دروست کەری مرۆڤـە ، کە سایـەتیـیـە ، هەروەهـا

دەوڵەمەندکردنی ئاکارە بە نرخەکانی کۆمەڵە ، دەبێ بە جۆرێك پەروەردە بکرێت کە رێز لەو ئیش و کارانە بگرێ کە لە خزمەتی کومەڵ دان .
ئەو ئیش و کارەی بۆ مندال تەرخان دەکرێت ، پێویستە لە گوێرەی هێزو توانای مندال دابێت ، نەك وەك سزادانێك پێی راسپێردرێت بۆ ئەوەی دوژمنایەتی لەلا دروست بێت ، پێویستە ئیش و کارەکەش جۆرا جۆر بێت و سوود بەخشیش بێت و لەگەڵ تواناو هەوەسی بگونجێت ، بۆ ئەوەی بزانێت لەبەرچی کار دەکات و ئەنجامەکەشی چییە . مەرجێکی تریش بۆ پەروەردەکردنی مندال ، رێك و پێکی ناو خێزانە پێش هەموو شتێك دانانی پرۆگرامی رۆژانە ، هەروەها پارێزگاری رەفتاری رۆشنبیرانەو رێك و پێکی و پێویستییەکانی خێزان لە رێگای پرۆگرامی رۆژانە دێتە دی.
بۆ نموونە : ئەگەر مندال فێر بکرێت لە کاتی دیاری کراو بخەوێت ، ئەوە هەموو رۆژێك لەو کاتە دیاری کراوەکەدا دەخەوێت ، بەبێ چیرۆك گوتن و لایەلایە ، چونکە سەرنج نەدانی ئەم لایەنە ، لە پاشان دەبێتە کۆسپێك بۆ راهاتنی خەوتنی مندالەکە . زۆر لە دایکان هەن لە دواییدا هەست بەم خالە دەکەن ، کە چارەسەری زۆر زەحمەت دەبێ . بەڵکو هەر لە سەرەتاوە مندالەکە فێر بکرێت بە شوشتنی دەم و چاو ، چۆنیەتی نان خواردن و پاك و خاوێنی ناومال ، رێزلێگرتن لە ئەندامەکانی خێزان و خەڵکی تر .. هتد . ئەمە لەلایەك لە لایەکی ترەوە تێکەڵ بوون مەرجێکی پەروەردەی گرنگە بۆ بەرزکردنەوەی رادەی ژیریو هۆشیاریی مندال ، ئەو دایك و باوکەی کە تێکەڵی مندالەکەیان نابن لە کاتی یاری کردن وئیش و کاردا ، ئەوا هەرگیز بەرژەندیو ئارەزووی مندالەکەیان لە بەر چاو نییەو ناشتوانن رێبازێکی راست و دروست بۆ مندالەکەیان هەڵبژێرن . باشتر وایە گشت ئەندامەکانی خێزان یارمەتی مندالەکە بدەن لەکاتی یاری کردن و ئیش و کاریدا ، بەتایبەتی دایك ، کە نزیکترین کەسە لە پەروەردەکردن و پێك هێنانی کەسایەتیی مندالەکە .
« مەکەرێنکۆ » چەند جۆرە دەستەلاتێکی دایك و باوکی تەرخان کردووە لە بواری پەروەردە کردنی مندال دا :



**١ـ دەستەلاتی چەوسانەوەو زۆرەملێ** :دایك و باوکی ئەم جۆرە خێزانە ترسناکن ، بێ وێژدانن ، رادەی ، رۆشنبیرییان نزمە ، مندالی ئەم جۆرە خێزانە هەردەم ترسنۆك دەبن و توانای ژیرییان زۆر بە زەحمەت گەشە دەکات ، زۆربەی کردەوەکانی خراپن تا گەورەش دەبێ ئەم رەوشتانەی لێ جودا نابێتەوە !!

**٢ـ دەستەلاتی دوورخستنەوە**:دایك و باوك بە دەگمەن تێکەڵ بە کاری مندالەکەیان دەبن ، زۆر کەم لەگەڵی دەدوێن ، دوورە پەرێز رادەگرن لە زۆربەی ئیش و کارێك دا بێگومان جۆری پەروەردە لای ئەم بابەتە خێزانەش زۆر لاوازە مندال هەست بە کەموکورییەکی زۆر دەکات .

**٣ـ دەستەلاتی بەرتیل دان** :ئەمەش جۆرێکە لە جێبەجێ کردنی داواکارییەکی دیاریکراوی دایك یاخود باوك لە لایەن مندالەوە بەرامبەر بە بەرتیل وەرگرتن .

بۆ نموونـه دارا تەمـەنی هەشت ساڵە کاتـژمێر یازدەی بەیانی‌یە ، داوا لە دایکی دەکات سەندەویچی بۆ بکرێت ، بەڵام بۆی ناکرێت ، بەو هەنجەتەی کە دوایی ناتوانێت نانی نیوەڕۆ بخوات منداڵەکە وازی لێ ناهێنێت و دەگریێ ، ئیتر دایکی پێی دەڵێت : سەنـدەویچت بۆ دەکـرم . بەمـەرجێك چیتر قسەی ناشیرین بە کەس نەڵێیت . یاخود باوك بە کورەکەی دەڵێت : ئەگەر سبەی لە تاقی کردنەوە دەرچوویت ، ئەوا دیاری‌یەکی زۆر جوان بۆت دەکرم !

کارێکی نارەوایە دایك و باوك بەم جۆرە پەروەردەی منداڵەکەیان بکەن .

**٤ـ دەستەڵاتی راست و بەجێ :** ئەم جۆرە دەستەڵاتە لەگەڵ گەشەی ژیری و هۆشیاریی منداڵ دروست دەبێت ، ئەم جۆرە دەستەڵاتە بەندە بە رۆشنبیریی گشتی‌ی دایك و باوکەوە.

لەم جۆرە دەستـەڵاتـە ، هەر چەنـد منـداڵ گەشە دەکات ، دەستەڵاتی دایك و باوك فراوانتر دەبێت بەسەر خوو رەوشتی منداڵەکە ، هەروەها دایك و باوك دەبێ دڵ فراوانی‌یەکی گەورە پیشـانی منـداڵەکـە بدەن و رووشکێنی نەکـەن ، چونکـە سەرچـاوەی وەرگـرتنی هەر ئامۆژگاریەك لە لایەن منداڵەوە ، دایك و باوکی‌یەتی هەروەك «تۆلستۆی» دەڵێت : کاری پەروەردە ، کارێکی سەخت و ئاڵۆزە !!

بە لامـانـەوە سەیر نەبێت کە خوو رەفتاری منداڵ لە کوێوە هاتـووەو سەری هەڵداوە ، لە کاتێکدا خەڵکی ئاسایی جگەرە دەکێشن و مەی دەخۆنەوە لەبەردەم منداڵ ؟! چونکە مێشکی منداڵ وەك پەرە کاغەزێکی سپی‌ی سادەیە وایە !!

«مـەکـەرێنکـۆ» دەڵێت : چۆن دەدوێیت بۆ خەڵکی‌ترو لەگەڵ خەڵکی‌تر ، چۆن دڵخۆش دەبیت یاخود غەمبار دەبیت ، چۆن ئاور لە برادەرەکـانـت دەدەیـتـەوە ، لە دوژمنـانت ، چۆن پێدەکەنیت یاخود رۆژنامە دەخوێنیتەوە ـ ئەمانە هەمووی خوو رەوشتن ، بۆ منداڵەکەت دەگوازێتەوە و بایەخێکی زۆریشی هەیە بۆ سەر دەروونی .

کاتێك منداڵ ئەرکێکی پێ دەسپێردرێت ، پێویستە گرنگی‌ی ئەو ئەرکە بۆی روون بکرێتەوە ، تا ئەنجامی ئەرکەکەی بزانێت و سوودی لێ وەربگـرێت ، چونکـە باوەرکـردن کار دەکاتە سەر ژیری‌ی منداڵ ، هەروەها راهێنانیش لە رێگەی دووبارەکردنەوە دروست کەری چەندان سیفەت و خەسیەتی چاکە .

چاودێـری کردنی منـداڵ لە لایەن دایك و باوکەوە بایەخێکی سەرەکی‌یـە لە کاری پەروەردەیـان ، هەروەك دەزانـین کارە بنەرەتی‌یەکانی منداڵ ، یاری خوێندن و جووڵانەوەیە ، هەروەها رەفتـارو پەیـوەنـدی بەرامبـەر بە برادەرەکـانی و خەڵکی دەوروبەری ، کە پێویستە دایك و باوك چاودێری بکەن .

هەرچەند منداڵ گەشە بکات ، دەبێ جۆری چاودێری‌ی دایك و باوك بە پێی ئەو گەشە کردنە بگۆرێت بەرەو پێشەوە.

« فۆلکـۆڤـە» دەڵێت : منـداڵ هەر لە قۆنـاغێکی تەمـەنی سەرکەوتووبێت ، بەڵام بە بێ چاودێری‌ی دایك و باوك ، هەرگیز ئەنجـامـەکـەی جێی رەزامەندی نی‌یە چونکە ژیانی منداڵ خاوەنی تەجرەبەیێکی زۆر کەمەو هێشتا پێی نەگەیشتووە .. ئەوەش ، ئەوە ناگـەیێنێت کە دایك و باوك زۆر بە توندی و لە هەموو ساتێك دا چاودێری‌ی بکەن . بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە ، بزانن چۆن پێوەندی‌ی لەگەڵ دا بکەن و رێگەی راستی بۆ دەست نیشان بکەن .

**١ـ کۆلێـك تیف : ووشـەیـەکی بولگـاری‌یـە ، بە واتـای کۆمەڵە کەسانێکە یەکیان گرتووە لە ژێر ئامانجێکی گشتی .**


**سەرچاوەکان بە زمانی بولگاری:**

**١ـ ر. پێشێفە : خێزان وەك دەورو بەرمیەکی پەروەردکار ، ١٩٧٥**
**٢ـ مەکەرێنکۆ : سیپارە بۆ دایکان و باوکان ، ١٩٥٢**
**٣ـ مەکەرێنکۆ: بۆ پەروەردەی لاوان ، ١٩٥٣**
**٤ـ پ : پرڤانوف : چەند جیاوازی‌یەکی کۆمەڵایەتی و دەروونی و رەفتاری نێوان کورو کچان ـ گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتی ، ١٩٧١**
**٥ـ پێ ، ئارکین : دایك و باوك بۆ پەروەردەکردن ، ١٩٦١**
**٦ـ چەند گۆڤارێکی پەروەردەیی .**







هەردەویل کاکەیی

# ئافرەت و داب و نەریتی کوردەواری

جیهانی بێ ئافرەت وەکو ڕۆژی بێ خۆر وایە ، شەوێکی بێ مانگ هەمیشە تاریك و ئەنگوستە چاوە ، ئافرەت مرۆڤەو سەرچاوەی هونەرو دەربڕینی هەست و بەهرەی نووسەران و شاعیران و گۆرانی بێژانە وەکو شاعیری بە ناوبانگی کورد مامۆستا گۆران وتویەتی :

ژنە کە جیلوەیی حوسنی بەعیشق ئەکا پەرواز
ژنە کەقووەت ئەخاتە خەیاڵی ڕەقص ئەنگیز

ژنە مووەلیدی عیشق و ژنیشە عیشق نەواز
ژنە کە تاری ڕوبابی حەیات ئەکا تەهزیز

* * *

ئافرەت نیوەی کۆمەڵە ، ئەگەر ئافرەت نەبوایە پیاویش نەدەبوو ، پیاو لە ژنەو ژنیش لەپیاوە ئافرەت ئەستێرەیەکی پڕ شەوق و گەشە ، شەوقی لە مانگی چواردەشەوە ڕۆشن و پرشنگدارترە .

ئافرەتی کوردەواری خۆمان بە شێوەیەکی گشتی بە ژیری و وریایی و دامین پاکی و ئازایی ناسراوە ، هەر لە بەرەبەیانەوە تا ڕۆژ ئاوابوون ڕاوەستانی بۆ نی یە لەگەڵ دارو دەوەن و بەردا دەجەنگێ ، گەرمی و تاڵی و تفتی و سەرماو سۆڵی زستان و هاوین دەچێژێ لەپێناوی بەدەست هێنانی پارو نانێك بۆ ئەوەی بەسەر بەرزی و ڕوو سووری لەگەڵ خێزانەی دا بیخوات ، خوشەویش لە ڕۆژ ماندوو ترە بە دەستی منداڵ بەخێوکردن و جل و بەرگ شۆشتن و ڕێك خستنی کارو باری ناو ماڵ و خاوێن کردنەوەی هەراسانە بەڵام سەرەڕای ئەم تەقەلاو کۆششەی هەست بە ماندوبوونی و شەکەتی ناکات :

جل و بەرگی ئافرەتی کوردەواری زۆر جوان و نایابە ، جگە لە ڕوومەتی هەموو لەشی بە تەواوی دادەپۆشێت ، وەکو لەم تاکە خشتەدا هاتووە کەوا ئاراستەی ئافرەتی کورد کراوە دەربارەی بەرگە ڕێك و پێکەکەی :

(جلە کوردی یەکەت بەرگ خۆماڵی یە
ناحەز ئەو بەرگە خراب حاڵی یە

جاران لەگەڵی ناوچەو شوێن دا مافی ئافرەتی کورد بە یەکجاری پێشێل کرابوو ، لە ئاهەنگی شایی و زەماوەند نەبوایە بیرای بیر نەیاندەهێشت تێکە بە پیاوێ ، لە زۆر کارو پیشەدا بیرو ڕایان نەدەسەند ، ئەگەر پرسیانیش پێ بکردایە بە قسەیان نەدەکرد وەکو لەم پەندە کوردی یەدا هاتووە (پرست دەکەم بەقسەت ناکەم ، تەنانەت کچیش لەکاتی بە شوودانی ڕایان وەرنەدەگرت و بە زۆر بەمێردیان دەدا بۆیە سەیید وەهاب کاکە (١٩٢٨ - ) لەم بارەیەوە وتویەتی :

باوك وەپارە کچ ئەدا بەشوو
نازانێ دوارۆژ ئەڕوا ئابروو
پرسی کچیش بکەن کاروازی نی یە
بەڵکە ئەو کچە پێی ڕازی نی یە
بۆ ئەیدەن بەشوو وەزەبری خەنجەر
بەڵکە بەو کورە ئەو نابێ هاوسەر

**یان** :

کورو کچ هەردوو گەر یەکیان بویێ
خودا بەو کارە هەم ڕازی دەوێ
وە شەرعیش مارەی ئەوان حەڵاڵە
کچ وە نەوە دڵ مارەی بەتاڵە
بە بێ ڕایی کچ ، کچ بەشوو مەدەن
ئۆباڵ ئەو کچەت ئەچێ وەگەردەن

مەیسەر بوو وەستا رەجەب (٢٢٢) دانە لوولە تۆپی دروست کرد
کە لەسەر دەمی (تەها ئەفەندی) لە ساڵی (١٩٢٦) قایمقامی
رەواندوز بوو هەندێ نمونەی لەم تۆپانە لە چۆمی رەواندوز لە ژێر
پردێك دۆزیەوە کە ئێستاش ماون ، جگە لەمەش هەندێ لەم
تۆپانە نمونەیان لە لای والی موصل هەبوە کە لە ناوەراستی چەرخی
نۆزدە (٨٠) تۆپی لە ژێر دەستا بوە زۆربەیان لە رەواندوز دروست
کرابون ، ئێستاش هەندێك لەم تۆپانە نمونەیان لە مۆزەخانەی
سەربازی لە بەغدادا هەیە کە درێژی هەندێکیان لەسێ مەتر زیاترە
بەرینی دەمەکەشیان (٤٥)سم دەبێ ، هەروەها لەساڵی (١٩٠٢)
مارك سایکس بە سلێمانی‌دا رەت بووە دیویەتی کە لە دەوروبەری
(١٥٠) کەسێك‌بە دروست کردنو چاك کردنەوەی چەك
خەریك بون . ئەم کارە زۆر سەرنجی ئەم پیاوەی راکێشاوە لەسەر
دەمی خۆی کە (ئەدمۆندس) بیش دانی بەمەداناوە ، بێگومان
ئەمانە چەند نمونەیەکی بەرچاو بون بۆراستیو هەبونی ئەم جۆرە
دیاردانە لەناو کۆمەڵەکەمان کە مێژوەکەی دەگەرێتەوە بۆ چەند
سەدەیەك لەمەوبەر بۆیە بەشتێکی سەمەرە دانانرێ ئەگەر لە
رۆژگاری ئەمرۆش هەندێ لەم جۆرە کارانە مابنو درێژە پیێ‌دەری
رۆژگاری پێش خۆیان بن لەگەڵ ئەوەشا ئەم جۆرە کارانەو
هەمووکارەکانی تریش رەنگ‌دانەوەی پێویستی ژیانی رۆژگارو
سەردەمو کاتو ساتی خۆیانن بۆیە پێ بە پێ هەندێکیان
تواونەتەوەو لەناوچون . چونکە گۆرانو پێش‌کەوتن کە هەر چوار
کەناری دنیا ی گرتۆتەوە کوردستانیش لێی بێ‌بەری نەبووە .

ئینجا بە هەر شێوەیەك بێ لەژێر پەردەی هەرجۆرە گۆرانێك بێ ئەم
کاروبشانە بەرەو نەمان رۆیشتنو تەنانەت هەندێکیان خەریکە
بەتەواوی لەرەگەوە دەربێ ، بۆ نموونە ئەم باسەی‌کە ئێستا ئێمە
لەسەری دەنوسین تەنیا یەك دوکان لە هەولێر ماوە ئەم کارە ئەنجام
بدا ئەویش بە دەم بێ‌کاریەوە هەرشەی لەناوچونی لێ دەکرێ ،
بۆیە ئەگەر دەستەپاچە بەرانبەر ئەم جۆرە لایەنە بوەستین ئەوا
روەکی گەش نادەینە کەلەپوری نەتەوایەتیان . هەر لەبەر ئەمەش
ئێمە ئەم جۆرە کارەبەدەست پێش خەرێك دەزانین بۆ داکۆکی
کردن لە کەلەپورەکەمانو رزگارکردنی لە فەوتان . هەرچەندە ئەم
بەدەنگەوە هاتنەش لە کاتێکی زۆر درەنگ دەکرێ ، بەلام
زەرەر لەنیوەی بگەرێتەوە هەرقازانجە ، ئەوەی لێرەوەش
دەمانەوی‌بیدرکێنین‌چۆنیەتی‌پێك‌هاتن جۆش دانی کورەیە بۆ توانەوەو
نەرم‌کردنەوەی ئاسن ئەوەی بەشێوەیەکی تایبەتیش دەستی بۆ درێژ
دەکرێ ئەم کەلو پەلانەیە کە لە ژیانی رۆژانەو وەرزی جوتیارو
عەمەل‌مەندەکانی‌کوردستان‌کەلکیان‌لێ‌وەردەگیرێ ئەگینا بابەتەکە
فرەوانەو زۆر لایەنی‌تر دەگرێتەوە کە لەکاری‌تاکە کەس دانی‌یەو
پێویستی بە لێژنەی تایبەتی هەیە . بۆیە خستنە روی ئەم جۆرە
دیاردەیە لەلایەن ئێمەوە تەنیا لە هەڵوێستی بەتەنگەوە هاتنی
کەلەپوری نەتەوەیی‌مانە لەنەمانو لەناوچون ئیتر لێرەوە دەچینە
ناوبابەتەکە هیواداریین چێگەی رەزامەندیی هەموو دڵسۆزانی ئەم
لایەنە بێ .

**شێوەی پێك هاتن :-**

پێك هاتنی کورەی ئاسن نەرم‌کردنەوە شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیەکە
پێویستیەتی ئەم جۆرە لایەنە وای سەپاندوە لە کورەیەکی ئاسایی پێك
دێتو شێوەی دروست کردنی تا رادەیەك وەك فرنی نان وایە . بەلام
تەنورەکەی وا نی‌یە بەڵکو لە قۆرتێکی نیمچە خر پێك دێت بۆ ئەوەی پارچە
ئاسنی بخەنە ناو لە کاتی سورکردنەوەدا هەر وەها جگە لە کورە چەند
شتێکی تریش هەیە وەکو (دەزگا - یاخود سندان کە پێك هاتوە لە
ئاسنێکی خری پان لەسەر نیمچە سەکۆیەکی خر دادەنرێ لە تەنیشت
کورەکە ، ئەمەش بۆ ئەوەیە لەکاتی ئاسنی سورکراوە لە کورەکە دێتە دەرەوە
دەخرێتە سەریو بە چەکوش لێی دەدەن تاکو ئەم شێوەیە وەردەگری کە
گەرەکە ، ئەمەو جگە لەچەند چەکوشێکی قەوارە جیاوازی سەلك‌گەورە
هەیە بۆ لێدان بەکاردێ . هەروەها گازیش هەیە بۆگرتنی پارچە ئاسنەکانە
لە کاتی سورکردنەوە . لەگەڵ چەند قەڵەمێك بۆ برینی سومبەو کون کردنی
کەلکی لێ‌وەردەگیرێ ، بە شێوەیەکی گشتی لە کورەدا ئەمانە هەبوە ئەگەر
یەکێك خاوەن کورەبایە دەبا ئەمانەی هەبێ بۆ دابین کردن پێو یستیەکانی ،

**چۆنیەتی کارکردن :-**

کارکردن لەم جۆرە لایەنە بە گوێرەی رۆژگار گۆراوەو شێوەی جۆراو

خەلیفەی عەبیاسی داناوە. باسی گۆرانیو هەڵپەرکیٚی میللی کردوە، دەربارەی جووڵانەوەی ئەدەبی رۆژنامەنووسی لە ساڵانی (١٨٣٤ – ١٨٣٥) دا وتاری بڵاو کردۆتەوە، وتاری دەربارەی ئەو شاعیرانە نووسیوە کە شیعری خۆیان ئەخوێننەوەو نارەزایی لەم بارەیەوە دەربڕیوە، باسی مێژووو پەرەسەندنی ئەدەبی رووسی سەردەمی خۆی نووسیوە، بێجگە لەمانەش ئەو نامانەی لە کاتی جیاجیادا ناردوونی بۆ برادەرو ناسیاوانی جیٚیەکی ئێجگار بە نرخیان لە ئەدەبی نامە نووسینی روسیای سەدەی نۆزدەهەمدا هەیەو لە ژیانی خۆیدا زوربەیان چاپ کراون و بەشێکی کەم لەو نامانەی کاتی خۆی بڵاو کراونەتەوە لە لاپەرە (٢٥٩ – ٤٢٨)ی بەرگی (٦) ی بەرهەمە هەڵبژاردەکانی نووسەردا لە ١٩٥٢دا لە مۆسکۆ چاپکراون. نموونەی بەرزیو نەبینراوی نامە نووسینیان تێدا دەرئەکەویٚ.

هەروەها بێجگە لەو بەرهەمانەی کە بە نموونە هێنامانەوەو لیٚیان دواین، بەرهەمێکی ئێجگار زۆری بەجیٚ هێشتوە کە لە ریزی هەرە پێشەوەی ئەدەبی چیرۆکی کلاسیکی روسیای سەدەی نۆزدەهەمدان.. لەمانە لووت، شەقامی نێفسکی، عەرەبانە، رۆما، ژن هێنانو زۆریتر.

ئەمەبوو بە کورتی، ئەی خوێندەواری بەرێز، ژیانی ئەم نووسەرە بەرزە.. هیوادارم توانیبێتم کەمێك بە بەرێزتانی بناسێنم...

* * *

پەراوێزەکان

١- ئینسیکلۆپێدیای گەورە – چاپی پێتەربورگ ساڵی ١٩٠٢ بەرگی «٧»، ل (٩٢ – ٩٣). بە رووسی.
٢: نامەکانی گۆگۆل، بەرگی «١» ل «٦٨»
٣- پێتەربورگ: لینینگرادی ئێستاو پایتەختی ئەوسای روسیا
٤- بەرهەمە هەڵبژاردەکانی گۆگۆل لە شەش بەرگدا، بەرگی شەش، ل «٢٢٠» موسکۆ «١٩٥٢» بە رووسی.
٥- هەمان سەرچاوە، ل «٢٥٠ – ٢٥١»
٦- بیلینسکی: بەرهەمە هەڵبژاردەکان ل (٨٨٠ – ٨٩٠)ساڵی «١٩٤٩»، مۆسکۆ. بەرووسی.
٧- چیرۆکی «پاڵتۆ» ی گۆگۆل لە لایەن مامۆستا جەمال نەبەزەوە کراوە بە کوردیو لە ساڵی ١٩٥٨ دا لە بەغدا چاپ کراوە.
٨- پاڵتۆ، ل. «١٦٩»، بەرگی «٣»ی بەرهەمە هەڵبژاردەکانی گۆگۆل، مۆسکۆ– «١٩٥٢».
٩- هەمان سەرچاوە، ل «١٧٣»
١٠- هەمان سەرچاوە، ل «١٦٣»
١١- هەمان سەرچاوە، ل «١٦٥»
١٢- هەمان سەرچاوەو شوێن.
١٣- پێترۆف: پێشەکی بەرهەمە هەڵبژاردەکانی گۆگۆل لە شەش بەرگدا. بەرگی «١». ل ١٦، مۆسکۆ– ١٩٥٢
١٤- پۆرترێت، ل «٩٩» – بەرگی «٣» ی بەرهەمە هەڵبژاردەکانی گۆگۆل، مۆسکۆ «١٩٥٢»
١٥- هەمان سەرچاوە، ل «٩٨»١٦– زۆر بە پەرۆشەوە دەستم کرد بە وەرگێرانی ئەم چیرۆکەی گۆگۆلو لە ماوەیەکی کەمدا تەواوم کردو ویستم بڵاوی بکەمەوە، بەڵام ئەوەم بیر کەوتەوە کە مامۆستا «ئارام قەرەداغی» هەمان چیرۆکی لە ئینگلیزییەوە وەرگێراوەو لە ژمارە «٣٢» ی گۆڤاری «کاروان» دا بەناوی «رۆژ ژمێری شێتێك»ەوە بڵاوی کردۆتەوە کە دووبارە بە «چاوی مشتەری» یەوە وەرگێڕراوەکەی مامۆستا ئارام خوێندەوەو لەگەڵ دەقە روسییەکەدا بەراوردم کرد پڕ بە دڵ ئافەرینم لە مامۆستا کرد کە بە شێوەیەکی نایابو بیٚ دەسکاری وەری گێڕاوەو جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ روسییەکەیدا، بۆیەجاریٚ ئەوەی خۆم وەلاوە ناو بڵاوم نەکردەوە.
١٧- یادداشتی شێتێك بەر هەمە هەڵبژاردەکانی لە شەش بەرگدا، بەرگی «٣»، ل «٢٢٤» مۆسکۆ ١٩٥٢
١٨- هەمان سەرچاوە. ل «٢٢٥»
١٩- هەمان سەرچاوە. ل «٢٢٩»
٢٠- هەمان سەرچاوە. ل «٢٣٥»
٢١- هەمان سەرچاوە. ل «٢٢٣»
٢٢- هەمان سەرچاوە. ل «٢٣٦»
٢٣- هەمان سەرچاوە. ل «٢٣٧»
٢٤- هەمان سەرچاوە. ل «٢٣٨»
٢٥- هەمان سەرچاوە. ل «٢٣٩»
٢٦- هەمان سەرچاوە. ل «٢٤٢»
٢٧- پشکنەر، ل «١١٣»ی بەرگی «٤» ی بەرهەمە هەڵبژاردەکانی گۆگۆل، مۆسکۆ «١٩٥٢»
٢٨- هەمان سەرچاوە. ل «٣٦٢»
٢٩- هەمان سەرچاوە. ل «١٠٠»
٣٠- هەمان سەرچاوە. ل «٣٣٨ – ٣٣٩»
٣١- نامەیەکی گۆگۆل بۆ «سێکین»ی دۆستی «٢٩»ی نیسان ١٨٣٦
٣٢- نامەیەکی گۆگۆل بۆ «م. ب. گۆگۆل» خوشکی، بەرگی شەشی بەرهەمە هەڵبژاردەکانی گۆگۆل، ل «٢٨٢»، مۆسکو «١٩٥٢»
٣٣- «تاراس بوولبا». ل «٤١»، مۆسکۆ ١٩٥٢
٣٤- هەمان سەرچاوە. ل «٧٩»
٣٥- هەمان سەرچاوە ل «٨٦»
٣٦- هەمان سەرچاوە. ل «٨٩– ٩٠»
٣٧- گۆگۆل: گیانە مردوەکان ل «٥٠٧»، مۆسکۆ «١٩٥٢»
٣٨- هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.
٣٩- ئەویەشە لە چاپی مۆسکۆی «١٩٥٢» دا لاپەرە «٢٦٤ – ٣٣١» ی گرتۆتەوە، گۆگۆڵ هەتا ناوی کەپیتانیشی بەمەبەست دەستیشان کردوە، چونکە وشەی «کۆپێکین» لە «کۆپێك» ەوە وەرگیراوە کە یەك لەسەر سەدی رۆبڵێکی روسییە. واتا بەستوویەتیەوە بە پارەوە.

٤٠- گیانە مردووەکان: ل «٥٠٨»
٤١- هەمان سەرچاوە. ل «٢١٠»
٤٢- هەمان سەرچاوە. ل «٣٥١»
٤٣- هەمان سەرچاوە. ل «٣٥٤»
٤٤- هەمان سەرچاوە. ل «٣٨»
٤٥- هەمان سەرچاوە. ل «٤٢٢»

به دواوه لەوێ کرێ زیادی کردوە بۆتە دینارێك . هەر وەها ئەم شاگردە دەڵێ لەساڵی (١٩٥٨) هەموو شاگردو خاوەن پیشەکانی هەولێر هەر لە سەفارچی و چەخماخ‌سازو ئاسن‌گەرو کورەچی و لبادکەر) ئەمانە هەمووی بوەیەك‌و سەر بە جفاتەوە بوو ، هەر وەها دەڵێ سەرۆکی بەشی ئێمە واتە ئاسن‌گەری (وەستا عیزەت بەدرەدین) لەگەڵ (مەلا تاهیری تەنەکەچی بوون) سێ چوار مانگ ماینەوە لەدوایی جفات نەماو تێك‌چوو لەبەر ئەوەی خەڵکەکە زۆر بە باشی رێك نەبووبوو ژمارەشمان واتە هی شاگردەکان بە هەموو بەشەکانەوە (١٠٠) کەس دەبوین

**کەل‌و پەلە دروست کراوەکان**

بێگومان چەند کەل‌و پەلێك لە کورەی ئاسن دروست دەکرێ کە هەر یەکەش بە گوێرەی رۆڵی خۆی پێویستیەك لە پێویستیەکانی کۆمەڵ پردەکاتەوە گرنگ‌ترین ئەم کەل‌و پەلانەش ئەمانەن .

(گاسن ، داس ، باڵتە ، پیمەرە ، کورینگ ، قەرانگ ، قەرەمی لێدانی‌بیر ، پیشەقان ، بیور ، سەڵکەتەوشو ، تەورداس ، دوو دەم)

**گرنگ‌ترین خاوەن کورەکان .**

بە گوێرەی رۆژگارو سەردەم گەلێ خاوەن کورەی ئاسن هەڵکەوتون لەمانەش پێ‌بەپێ هەندێکیان لەگەڵ گێژەلوکەی سەردەم پوکاونەتەوەو لەناو چون هەندێکی تریشیان مردون‌و نەماون هەندێکیش پیشەکەی گۆریوە . بەڵام پێویستە ئەوە بگوترێ کە کورەی ئاسن هەر لەشاردا نەبووە بەڵکو لە گوندەکانیش هەبوە . لەمانەش (وەستا محمد شێخۆ ، حاجی توفیق عەبدول واحد ، وەستانامق رەفیق محمد ، حاجی‌ونس حاجی ئیدۆش ، حاجی عەباس ئیدۆش ، وەستانامیق‌شێت ، وەستاعەبو چاورەش ، حاجی شیخ ونسەشەل ، وەستاسابیرفتح الله ، حاجی خدر ئیدۆش) .

ئەمانە زۆربەیان لەسەردەمی زوو لەم سەدەیە خاوەن‌کورە بوونە لە هەولێر ئێستا هیچیان نەماون ، بەڵام چەند کەسانێك هەیە ماون‌و ئێستا لەبەر بێکاری وازیان هێناوە کە تەمەنیان لەنێوان (٦٥ - ٧٠) ساڵی دەبێ ، لەمانەش ،

١ = سەید جەلال کەریم

٢ = سەید سەعید کەریم

٣ = وەستا تەها عەبدوڵلا

بەڵام ئەوانەی لە گوندەکان خاوەن کورەبون ئەمانەن .

١ = حاجی قادر لە گوندی سۆربەش

٢ = حاجی سەعید لە گوندی زەمزەموك

٣ = حاجی مستەفا لە گوێر

٤ = حاجی ئەحمەد لە دیبەگە

٥ = حاجی حەمدی لە گوندی عاڵلا

هەر وەها لەوانەیە لە چەند گوندو شوێنی تریش هەبووبێ ، بەڵام ئێمە پێی‌نەزانیوە پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەم جۆرە پیشەیە هەر لەم ناوچەیە باوی نەبووە ، بەڵکو بەگوێرەی سروشت‌و پێویستیەتی ناوچەکان رێژەی خۆی وەرگرتوە ، بۆیە ئێمەش ناونیشانێکی گشتی فراوانمان داوەتە بابەتەکە هەر چەندە خۆشی زیاتر باری ناوچەیی پێوە دیارە ، بێگومان ئەمەش دەگەرێتەوە سەر ئەوەی کە شارەزایمان لەهەموو ناوچەکانی کوردستان نی بە لەم بارەیەوە ، بەڵکو ئەمەش دەگەرێتەوە سەر ئەو کەسانەی کە لەناوچەی خۆیان شارەزان‌و لەنزیکەوە ئاشنایی‌یان لەگەل بابەتەکە هەیە . بۆیە ئێمەش داوا لەو کەسانە دەکەین کە هەریەکە بە گوێرەی توانای لە دەرخستنی ئەم جۆرە بابەتان لە ناوچەکەیا درێغی نەکا . کە پێشك بەم تەرزە کارەی شوناسنامەی رەسەنایەتی‌و نەمری بۆ کەلەپوری نەتەوەکەی دابین دەکا کە ئەمەش کارێکە تەنیا شایستەی ئەو کەسانەیە کە دڵسۆزی ئەم هەوارو بەهارەن .

فەرهەنگۆك

١ = ریزپەر : شاذ

٢ = ژوورگە: مدخل

**سەرچاوەو پەراوێزەکان**

١ = مێژوی میرانی سۆران ، حسین حزنی موکریانی ، چاپخانەی کوردستان. ١٩٦٢ . ل ٤٩

٢ = هەمان سەرچاوە . ل ٥٤

٣ = دمدم ، عەرەب‌شەمۆ ، شوکور مستەفاکردویە بە کرمانجی‌خوارو ، چاپی دوەم ، چاپخانەیکۆری زانیاری کورد ، ساڵی ١٩٨٤ ، ل ٢٧

٤ = هەمان سەرچاوە . ل ١٩٨

٥ = الطبقة العاملة العراقية التكون وبدايات التحرك . الدكتور كمال مظهر أحمد . دار الرشيد . ١٩٨١ . ص ٦٨

٦ = دوو سەردان بۆکورەی (سەیدجەلال‌کەریم) لە رۆژانی ٣ / ٧ / ١٩٨٦ . ١٥ / ١١ / ١٩٨٦ ، چاوپێکەوتن لەگەڵ شاگردەکەی وەستا محی الدین محمد.محی الدین . کە لەدایك بوی ساڵی (١٩٣٣)یە . زانیاریەکانیش لەزاری ئەم دوو زاتە وەرگیراوە .



# دوو بانگەواز

لیژنەی فۆلكلۆر لە بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێر ، بە هاوكاری لەگەڵ لێپرسراوانی گۆڤاری «كاروان»دا لەم دواییەدا بریاری ئەوەیان داوە ژمارەیەكی گۆڤاری «كاروان» تەرخان بكەن ، بۆ ئەوەی تایبەت بێت بەباس و بابەت و نووسین و لێكۆڵینەوەی **هەمە جۆری فۆلكلۆری كوردی** ، ئیتر بۆ ئەوەی بتوانین بە زووترین كات ئەم پرۆژەیە بە ئەنجام بگەیەنین و ، خزمەتێكی مەزنیش پێشكەش بە فۆلكلۆرو كەلەپووری نەتەوەكەمان بكەین ؛ داوا لە هەموو ئەو خوشك و برا نووسەرو فۆلكلۆر دۆستانە دەكەین كە هەر بابەت و باس و نووسینێكیان بە ئامادە كراوی لەبەر دەستدایە ، وەیا لەمەودوا دەینووسنەوەو ئامادەی دەكەن ، بە زووترین كات بۆ ئەم ناونیشانەی خوارەوەی بنێرن ، بۆ ئەوەی بتوانین بابەتە بریار لەسەر دراوەكان لەلایەن لیژنەی فۆلكلۆرەوە بدەین بە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری كاروان ، تاوەكو ئەوانیش لەرووی هونەرییەوە رای تایبەتی خۆیان و ، باری سەرنجیان دیاری بكەن .. هیوادارین بابەتەكانیش بەپێی ئەم خاڵ و مەرجانەی خوارەوە ئامادە بكرێن ..

● مەرجەكان ●

**یەكەم** :نووسینەكە لە «٣٠ تا ٣٥» لاپەرەی قەبارە گەورەی دێر پەریو زیاتر نەبێت .

**دووەم** :نووسینەكە بەخەتێكی خۆش و ، بە قەڵەمی پاندان نووسرابێتەوە .

**سێیەم** :زیاتر ئەو بەرهەمانە پەسند دەكرێن كەلەشێوەی باس و لێكۆڵینەوەی فۆلكلۆری دابن .

**چوارەم** :زیاتر بایەخ بەو نووسینانە دەدرێ كە دەربارەی فۆلكلۆرو كەلەپووری رەسەنی كوردی بن و ، مەرجی بڵاوكردنەوەیان تێدا بێتە دی ؛ وەك دەستنیشان كردنی سەرچاوەو ، شوێن و ، ناوو تەمەنی ئەو كەسەی بابەتەكەی لێوەرگیراوە .

**پێنجەم** :هەر بابەتێك پەسند نەكرێت بۆ بڵاوكردنەوە، نادرێتەوە دەست نووسەرەكەی .

**شەشەم** :دوا كات بۆ وەرگرتنی باس و بابەتەكان رۆژی «٣٠»ی تشرینی دووەمی ئەمساڵەو ، ئەنجامی بڵاوكردنەوەو ، بڵاونەكردنەوەی بابەتەكانیش بە نووسراوی تایبەتی رادەگەیەنرێ .

**حەوتەم** :بابەتەكان بۆ ئەم ناونیشانە دەنێردرێن :

«أربيل ـ مديرية الثقافة الجماهيرية ـ لجنة الفلكلور الكردي ـ العدد الخاص من مجلة كاروان» ..

**لیژنەی فۆلكلۆری كوردی**

**لە بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر**

**لە هەولێر ..** ١٨/٩/١٩٨٨



لیژنەی فۆلكلۆر لە بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێر ؛ كە سەر بە ئەمینداریەتی گشتیی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی كوردستانە ، لە كۆبوونەوەی سێیەمیدا بریاری داوە لە ناوەراستی مانگی كانوونی‌یەكەمی‌ئەمساڵدا دیدارێك بۆ فۆلكلۆری كوردی لەشاری هەولێردا سازبكات ؛ بۆ ئەنجامدانی ئەم كارەیش داوا لەو خوشك و برا بەرێزانە دەكەین كە ئارەزووی بەشداربوون دەكەن ، بەزووترین كات بابەت و باس و لێكۆڵینەوەكانیانمان بەم ناونیشانەی خوارەوە بۆ رەوانە بكەن ..

جا بۆ ئەوەی دیدارەكە بە شێوەیەكی سەركەوتوو ئەنجام بدەین ، داوا لە هەموو لایەك دەكەین ئەم چەند خاڵەی خوارەوە پەیرەو بكەن و ، بەشداری‌یەكی چالاكانەشمان لەگەڵدا بكەن .

● مەرجەكان ●

**یەكەم** :دەبێ بابەتەكە ، یا باسەكە دەربارەی فۆلكلۆرو كەلەپووری كوردی بێت و ، بریتی لە لێكۆڵینەوەیەكی تێرو تەسەل و ، چرو پڕ ..

**دووەم** :باسەكە لە «٤٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی دێر پەڕیو زیاتر نەبێت .

**سێیەم** :چاكتر وایە باسەكان هەموو لایەنەكانی فۆلكلۆری كوردی بگرنەوە ؛ وەكو ئەفسانەو ، حیكایەت و ، شیعرو ئەو بابەتانەی لە تەوەری فۆلكلۆردا دەخولێنەوە .

**چوارەم** :چاكتر وایە باس و بابەتەكان بە خەتێكی جوان و رێك و پێك نووسرابنەوەو ، بە دوو نوسخە بنێردرێن.

**پێنجەم** :دوا كات بۆ وەرگرتنی باس و بابەتەكان رۆژی «٢٠»ی تشرینی دووەمی ئەم ساڵە ..

**شەشەم** :باسەكان بەم دوو ناونیشانە دەنێردرێن :

١ـ اربیل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب مجلة كاروان لجنة الفلكلور الكردي .

٢ـ اربیل ـ مدیریة الثقافة الجماهیریة لجنة الفلكلور الكردي .

**حەوتەم** :رۆژی «١٩٨٨/١١/٣٠» ، ئەنجامی باس و بابەتەكان بە نووسراوی تایبەتی بە نووسەرەكە ، یا بەشداری دیدارەكە رادەگەیەنرێ .

**هەشتەم** :هەر گۆڕانێك لە دیدارەكەدا بكرێت لە كاتی خۆیدا بلاودەكرێتەوە ..

**نۆیەم** :بۆ زیاتر ئاگادار بوون دەتوانرێ پەیوەندی لەگەڵ ئەم دوو تەلەفۆنە بكەن :

١ـ رۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێر / ٢٨٥١٢ لیژنەی فۆلكلۆری كوردی .

٢ـ ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان / ٢٠٨٨٢ ژووری «٤٢٤» ..

**لیژنەی فولكلۆری كوردی**

**لە بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر لە**

**هەولێر** .. ١٩٨٨/٩/١٨



## بۆ ئاگاداری

خوێنەرە ئازیزەكانی «كاروان» ئاگادار دەكەین ، كە لەبەر هەندێ كێشەو گیروگرفتی چاپەمەنی دوور لە ئیرادەی كارگەرانی گۆڤارەكەمان : ناچاربووین ئەم ژمارەیەی كاروان ، بە ژمارەی دوو مانگ واتە« تشرینی یەكەم و تشرینی دووەم » ـ لە قەڵەم بدەین ، لە هەمان كاتیشدا بەڵێنی ئەوە دەدەین كە هەرچی لە تواناادا هەبێ بیكەین ، بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە دووبارە نەبێتەوەو ، داوای لێ بووردنیش لە هەموو لایەك دەخوازین ..

« **كاروان** »

# سەرەتای خوڵقان لە دەقەکانی کوردیدا

طارق جمباز

مرۆڤ هەر لەكۆنەوە بەرامبەر بەم گەردوونە بەر فراوانە تووشی سەرسامی و رامان و پرسیار كردن بووە ، بۆیێ كەوتۆتە ووردبوونەوەو پەروەرشی خەیاڵ سەبارەت بەچۆنیەتی خوڵقان پەیدا بوونی دیاردە بەرچاوو نادیارەكان ، هەر میللەتەو بۆ چوونێكی تایبەتی هەبووە بۆ ئەم بیرۆكە ئەزەلیە بزاڤی ئەستێرەكان و داهاتنی شەوو رۆژو لافاوی گەورەو بوومەلەرزەو هەورەتریشقەو دیاردە سروشتیەكانیتر ، ئەوانە هەر هەموویان بۆ مرۆڤی سەرەتا سەیرو سەیرەنگێز بووە ، هەر هەمووشیان لە ئاستی ئەقڵ و ئاوەزی ئەوان بەرزتر بوون ، بۆیە زۆر جاران پەنایان بردۆتە بەر ئەفسانە بۆ شیكردنەوەو تۆژینەوە ، بوونەتە هۆی خەیاڵ پەروەری ئەوانەوە، زۆر جاریش مرۆڤ بۆ چوونی ئەفسانەیی خۆی تێكەڵ بە بیرو باوەری ئاینی كردووە بۆ ئەوەی بگاتە كەناری دڵنیایی سەبارەت بەمەسەلەی خوڵقان و هاتنەكایەوەی بوون چۆنیەتی پێكهاتنی ، مرۆڤ هەمیشە كەڵكەڵەی ئەوەی لە مێشكا بووە كە دونیا چتۆیی خوڵقاوەو چۆن چۆنی گۆڕاوە ، ئەمانەو گەلێ شتی تریش بوونەتە هۆی ئەوەی كە بیر بكاتەوەو لەبارەی خولقان دا بكەوێتە نووسینەوە ، هەڵبەت زەوی چ شاخاوی بێت یا دەشتایی ، جەنگەڵ بێت یا رۆخ دەریا .. مایەی سەرسامی بووە .. ئەمانەش هەمووی سەبارەت بەوە بووە كە بتوانێ دەست بەسەر ئەو سروشتە پان و بەرینەدا بگرێت و لەگەڵ پێویسیەكانی خۆیدا بیگونجێنێ، میللەتی كوردیش لەم رووەوە بێ بەش نەبووە لە نووسینەوەی «سەرەتای خوڵقان» ، خاوەن دەق و ستوونی خۆیەتی ، خاوەن راڤەكردن و شیكردنەوەی خۆی بووە .

لەوەتەی بە بیرم دێ خولیاو ماندووی دوای دەقێكی كوردی بووم لەسەر مەسەلەی داهاتن و خوڵقان لەنێو كورددا دەمگووت تۆ بڵێی ئێمەی كوردیش وەك میللەتانی جیهان خاوەن بۆ چوونێكی تایبەت بە خۆمان نەبین لەسەر چۆنیەتی خوڵقان ؟ بۆ ئەم مەبەستە هەرچی پیرو بەساڵا چووی شارەزام شك دەبرد دەچوومە لای یاخود ئەو كەسانەی بەدوای زانیاریدا دەگەڕان لێیانم دەپرسی بەڵكو شتێكی لەم بابەتە بڵاوكرابێتەوە ، بەڵام هەمیشە هەناسە ساردو نامراد بووم ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لە گەڕان و سۆراخ دا بووم و هیوابڕاو نەبووم ، ئەم باسە ببوو بە وێردی سەر زارم ، هەمیشە دەمگوت ناچێتە مێشكمەوە ، كوردیش دەقێكی لەسەر

زۆر جار هێزێك لەسەر شێوەی ئەهریمەنێ
دەیەوێ چۆکی نوێژم
بۆ خوایێکی ئەفسانەیی پێدا بدا
بۆشاییەکانی ناو چۆکم
بە بۆشای پڕ نابنەوەو
بە بۆشایش ناچەمنەوە
زۆر جار شتێك بە نوێنەری رووناکییەکان دێتە پێشم
دەیەوێ لە پێناوی ئەو بتە چاو هەتاویانەی بێ خوا دەژین
خۆم داخەم و خۆم داگیرکەم
لە دێر زەمانەوە خەڵك بێ پێغەمبەر
لە رەگی درەختەکان دەروان
بێ خواش دەژیان
کەچی دەژیان
نەبە ژیان ، خوایەکانی ژیان ، قڕی کردن
نە بە خوایەکانی مردن
لە پێش نوێژەکاندا کوژران ...

کەس مافی لە ناوبردنی خۆی لە دەست نییە
چونکە مردنیش بە ئارەزوو بۆ ئازادی قەدەغەیە

نابێ مرۆڤ خۆی بکوژێ
چونکە هەن هەر بە رۆیشتن ، هەر بە پێوە
کوژران دەکەن بە پێکەنین
زینی سوارچاك
لە کادینێکی بێ دیوار
بەر لە ئاهەنگی راپەڕین
خۆی دەداتە بڵندایی یەکەم پشمین
لە نووستندا ، دیوار رەسمی خۆی دەکێشێ
چەقۆی خەیاڵ
وێنە نووستووەکان لە خەوی

پەنجە بێدارەکانی خۆی هەڵدەستێنێ
زامی ئەسپ
لەدایك بوونی سەفەری ، مێژووی بەردو
تابووتی نیشتمانێکی نەنووسراوە !..
هەموو رۆژێ
بەشێوەیەك لەسەر نووکی خەنجەر دەرۆن
لەشی خۆیان لەبەر دەمم دادەکوتن !..
ترسنۆك نیت
بەڵام ناتەوێ بۆ شکۆی هێزو تاوان ..
سەرت داخەی
بە هەست ناسکیەوە ئەوەندە پێوەندی
هەموو لەشت ترسی پیرۆزی لێ دەروێ
هەموو رۆژێ لە ناو سەرتا
گۆرستانێك هێلانە بۆ ...
بێچووەکانی خۆی دادەنێ
رەگە شینەکانی بن پێت
گرێیە زیزەکانی سەرت دەکەنەوە
لە حەسانەوەت رۆدەچن
تاکو ئەنگوستە زکەکان لەبیر بکەی
من دەرگاکانی ژێر زەمین پێ دەزانم
هاواری رەنگاو رەنگیشم دێتە بەرگوێ
جەنگی مارو خۆڵ و ئەسپ
لە بن سەرینی ئاو دەنوون
بە نووستوویی پێستی سەری بەرد دەگۆڕن و
لە ژێر نووزەی گریانە ژەنگاوییەکاندا پێدەکەنن
مار بە کون کردنی لەشی تەواو نابێ
دەستی پێشەوەت لەسەر پشت
بۆ چاو قووچانێی مندالە شووشەییەکانی خاك راخە
تابلۆی دەستت ناشێوێنن

خۆ دزینەوەو ڕەسمی بڕیت ئاشکرا ناکەن
ئەگەر درەختیش دابنیشێو
بەردیش بە زۆر بێتە زمان
خەیاڵی مار، ناچێتە ژێر زەمینەکان
هاتووچۆ کردن لە شوێنە جەهەننەمیەکانی خەیاڵ
هونراوەییکی گەورەیە
بۆ هەموو لەناو چوونێک خۆڵ
نابێتە بەخشین و مەمك
دەروزەکردنیش لە ژێر نووکی چەقۆ
خامۆشیەکی چاوەڕوانە ، ڕازی نی‌یە
ئیشکی سەرم
ماندووی بکا
چونکە ترسە پێ گرتووەکان
بە تارمایی‌یەکان گەیون و
ئیشکیش بە ئاوان دەژمێرن ...
کە سوار دەگلی
ئەسپیش لە ترسا پەك ڕکێف و بەشەرمەوە
لەناو هێلەکانی بارەش
لەپشت ڕێ‌یە چەماوەکان
ڕەشماڵی میرنشینی خوی دادەکوتێ
ڕقی گەورەی لە ئاگرە و کەچی حەز بە سوتان دەکا !...
لەناو یادە لەبیرچووەکاندا دەگەڕێ
کە قسە کردنیش لەگەڵ ، بیرچوونەوە
خەتەرێکی زۆر گەورەیە
چاو هەزارەها هەتاوی بیرچوونەوەی

ئیادا دەرزێ ...
خوم بۆ خۆڵەمێشی شیعر هەڵبژاردوو
سەری ماندووم بە زیندوویی
خستۆتە سەر دەستەکانم

چونکە لە ئاوێنەوە خوا
دێتە بەر پەنجەرەی بیرم و
لەناو ترسە هوشیارەکانمدا دەژی

وەرن لەناو دەستم بژین
لەوێ دەزانن دەستی من ، چەندین ڕووداوی کپ کراوو زنجیر
نامەی
ژەهری بەهرەو
بەرەشیعری نەنووسراوو زیندووی تیایە ...
دەستە سەرخۆشەکانم وەك
پارچە بەردێکی سەربراو ، دەگرمە کۆش
بەیانیان زوو ، لە نزیکەوە
دەنگە دەنگی خوام گوێ لێ‌یە
لەشم لە هێلانەیێکی بچووکتر لە خۆم
باڵ کەوتووە
چاوم بارگەیێکی قورسی نێو سەرمە
ئەو سەرە کوژراوەی هەمیشە
لە دوورەوە سەفەری خۆی
لە پەنجەرە نزیکەکان داگیر دەکا
کێ هەیە دوای شەهید بوونم
گیان بدا بە لەشی شیعرە لەدایك نەبووەکانی من
کێ هەیە لەدوای لەناو چوونم
وەك خۆم دەمویست
بە داگیرساندنی سەرم بیم بە خۆڵ
لە پێناوی لابردنی تەم و مژی تەواو بوونم

لە دووا قوناغ
کێ هەیە لە جیاتی من و لە باتی خوێن ڕژانی من ببێتە سوراغ
بۆ زانینی هۆیەکانی شەهید بوونم



# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

**هەولێر** دژوار

**هەڵبژاردن**

لە رۆژانی ٣ـ١٩٨٨/٨/٤ یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کوردلقی کوردستان کونگرەی دووەمی خۆی لەشاری هەولێردا سازکرد ، لەو کۆبوونەوەیەدا (١١٤) ئەندام ئامادەبوون سەرەرای نوێنەرانی لقی بەسرا ، بابل ، بەغدا هەروەها نوێنەرانی مەکتەبی رۆشنبیری تورکمان و سریانی .

**بەیانی رۆژی ٩٨٨/٨/٣ دانیشتنی یەکەم**

★ راوەستان لەسەرگیانی شەهیدان .

★ وتارێك لەلایەن بەرێز سیروان جاف سەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندنی ناوچەی کوردستان .

★ وتاری یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لقی کوردستان لەلایەن بەرێز محمد بدری خوێندرایەوە .

★ کۆمەڵێك بروسکەی پیرۆزبایی ..

ئەوەی شایانی باسە لە دانیشتنی دووەمی سەر لە بەیانی مامۆستا (عبدالأمیر معله) جێگری وەزیری رۆشنبیریو راگەیاندن ، سەرۆکی یەکێتی گشتی ئەدیب و نووسەرانی عێراق وتارێکی خوێندەوە .

دوابەدوای ئەمە بەرێزان محمد بدری ، کریم فندی ، صلاح شوان بانگ کران بۆ بەردەم مایکرۆفۆن .. سەیدا کریم فندی راپۆرتی رۆشنبیری خوێندەوە . ئینجا کاك صلاح راپۆرتی داراییو ئیداری خوێندەوە . دوابەدوای ئەمە بەرێز دکتۆر عبدالستار طاهر شریف کرا بەسەرۆکی دانیشتنەکان و بەرێزان تیلی امین و سعدالله پەرۆشیش بوون بەبریاردەرو ئەندام.

ئیتر هەردوو راپۆرتەکان لەلایەن ئامادەبوانەوە گفتوگۆی لەسەرکراو چەند خاڵێك ئاراستەیان کرا ، ئەوانیش واتە بەرێزان شوان ، فندی ، بدری یەکە یەکە وەڵامیان دانەوە . لەکۆتاییدا چەند لیژنەیەکیان پێك هێنا وەکو : لیژنەی سکاڵا بەسەرۆکایەتی

مامۆستا حسین جاف لیژنەی پێشنیار بەسەروکایەتی بەرێز ئەمین نەقشبەندی لیژنەی گۆڤاری نووسەری کورد بەسەرۆکایەتی مامۆستا عبدالرزاق بیمار . لیژنەی رێك کردن بەسەرۆکایەتی مامۆستا عبدالوهاب تاڵەبانی .

لەدانیشتنی ئێوارەدا لیژنەکان راپۆرتی خۆیان پێشکەش کردو گفتوگۆی لەسەرکراو ، ئەم بریارانەیان دەرکرد :

١ـ پێویستە دەستەی نوێ پرۆگرامێك دابنێ بۆئیشوکاری داهاتووی یەکێتیو بڵاوکردنەوەی لە گۆڤاری نووسەری کوردو رۆژنامەکانی دیکە .

٢ـ هەوڵدان بۆ بەستنی دارایی یەکێتی بە دەزگاکانی کوردستان و دابەش کردنی بەسەر لقەکانی هەولێر ، دهۆك ، سلێمانی .

٣ـ وەرگرتنی ئەندامانی نوێ بەپێی پەیرەوو پرۆگرامی یەکێتی.

٤ـ پەیوەندی کردن لەگەڵ دەزگا رۆشنبیریەکان بۆ











بلاوكـردنـەوەی بەرهـەمـی ئەدەبیو رۆشنبـیری ئەدیب و نووسەران .

٥ـ بەشداری کردنی ئەدیب و نووسەران لە میهرجانی میربەد بە شێوەیەکی فراوان تر .

٦ـ دەرچوونی گۆڤاری نووسەری کورد بەشێوەیەکی رێك وپێك . سەرەرای چەند خاڵێکی دیکە .

لە ئەنجامی هەلبژاردن ئەم بەرێزانە بوون بەدەستەی نوێ : ئەحمەد سالار ، محمد بدری ، دکتۆر نافع ئاکرەیی ، صلاح شوان ، عبدالوهاب تاڵەبانی ، حسین جاف ، سعیدیحی . بەرێزان عبدالکریم فندی و عبدالرزاق بیمار ئیحتیات .

## کۆرێکی فولکلۆری

لێـژنـەی کەلەپـوورو فۆلکلۆر لە بەرێـوەبـەرایـەتی رۆشنبـیری جەماوەر کۆرێکی بەناونیشانی (بەسەرکردنەوەی بەرهـەمـە فۆلکـلۆری‌یـە چاپکـراوەکـان و کۆرو چالاکی فۆلکلۆریەکان لەماوەی ساڵی ١٩٨٧ی ، دەزگا رۆشنبیری‌یەکان و هەڵسەنگاندنی تەنها کتێبکیان) بۆ مامۆستا عومەر ئیبراهیم عەزیـزی فۆلکلۆر پەروەر سازکـرد . ناوەرۆکی باسەکەی کاك عومەر بەم جۆرە بوو :

بەرایی یاسەرەتایەکی پێویست ، یەکەم لەگەڵ بەرهەمە فۆلکلۆری‌یە چاپکراوو یارمەتی دراوەکانی ئەمینداریتی گشتی

رۆشنبیری‌و لاوان هەندێکیان ئەمانەن : یاریێت کوردی ، فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە ، ئەفسانە .. لاوك .. گۆرانی لە فۆلکلۆری کوریدا ، ستـرانێت شەڤەرۆکا ، سترانا لێرێکی حەیرانوك ، گوڵێك لە رەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری .

دووەم لەگەڵ بەرهەمە فۆلکلۆری‌یە چاپکراوەکانی دەزگای رۆشنبـیری‌و بڵاوکـردنـەوەی کوردی : لێکـۆڵینەوە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بەزمانی عەرەبی ، چەند سترانێن فۆلکلۆری دلۆك ، هەڤال هەڤالوشکێ .

سێیـەم لەگـەڵ بەرهـەمـە فۆلکلۆری‌یـە چاپکراوەکانی نووسەران لەسەر ئەرکی خۆیان چاپکراون : پەندی پێشینانی کورد بەرگی دووەم ، تێکستی چەنـد هەڤـایەتێکی فۆلکلۆری کوردی .

چوارەم لەگـەڵ کۆڕە فۆلکلۆری‌یەکانی شاری هەولێر ، دهـۆك ، سلێمانی لە هەولێر ئافرەت و دڵداری لە دوولاوك دا بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەر ئێوارەی ١٩٨٧/٣/٤ بۆ کاك ئەسعـەد عەدۆ . پەنـدو ئیـدیـۆم دەزگـای رۆشنبـیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی لەرۆژی ٩٨٧/٣/٩ بۆ کاك عومەر فارس محەمەد . لە دهۆك کاوێس ئاغایێ نەمر دکۆرەکی‌دا ژچالاکیێت دەزگـەهـا رەوشــەنبـیری‌و بەلاڤکـرنـا کوردی ل رێکـەوتی ١٩٨٧/١/٧ ژلایێ مامۆستایێ جەلال مەلا حەسەن خۆشناو . لەعلیخـانـا گوڤـەیی ل کوچکا نفیسەڤانێت کوردی ژبزاڤێت ئێکەتیا تورەڤان و نفیسڤانێت کورد تایێ دهۆکێ ل رۆژا پێنج شەمێ ٩٨٧/٢/٢٦ بۆ هێژا کریم بیانی .
خەملا ژنا کورد و سترانێ‌دا ٩٨٧/٣/١٠ بۆهێژا حجی جعفر.
بیرو هزرێت ملی دسترانێدا ٩٨٧/٤/٢ سەیدا حجی جعفر .
کۆمکـرنـا فۆلکلۆری ٩٨٧/٤/٩ سەیـدا عبدالکریم فندی .
کۆرەك بۆ سەیدا کامیران درباس، .

پێنجـەم چالاکی تری فۆلکلۆری لە شێوەی کردنەوەی پیشـانگـاو پێشکـەش کردنی شانۆگەری لە دەقی فۆلکلۆری کوردی‌دا وەکو پیشانگای کۆمەڵەی ووردکاران و پیشەسازانی هەولێر ، پیشـانگـای ناڤنجێت گلستـان و چرا . پیشـانگای مامۆستا فازڵ شەورۆ .

دەزگای گشتی سینەماو شانۆ تیپی نواندنی هەولێر لە ٩٨٧/٢/٢٨ لەسەر شانۆی ابن المستوفي شانۆگەری کانیێ مەڵەك رێزان ئامادەکردنی لە دەقی ناسرو ماڵ ماڵ لەلایان کاك ئەسعەد عەدۆ . هەروەها بەرنامەی تەلەفزیۆنی لەکەلەپوورەوە لەئامادە کردن و پێشکەش کردنی کاك ئەسعەد عەدۆ لە رۆژی ٩٨٧/٥/١٣ .

ئەوەی شایانی باسە بەشی دووەمی باسەکەی مامۆستا عومەر ئیبرایم تەرخان کرابوو بۆ هەڵسەنگاندنی کتێبی گوڵێك لە رەوسـەی فۆلکلۆری کوردەواری نۆبەرە بەرهەمی مامۆستا داود محمد شرۆڵ .

## میهرجانی سەرکەوتن و ئاشتی

لەبـۆنـەی قادسـیـەی صدام و هەشتـەم ساڵەی دەسـدرێـژی‌و سەرکـەوتنی عیراق و بەرپابوونی ئاشتی‌دا ، دەزگـای رۆشنبیری‌ی‌و بڵاوکردنەوەی کوردی ، میهریجانێکی فراوانی بۆ ئەم بۆنـەیە لەشاری هەولێر رێکخست و کۆمەڵێك چالاکی هەمـەجـۆری بۆ سازاندو لەوانەیش : سەر لەبەیانی





٩/٧ لەهۆڵی کاروباری کۆمەلایەتی دا میهریجانەکە کرایەوە ، لەپێشدا بەوتارێکی سەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندن بەرێز سیروان جاف کرایەوە ، ئینجا بەرێوەبەری دەزگا مامۆستا مصلح جەلالی وتارێکی دورودرێژی بە (کوردی) خوێندەوە ، لەپاشا دەس کرا بەخوێندنەوەی دەستەیەك شیعر بۆ ئەم بۆنە پیرۆزەو ئەم شاعیرانە بەشداریان تێداکرد : (جلال خۆشناو ، مەغدید ، سۆران ، محمد شوشی ، عبدالخالق سەرسام ، کامەران بەرواری ، غریب پژدەری ، فریا جاف ، تحسین مولود ، حسن تەنیا . ئینجا کاك نصرالدین مجید لێکۆلینەوەیەکی بەپێزی بەناوی (لایەنەکانی سەرکەوتن و ئاشتی) پێشکەش کردو بەمەیش کردنەوەی میهریجانەکە کۆتایی هات .

هەر لە ئێوارەی ئەو رۆژەشدا دووچالاکی هونەری سازکرا ، یەکەمیان (کردنەوەی پیشانگەی هونەرمەندانی فۆتۆگراف)و دووەمیان پیشاندانی سلایداتی کامیرای چەتۆ حەسەنی هونەرمەند لە هۆلی ابن المستوفیدا .. لەگەڵ پێشکەشکردنی گەلێ پارچە مۆسیقاو گۆرانی لە لامیەن تیپی مۆسیقای میدیاوە بەچاودێری هەڤاڵ بحری یوسف .

بۆ رۆژی دووەمیش و سەر لەبەیانی ٩/٨ دا پیشانگایەکی هاوبەشی هەرسێ هونەرمەند (فیصل ، جوهر ، چەتۆ) لەهۆلی میدیا بە سەرپەرشتی دکتۆر خەسرەو جاف کرایەوە .

بۆ ئێوارەکەیشی لەهۆلی ابن المستوفیو لە نێو شایلۆغانی حەشاماتێکی گەورەدا ، تیپی نەتەوایەتی هەولێر ، گەلێ تابلۆی جوان جوانی هونەری پێشکەش کرا .. لەپاشا هونەرمەندی ناسراو عزیز سلیم پتر لە (٢٠٠) تابلۆی رەنگینی خۆی بەسلایدات پێشکەش کردو بەمەیش کۆتایی بەم میهریجانەو لەوبۆنە پیرۆزەدا کۆتایی پێهات .

### شانۆ

مەڵبەندی لاوانی شەهید ئیبراهیم ـ تیپی شانۆی سامان شانۆگەری (تاشە بەردوو چاڵی) نووسینی فەرحان بلبل، وەرگێرانی ئیسماعیل بەرزنجی ئامادەکردن و دەرهێنانی هونەرمەند مؤید فەقێ ، لەسەر شانۆی رۆشنبیری جەماوەر پێشکەش کرد .

ئەکتەرەکان : فارس شێخانی ـ کەسی یەکەم ، تەنیا کریم ـ کەسی دووەم ، عدنان رۆژبەیانی ـ کەسی سێیەم ، وێنەی دواوەیی شانۆ میدیا ابوبکر کەرکوکی ، فرمێسك مؤید ، ناظم شێخانی ، هونەر مؤید .

کارە هونەرییەکان : بەرێوەبەری بەرهەم عبدالرحمن ادم نجم ، بەرێوەبەری هونەری سەردار عەلی ، بەرێوەبەری شانۆ صدیق کەرکوکی ، جێبەکردنی دیکۆر هونەر هەناری و صدیق ، رووناکیو مۆسیقا دەرهێنەری خۆی ، چاودێری هۆڵ ئەنوەر عوسمان ، خلیل هیدایت ، ئاری عبدالکریم ، خۆشنووس دلێر اکرم سعید .



## سلێمانی
ئازاد

● کۆڕ :

### «یادی چل ساڵەی کۆچی دوایی مێژوو نوس مامۆستا ئەمین زەکی بەگ»

له رۆژی ۱۹۸۸/۷/۹داو له هۆڵی رۆشـنـبـیری جەماوەر له سلێمانیّ : لەلایەن لقی دەزگای رۆشنبیریو بڵاو کردنەوەی کوردی‌یەوە کۆڕێکی فراوان بۆ یادی تێپەربوونی چل ساڵ بەسەر کۆچی دوایی مێژوونووسی ناوداری کورد مامۆستا «محەمەد ئەمین زەکی‌بگ» سازکرا .

پرۆگرامیٚ بەیانی‌یە دانیشتنەکە بەم جۆرە بوو :

۱ـ وتەی خۆشهاتن لە لایەن کاك «ئازاد مەحمود»ە وە .

۲ـ وتـاری مامـۆستـا «مصلح جەلالی» بەرێـوەبـەری گشتی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی : لەلایەن مامۆستا «عەبدولرەزاق بیمار»ە وە خوێندرایەوە .

۳ـ باسێك لەلایەن مامۆستا «عەبدولقادر قەزاز»ە وە .

٤ـ وتارێك لەلایەن مامۆستا «جەمیل رۆژبەیانی»ە وە ؛ کە لە بری خۆی مامـۆستـا «مستەفا ساڵح کەریم» خوێندی‌یەوە ، ناونیشانی باسەکە بریتی بوو لە «ئەمین زەکی بەگ هەمیشە زیندووەو نامریّ»

٥ـ باسێك سەبارەت ئەمین زەکی بەگ و ئەدەب لەلایەن بەرێز مامۆستا «د . عیزەدین مستەفا رەسوڵ»ە وە .

٦ـ وتارێك بە ناونیشانی «ئەمین زەکی‌بەگ داستانە ..پەیامە .. پایـەو پلەیـە لە دەروونی میللەتدا» لەلایەن مامۆستا «کەریم زەند»ە وە .

۷ـ باسێك لەلایەن مامۆستا «مستەفا حەمە بۆر»ە وە .

پرۆگرامی ئێوارە دانیشتنەکەیش بەم جۆرە بوو :ـ

۱ـ باسێك لەژێر ناونیشانی «پیرەمێردو ئەمین زەکی»دا لەلایەن مامۆستا «مستەفا ساڵح کەریم»ە وە .

۲ـ باسێکی دکتۆر کەمال مەزهەر لەژێر ناونیشانی «دەستەی دووەمی مێـژوونـووسـان»دا کە مامۆستا عەبدولرەزاق بیمار پێشکەشی کرد

۳ـ باسێـك لەلایـەن مامۆستا «مستەفا نەریمان»ە وە بەناوی «بەغدادو دواکارەساتە لەدەست چوونەکەی» .

٤ـ باسێکی مامـۆستـا «جەمال بابان» بەناوی «دیدەنی‌یەکی ئەمـین زەکی بەگ لە ساڵی ۱۹٤۷دا» کە کاك ئازاد مەحموود مستەفا خوێندی‌یەوە .

٥ـ باسێکی خاتوو لەیلان بە ناونیشانی «محەمەد ئەمین زەکی‌و بایەخدانی بە مێژووی ئافرەتی کورد» .

لەو بەرێـزانـەی بەشـداریان لە گفتوگۆدا کرد لەسەر باسەکان :ـ

مامـۆستا عەبدولرەقیب یوسف ، خاتوو لەیلان ، مامۆستا د . عیـزەدین مستەفا رەسوڵ ، مامۆستا ساڵح کەریم ، مامۆستا کەریم زەند .. و هەندێکی دی .

لەکۆتاییدا مامۆستا عەبدولقادر قەزاز لەبری خاتوو ژاڵە سوپـاسنامەیەکی بنەماڵەی خوالێخۆشبووی خوێندەوە کە بۆ ئەو لایەنانە ئاراستەکرابوو کە بوونە هۆی سازدانی ئەو کۆڕە و بەوە کۆڕەکە کۆتایی هات و شایانی باسەکە جەماوەرێکی زۆر ئامادەی بوون .

### «شانۆو کەلەپوور»

ئەمـە ناونیشانی ئەو باسە بوو کە هونەرمەند مامۆستا «ئەحمەد سالار» لە کۆڕێکدا خوێندی‌یەوە کە بەرێوەبەرێتی‌ی رۆشنبـیری‌ی جەمـاوەر لە رۆژی پێنـج شەممـە رێکـەوتی ۱۹۸۸/۷/۲۱داو لە هۆڵی رۆشنبیری بۆی سازدا

پاش ئەوەی بەرێـوەبـەری کۆڕ هونەرمەند «یاسین بەرزنجی» سەرەتـایـەکی پێویستی سەبارەت کۆڕەکە خوێندەوە مامۆستا سالار دەستی بەخوێندنەوەی باسەکەی کرد .

مامـۆستا باسەکەی کردبووە دوو بەشەوە ؛ لە بەشی یەکەمدا بەشێـوەیـەکی گشتی‌و سەبـارەت چۆنێتی وەرگـرتنی بابـەتە شانۆیی‌یەکان لە کەلەپوورەوە دوا ؛ هەر لە شانۆی گریکی لای ئەسـخـیـلیـۆس و سۆفـۆکـلیس و یوریپیـدس کە بابـەتی

شانۆییەکانیان لە ئەفسانەو داستانەگریکیەکان (بەتایبەتیش داستـان ئەلیـادەو ئۆدیسـەی هۆمیرۆس) وەر دەگرت تاوەکو سەردەمی رینیسانس و شانۆی شەکسپیرو پاشانیش شانۆی هاوچـەرخ و بەشێـوەیـەکی تایبـەتیش ئاماژەی بۆ نووسەرو هونـەرمەندی شانۆیی ئەڵمانی «برتۆڵت برێخت» کرد کە چۆن لەروانگەی فەلسەفەیەکی تایبەت و بەمامەڵەیەکی هاوچەرخانە کەلەپووری لە شانۆکەیدا تەوزیف کردووە .

خاوەن باس پێی لەوە داگرت کە مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووردا شتێکی سانـانییەو کەلەپوور وەك تیغێکی دوو دەم وایە گەر نەزانـرێ چۆن مامـەڵەی لەگـەڵدا دەکـرێ ئەوا مەبـەستەو ئەنجامەکە بەپێچەوانەوە دەکەوێتەوە .

بەشی دووەمی باسـەکـەی مامـۆستـا ئەحمەد تایبەت بوو بە کەلەپـوورو چۆنێتی سوود وەرگـرتن لێ‌ی‌و تەوزیف کردنی لە شانۆی کوریدا و تیایدا ئاماژەی بۆ یەکەم تێکستی کەلەپووری تۆمارکراو کرد کە «داستانی مەمی ئالان»ە و لەساڵی ١٩١٩دا لەژمارە (١٥)ی رۆژنامەی «ژین» لە ئەستەمبوڵ بڵاو بووتەوەو نووسەرەکەی «عەبدولرەحیم هەکاری» یە ، پاشان هاتە سەر پیرەمێردی شاعیرو پەنابردنەبەر کەلەپوور لەلای و وەکو لە «مەم و زین و مەحمـوود ئاغای شێوەکەڵ» دا دەیبینینەوە ، دوای ئەویش ئامـاژەی بۆ هەوڵەکانی مامۆستای شاعیری کۆچکردو «گـۆران» کردو دوا بەدوای ئەویش لەمەر کۆمەڵێك هەوڵدانی ترەوە دوا لەلایەن هەندێك لە نووسەرانمانەوە کە ویستوویانە کەلەپوور لەشانۆدا تەوزیف بکەن و بە پرسیارێکیش کۆتایی بە باسـەکـەی هێنـا ؛ ئەویش ئەوە بوو (ئایا کەلەپوور تا چەند خزمەتی کردووەو بە شێوەیەکی هونەری‌و هاوچەرخانە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە ؟) لەو بەرێـزانـەی بەشـداری گفتـوگـۆ بوون لەسـەر باسەکە مامۆستایان : مەحمەد فەریق حەسەن ، کامیل ژیر .زایەر مەحمود .

«ئیبسن و درامای نوێ»

هەر لەلایـەن بەرێـوەبـەرێتی رۆشنبـیری‌ی جەمـاوەرەوە لە سلێمانی و لە رۆژی ١٩٨٨/٧/٢٩دا کۆڕێك بۆ هونەرمەندی لاو «نیـاز لەتیف» سازکـرا کە تیـایـدا باسێکی سەبـارەت



نووسەری شانۆیی نەرویجی «هینریك ئیبسن» خوێندەوە بە ناونیشانی «ئیبسن و درامای نوێ» .

سەرەتـا کاك نیاز کورتـەیـەکی ژیـانی نووسەری ناوبراوی خوێندەوەو باسی نووسینەکانی سەرەتای ژیانی کرد و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە یەکەم شانۆیی‌ی «کاتالین» بوو .

پاشان خاوەن باس کارەکانی «ئیبسن»ی کردە دوو خانەوە : خانـەی یەکـەم «شۆڕشی رزگاری‌ی خود» کە ئەو شانۆییەنە دەگـرێتـەوە کەتیـایدا ئیبسن پتر بایەخی بە ئازادی‌ی خودو روحی مرۆڤ داوە؛ هەروەکو لە شانۆیی : « بیرجنت و براند » دا دەیبینینەوە خانەی دووەمیش «شۆڕشی کۆمەڵایەتی»یە کە ئەو شانۆییانە لە خۆدەگرێ کە لەمەر کێشە کۆمەڵایەتیەکانەوە دەدوێن هەر وەکو شانۆیی‌ی :-

کۆڵەکەکانی کۆمەڵ و ماڵی بووکەشووشە .. وهتد .. .

ئینجـا برای خاوەن باس هاتـە سەر «تەکنیکی دراما لە لای ئیبسن»و بەچـەند خاڵێك چەند لایەنێکی تەکنیکی‌ی شانۆی ئیبسنی خستە روو .

بەرلەوەی کۆتایی بە باسەکەیشی بهێنێت سەبارەت «ئیبسن و ئیرادەی تاکـرەوی» دواو بەمـە کۆڕەکـە کۆتـایی هات . لەو بەرێزانەی لە گفتوگۆدا بەشدار بوون :

مامـۆستـا مـحـەمـەد فەریق حەسـەن و کاك عەتـا فائق . ، بەڕێوەبەری ئەو کۆڕە برای شاعیر کاك «بەرزان هەستیار» بوو .

● شانۆ :-

«گەلە گورگ»

لە رۆژی ٩/٧/١٩٨٨دا وە کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد - مەڵبەندی گشتی - سلێمانی : لەهۆڵی سانەوی سەلاحەدین لەپێشکەش کردنی شانۆیی «گەلەگورگ» بەردەوام بوون .

«گەلەگورگ» لە ئەسڵدا چیرۆکێکی مامۆستای چیرۆکنووس «حسەین عارف»ە : هونەرمەندی لاو «شەفیق محەمەد» بۆ شانۆ ئامادەی کردبوو : هەر خۆیشی دەری هێنابوو .

هونەرمەند لەم کارەشیدا : هەروەکو چۆن لە کارەکانی رابوردوویشدا توانیبووی لە میانەی ئامادەکردنێکی زیرەکانەوە بۆ چیرۆکەکەو هەوڵی دۆزینەوەی هێڵێکی درامایی و خولقاندنی کەشێکی نەفسی‌یەوە کارێکی شانۆیی جوانمان پێشکەش بکات . بەهەمان شێوە ئەکتەرەکانیش (بەتایبەتیش سەرەکیەکان) توانیان ئەدائێکی جوانی کاراکتەرەکانیان بکەن .

ئەکتەرەکانی ئەم کارە هونەرییە برێتی بوون لەم هونەرمەندانە :

شەماڵ عەبەرەش - بارام ، شادان فؤاد - ئایش ، محەمەد ئەحمەد ، کەماڵ جەلال ، بورهان عومەر .

کارە هونەریەکانیش بەم جۆرە دابەش کرابوون : بەڕێوەبەری بەرهەم - عەبدول حەمەجوان ، دیکۆرکێش - خالید رەسوڵ ، رووناکی - سەردار خەلیل ، مۆسیقا - دڵشاد ئەحمەد ، خۆشنووس - نەجم هۆگر .

● هونەری تەشکیلی :-

«هونەرمەند ئیسماعیل خەیات و پیشاندانێکی سلاید »

سەر لە ئێوارەی رۆژی ٧/٧/١٩٨٨و لە هۆڵی بەڕێوەبەرێتی چەماوەرو هونەرمەندانی

وەکو چالاکیەکی سەر بە بەڕێوەبەرێتی چالاکی قوتابخانەکان لە سلێمانی ؛ هونەرمەند مامۆستا «ئیسماعیل خەیات» بە پیشاندانێکی سلایدی کۆمەڵە تابلۆیەکی هونەرمەندە شێوەکارەکانی سلێمانی هەڵسا .

هونەرمەند سەبارەت ئەم کارەی خۆی دەڵێت : (ئەمە وەکو یەکەم قۆناغە لە پرۆژەکەمدا کە برێتی‌یە لە وێنەگرتنی کاری هونەرمەندەکان و بێگومان قۆناغەکانی تریش بە دوای ئەمدا دێن بە ئاواتی تەواوکردنی پرۆژەکە) .

هەروەها لەمەر گرنگی‌ی سلایدەوە وتی : (سلاید گرنگی‌یەکی رۆشنبیری‌و ئەرشیفی هەیە لە بواری هونەرە تەشکیلیەکاندا و خۆی لەخۆیدا و لە بزووتنەوەی هونەری شێوەکاری‌ی کوردیدا بوارێکی نوێیە ، ئەم پیشاندانە کاری هونەرمەندە پێشەنگەکان و بەرەی شەستەکان و حەفتاکان و لاوەکانیشی گرتبووە خۆ .

هەروەها جگە لە هونەرمەندانی سلێمانی کاری کۆمەڵێك هونەرمەندانی شارەکانی تری وەکو هەولێر و دهۆك و بەغدادو کەرکوکم پیشان دا بەسیفەتی میوانی لەم قۆناغەی یەکەممدا . بێگومان پرۆژەکە بەردەوام دەبێت و هیوادارم دەزگا رۆشنبیریە کوردیەکانی وەکو ئەمانەتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان و دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی بەم جۆرە پرۆژە رۆشنبیریانە هەڵسن و ئەمەیش دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ چاپکردنی دەلیل و کتێب لەبارەی بەرهەمی هونەرمەندە کوردەکانەوە) .

ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندان و هونەر دۆستان ئامادەی ئەم پیشاندانەی مامۆستا ئیسماعیل بوون و شایانی باسە هەرخۆیشی سەبارەت کارەکان دەدوا .

«پیشانگایەکی تایبەتی»

لە ٢٣/٧/١٩٨٨ە وەو رۆژانی دواییدا و لەهۆڵی گەلەری



کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد مەڵبەندی گشتی ـ سلێمانی پێشـانگایەکی تایبەتی‌ی بۆ هونەرمەندی لاو «ئازاد مستەفا» کردەوە کە تیایدا نزیکەی بیست و هەشت کاری خۆی پیشان دا . .

ـ کاک «ئازاد مستەفا» لە شاری کۆیە لە دایك بووە .
ـ بەشداری‌ی «٥» پێشانگای هاوبەشی کردووە .
ـ ئەمە دووەم پێشانگای تایبەتی‌یەتی .
ـلە ساڵانی ١٩٧٨ تاوەکو ١٩٨٤ لە هونەر دوور کەوتووەتەوە .

## دهۆک مەتین

### « زەلامێ خو مشکانەکری دتەرازیا رەخنێ دا »

ژ چالاکیێت ئێکەتیا نڤیسەرێت کورد ـ تایێ دهۆکێ ، بهەلکفتنا جەژنێت تیرمەها پیرۆز ، کۆرەك بو تیپا شورەشڤان یا شانوویێ هاتە سازکرن بو دان و ستاندنەکا ڤەکری ل سەر شانووگەریا «زەلامێ خو مشکانە کری» ئەڤا کو تیپێ ل رۆژێت ١٤ـ ١٥ـ ١٦/٧/١٩٨٨ ل هولا رێڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەر پێش کێش کری . هێژا فهمی سلمان و زهیر رەڤەندی ئەڤ کۆرە پێش کێش کرن و هێژا بائیز عمر کۆر گێرا .
هژمارەکا باش یا هونەرمەندو ئەڤینداریت شانوویێ و نڤیسەرو رەوشـەنبـیرا تێـدا ئامـادەبون و بگەرمی پشکداری ددان و ستـانـدنێ دا کرن ل سەر شانـووگەر یێ ژلایێ دەرهێنان و زارڤـەکـرنێ و گوتنێ و دیکـوری و مکیـاجی . لایێت باش و سەرکەفتی هاتنە رون کرن ، دیسان لایێت لاوازو کێماسییێت کاری ژی هاتنە بەلی کرن .
ژ برادەرێت پشکداری ددان و ستاندنێ دا کرین :
مکی ئامێدی ـ کریم بیانی ـ جلال مصطفی ـ حکمت ایوب ـ محمد علي ـ ئەڤەو ڤێ کۆرێ نێزیکی دوو سەعاتا کێشا .

### ڤیستیڤالەکا شانوویێ ل دهۆکێ

ژ چالاکیێت ئەمینداریا گشتی یا رەوشنبیری و لاوا ١٩ ـ ٧ ـ ١٩٨٨ ل هولا رەوشـەنبیری جەماوەر شانوویێ یا مەڵبەندێن لاوان ل دەڤەرا کوردستانێ هاتە ڤەکرن ، هژمارەکا تیپێت شانوویێ شانووگە، ئاوایێ ژێری پێشکەش کرن :
١ـ تیپـا مەلبـەندا زاخو : شانووگەریا « خارگێ احمد نوح ، دەرهینانا ، هاشم موسێ .
٢ـ تیپا مەلبەندا لاوێن دهۆکێ : شانووگەریا « ژنێ » نڤیسینـا ، سعـدون العبیـدی ، وەرگێرانا : دەرهێنانا: نورسین . ئەکتەرێت پشکداری دڤێ ش کرین ئەڤێت ژێری بون :عمر علی تمر : زەلام ـ، محمـد ـ٢ـ ، عبـدالعزیز محمد صالح : خودا احمد محمد سلیم : هەلامەت ، لقمان طیب مر، عیسێ : مریێ C ، حکمت ایـوب : مریێ D ،رە گورهەلکەن ، شیروان جمیل : هاریکار ، شوکەت
٣ـ تیپا مەلبەندا شەهید ابراهیم : شانووگەرێ چال » نڤیسینـا : فرحان بولبول ، وەرگێرانا :

برزنجي دەرهێنانا : مؤید محمد فقێ . ئەکتەرێت ژێری ژی پشکداری دڤێ شانووگەریێ دا کرن :
سردار علي ، کەسێ ئێکی ، تەنیا کریم : کەسێ دووێ ، عدنان رۆژ بەیانی ، ناظم شێخانی ، کورس : هونەر مؤید فقێ ، فارس سعید ، فرمێسك مؤید فقێ ، سالار علي ، ئەزوەر عمر .
٤ـ تیپا مەلبەندا لاوێت سلێمانیێ : شانووگەریا « خۆناسەکان » نڤیسینا : محمد رشید فتاح ، دەرهێنانا : سلیمان ابراهیم گەلالێ ژ ئەکتەرێت پشکداری دڤێ شانووگەریێدا کرین :
بهاءالدین نوری احمد : سەعوله ، نزار حمه رشید : فەیمه ، نەوزاد مصطفێ صادق : رێناس ، رێزان : بەرزین ، رێبوار نوری عباس : شەوکەت عبدالفتاح : حمه جلیل ،
عبدالله خیاط : ئاله سامان لطیف : شێخ صدیق ، مەریوان احمد : شریف ، جەزا نوری : وەستا محمد ، ئاوات عبدالله : سوڤ علي ، فەریدون زیرەك : مەریوان مشیر ، نەجات نوری : دراوسێ ، احمد محمود امین : شاگرد ، دلنیا بهاء الدین ، کارزان حمه صالح : منداڵەکان
٥ـ تیپا مەلبەندا شەهید صدیق : شانووگەریا « ئەو مرۆڤەی کە مردن لێ سڵەمیەوە » نڤیسینا د . ابراهیم البصری ، وەرگێرانا : محمود زامدار ، دەرهینانا : زرار محمد مصطفێ .
ژ ئەکتەرێت دەورێت خو دڤێ شانووگەریێدا دیتین : کامران حاجی: یوسف ، دارا عبدالله : حمه ، زکیه علي : پیرەژن (٢) ، خوناو صالح: پیرەژن (١) ، سلام مراد علی : قەساب ، خالد عبدالله : کەس (٢) ، مغدید محمد : کەس (١) ، ابراهیم محمد : کەس (٣) ، لقمان کاك امین: کومبارس ، نەژاد اکرم : رێکخەر ، صلاح علي حمید : رۆژنامه نوس .
٦ـ تیپا مەلبەندا شەهید : شانووگەریا « راوچی » ، نڤیسینا : حیدر عبدالرحمن ، دەرهێنانا : ئاشتی کمال امین ، ژ ئەکتەرێت پشکدار دشانووگەریێ دا : روخوش کمال : دایك ، شعریه نوری : نارین ، ئاراس صالح : پیرە مێرد ، کمال جلال : بەگ ، بەختیار سعید : کوێخا ، بیستون محمد جوتیار ، سەرتیپ صالح دینۆ ، سوران صالح : چەتۆ ، شێرکو محمد : سمکۆ ، احمد ابراهیم : سمه ، هاورێ محمد: پاسەوانی (١) ، جمال نوری : پاسەوانی (٢) ، رێبوار احمد : رەشۆ. ئەڤەو هەژی گوتنێ یه کو دڤێ بەریکانێ دا مەلبەندا لاوێت دهۆکێ ب شانووگەریا پێش کێش کری ، خەلاتێ ئێکێ وەرگرت ، ددویڤدا تیپا مەلبەندا سلێمانیێ خەلاتێ دووێ وەرگرت .

## پێشەنگەهەکا وێنێت فوتوگرافی

بهەلکفتنا بیرهاتنا بیستێ یا شورەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها پیروز، ل ژێر چاڤدێریا هەڤال « طارق کافي فلیح » رازگرێ نهێنێ یێ سەرکردایەتیا تایێ دهۆکێ یێ پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی ، لیژنا رەوشەنبیری یا تایی بهاریکاری دگەل رێڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەرو کەومەلا عیراقی یا وێنێت فوتوگرافی ل پاریزگەها نەینەوا ل رێکەفتێ ٢٠ تیرمەهێ ١٩٨٨ ل هولا رەوشەنبیری جەماوەر پێشەنگەها دەهێ یا هونەرمەندێ فوتوگرافی « نورالدین حسین » هاتە ڤەکرن . ئەندامێت تایێ دهوکێ یێ پارتێ و سەروکێت رێکخراوێت پیشەیی و ملی و هژمارەکا بەر پرسیارا ل ڤێ پیشانگەهێ ئامادەبون کارێت پیشەنگەهێ کاروانێ شورەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەهێ و داستانێت سەرکەفتنێ ل قادسیا صدام ی یا پیرۆز ب ئافراندن تومار دکەن ، دیسان هەلویست ژێهاتی دژیانا شەرکەرا یا رۆژانەدا



پێش چاف دکـەن .هــەر وەها دیمەنێت رند ژباژێرێ دهۆکێ زاخــوو ئامێـدیێ و شینــوارێت کەڤن ل دەڤــەرێ پێشـەنگەه خەملاند بو.

## پروگرامەك بو کومکرنا فولکلورێ کوردی

بەهلکفتنا جەژنێت تیرمەها پیروز ل رێکەفتی ٢١ ـ ٧ ـ ٩٨٨ رێڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەر ل دهۆکێ هێژا دکتور شکریە رســول مێهڤان کر ، کو ل هولا بزاڤێت فێرگەهی کورەك پێش کێش کری ل ژێــر ناف و نیشانێت « پروگرامەك بو کومکرنا فولکلوری » ، هێژا عبدالکریم فندی رێڤەبەریا ڤێ کۆری کر . هێـژایاموحازر دەرگەهێ بابەتێ خو بچەند ئاخفتنەکا سەبارا گرنگیا تورێ فولکلوری بو لێکولینا ژیان و زمان و مێژووا مللەتا ڤەکر . ددویڤدا بزاڤێت فولکلورناسێت جیهانی و رێکێت وان بێت زانستی بو کومکــرن و ڤەکـولینێت فولکلوری و مەرجێت کومکرنێ ل ڤەلەم دان .

پاش ئەڤ رێکێت خارێ بێت کومکرنێ دەست نیشان کرن :
١) کارێ مەیدانی ٢) ئەرشیفات ٣) تومار کرن .
هات و بدرێژی ل سەر ڤان خالا ئاخفت و مشە نمونە بو بیرو راو بوچونێت ئینان .
پشتی هینگێ دەست هاڤێتە بابەتێ خو یێ سەرەکی ئەو ژی کومکرنا فلکلورێ کوردی‌یە .
دکتورێ خویا کر بو جارا ئێکێ‌و ب شێوەکێ زانستیانە تومار کرن و لێکولینێت فولکلورێ کوردی ل سالا ١٩٣٠ ل یەکەتیێا سوڤییەت سەر هلدایە ، « ٤ » مەلبەندێت کوردناسی ل وێرێ هاتنە ڤەکرن بڤی کاری رادبون . نوکە ژی کەرستێ فولکورێ کوردی مشە ل با ڤان مەلبەندا هەیە .
پاشێ کرە بەحسێ مێـژووا تومــارکــرنا فولکوری ل کوردستانا عیراقێ یا کو وێ ژی ل سالێت ١٩٣٠ دەست پێکری ژلایێ اسماعیل حقی شاوێس .
ددویڤدا موحازرێ ناڤێت وان بسپورو رەوشەنبیرێت کورد ل گەل بەرهەمێت وان بو مە خاندن ، ئەڤێت کو دپاناڤا فولکلوری دا دخەبتن . کەم و کورێ کێماسییێت دتەکنیکا نفیسینێت وان



دا دەست نیشان کرن .
دیســان خویــاکــر کو پشتی شورەشێت ١٤ و ١٧ تیرمــەهێ کومکــرنــا فولکلورێ کوردی زێدەتر لێهات هەر وەها دسالێت ١٩٨٠ دا گرنگیەکا مەزن ب کومکرنا فولکلوری هاتە دان ژلایێ دام و دەزگەهێت رەوشەنبیری یێت کوردی .
ل دووماهیێ بکورتی ل سەر کارێت هەرەوەزی بو کومکرن و تومار کرنا فولکلوری ئاخفت و بەلێ کر کو ئەم دڤێ قوناخێ دا پتر پێتڤی ڤی تەرزێ کارینە ژ بەرکو زۆربەیزۆری فولکلورێ مە یێ کوردی هێشتا دسینگێ خەلکی دایە .
ل دوماهیێ چەند برادەرەکا پشکداری ددان و ستاندنێ دا کرن ژوان : حجی جعفــر ـ بائیـز عمر احمد ـ میکائیل ابراهیم ، دیسان هژمارەکا بەرفرەه یا پرسیارا هاتنە کرن و بەرسڤا وان ژلایێ موحازری ڤە هاتە دان .
ژتێبینیێت مە ل سەر بابەتێ دکتورێ هەلبژارتی ، بابەتێ وێ یێ ئەکادیمی بو ، مە حەز دکر پتر یێ « تەطبیقی » با ، نمونێت سەرکەفتی و یێت لاواز بو مە دەست نیشان کربان ژبەرهەمێت فولکلوری یێت هەتا نوکە کەفتینە پەرتوکخانا کوردی ، دیسان وەکو بسپورەك بو مە بەحسێ ڤەکولینێت فولکلوری ل با کوردا کرباو بیرو خو ل سەر دیار کربان .
یا ژهەمیا فەتر ئەو بو ل سەر رێك و مەرجێت تومار کرنا دروست ئاخفتباو بو مە پێچەکێ بەحسێ سەربورێت جیهانی دڤێ رێکێ دا کربان .

# پۆستەی کاروان

ئادرەس : هەولێر : ئامێندارێتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢٠٨٨٢

سۆران حەریری
ئامادەی کردووە

## ● خوێنەرانی ئازیز :

وا گۆڤارەکەتان مۆمێکی دیکەی تەمەنی خۆی دادەگیرسێنێ‌و، پێ‌دەنێتە ساڵی حەوتەمی دەرچوونی‌یەوە، دوای ئەوەی شەش ساڵی تەواوی لەگەڵ هەموو نووسەرو خوێنەرێکی ئازیزدا بەسەربردوو، لەو ماوەیەدا توانی «٦٨» ژمارەی تێرو تەسەل لەهەموو ڕوویەکی ئەدەبی‌و هونەری‌و ڕۆشنبیری‌یەوە پێشکەش کتێبخانەی کوردی بکات و، خەرمانی ووشەی ڕەسەنی نەتەوەکەمان دەوڵەمەندتر بکات و، زیاتر بەرەو پێشەوەی بەرێ‌و، چاکتر بیبوژێنێتەوە ..

## ● خوێنەرانی هێژا :

هەر بەم بۆنەیەوە پیرۆزبایی‌یەکی گەرمتان لێ‌دەکەین و، داوای لێبووردنتان لێ دەخوازین گەر لەم شەش ساڵەدا گۆشەکەمان لەگەڵ خواست و ئارەزووی هەندێکتان نەبووبێ؛ وەیا لە ئاستی بیرکردنەوەی ئێوەدا نەبووبێ‌و جارنا جارێکیش لەبەر هەر هۆیەك بووبێت دڵگیری کردبن ، لەهەموو حاڵەتێکدا ئێمە مەبەستمان خزمەتکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی‌یەو بەس ، لەوانەیشە هەندێ برادەری ناشارەزا لە کاروباری ڕۆژنامەنووسیی‌دا بیرتەسکانە بۆ مەسەلەکە چووبێت و «تفەنگی بەتاریکی‌یەوە نابێت» کە ئەمەیشیان هەقی خۆیەتی؛ بەڵام هەردیسان ئێمە مەبەستمان ئەوەبووە هەموو خوشك و برایەکی نووسەر، بەشارەزاو ناشارەزایانەوە لەوە بەئاگابن کە ئێمە نامەو بەرهەمەکانیان پشت گوێ ناخەین و، ڕێزیان لێ‌دەگرین ، ئەمە جگە لەوەی کە دەمانەوێ ئەو پەیوەندی‌یە پڕ لە وەفاداری‌و دڵسۆزی‌یەی نووسەران و خوێنەران، بەتایبەتی ئەوانەی تازە پێ‌دەگەن و دێنە ئەم مەیدانەوە، بەتینتر بێ‌و، بەردەوام بێ‌و نەپچڕێ، ئەڵبەتە لەم ڕووەشدا ڕەچاوی زۆر ڕێ‌و شوێنی تایبەتیمان کردووە، تا بۆمان لوابێ هەوڵی ئەوەمان داوە دڵی کەسمان لێ‌نەرەنجێ، جا گەر خوشکێك یا برایەکیش لەوانەی بەرهەمەکانیان وەبەر گۆشەی «پۆستە» کەوتبێ‌و، نەختێ دڵگیر بووبێ، چ لەبەر ئەوەی بەرهەمەکەی نەشیاوە بۆ بڵاوکردنەوە، یا لەبەر ئەوەی لەشێوەی وەڵامدانەوەکەماندا نارەحەت بووە، ئەوە هەردیسان داوای لێبووردن دەکەین و، دەڵێین :**«ئێوە برا گەورەی ئێمەن و، ئەڵبەتە هەموو کات و ساتێکیش برا گەورە دڵی فراوانەو لێبووردەیە»**، دووبارە لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستیماندا بۆ هەموو خوشك و برایەکی نووسەر کە لەگەڵ «کاروان»دا ئاشنان و دۆستایەتی دەکەن ، **دەڵێین** : کاروان موڵکی هەموو لایەکەو، بۆ خزمەتی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی هاتووتە کایەوە ..

ئێستاش فەرموون لەگەڵ وەڵامدانەوەی بەشێکی دیکەی ئەو نامەو بەرهەمانەی بوونەتە میوانی «پۆستە»و، شیاوی ئەوە نەبوونە لە گۆشەکانی تری «کاروان»دا بڵاوبکرێنەوە، لەبەر ئەو هۆیانەی لەگەڵ وەڵامەکاندا باسیان دەکەین .. دووپارە هیواخوازین لێمان زویر نەبن و، دڵتان گەرد نەیگرێ ..

**● بۆ کاك «خالد عمر معروف» لە سلێمانی‌یەوە :**

کاکی برا ئەو چیرۆکەی بەناونیشانی «بووکە شووشە»وە

بۆت ناردبووین ، بەتەواوی پێنەگەیشتووەو، هێشتا بەچاکی کامڵ نەبووە، بۆیە دەبێ ببووری کە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو

● **بۆ کاک «شوان عثمان» لە شەقڵاوە :**

براله بابەتێکی بێناونیشانت بۆ ناردووین ، بەداخەوە شیاوی ئەوە نەبوو لە «کاروان»دا بڵاوی بکەینەوە، خۆزگە لەمەودوا کە بابەتێکت دەنارد ناونیشانێکی تەواوو رێکوپێکت بۆی هەڵدەبژارد .

● **بۆ برای ئازیز «رەنجدەر صالح» هەڵەبجەیی :**

برای باش پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ دڵسۆزیو هاوکاریکردنت لەگەڵماندا، بەڵام داخمان ناچێ کە ئەو چیرۆکەی بۆت ناردبووین بەناونیشانی «کوا دادپەروەری» گەلێ کەم وکورتی تیادا بەدی دەکرا، بۆیە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو.

● **کاکە غازی جەبار مەعروف عاڵلایی :**

سوپاس بۆ هاوکاری برایانەت ؛ بەڵام کاکەگیان «حەیرانی دەشتی دزەیی» بەو شێوەیە کۆناکرێتەوە، کە بەرێزتان کردوویەتی، دووبارە سوپاست دەکەین و، هیوادارین زیاتر بخوێنیتەوەو چاکتر لەم بوارەدا شارەزایی پەیدا بکەیت .

● **بۆ برای هێژا «رزگار رشید بامرنی» :**

براله ئێمە زۆر جاری دیکەش گوتوومانە کاتێ کە بابەتێکت بۆ رۆژنامەیەك یا گۆڤارێك نارد دەبێ چەند خاڵێك پەیرەو بکەیت ، یەکێك لەو خاڵانەی کە تۆ فەرامۆشت کردووە ئەوە لە هەردوو دیوی کاغەزت نووسیوە، ئەمەیان یەکێ، **دووەم** : چیرۆکە فۆلکلۆریەکە شت کە بە ناوی «وا دکەلت» بوو، شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو، ببوورە .

● **بۆ کاک «دڵشاد مصطفی وەسانی» :**

برای بەرێز، ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین کە فۆلکلۆر رەگەزێکی دەوڵەمەندو زیندووی نەتەوەکەمانە، هەربۆیەشە یەکێك لە گۆشە سەرەکییەکانی «کاروان» فۆلکلۆرە؛ بەڵام هەرگیز بواری ئەوەمان نەداوە شتی یەکجار سادەو ساکار بکەوێتە سەر لاپەرەکانی، خۆزگە هەوڵی باشترو سەرکەوتووترت دەدا .

● **بۆ خوشکی ئازیزمان «دەریا» .**

پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ ئەو هاوکاریو پشتگیرییە پر لە دڵسۆزییەت بۆ گۆڤارەکەمان؛ بەڵام دەبێ ببووری کە ئێمە لە بریاری خۆمان پاشگەز نابینەوەو، هەر بابەتێکی ناوو ناونیشانی تەواوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبێ، با بابەتێکی باش و سەرکەوتووش بێ ئەوە بێ سێو دوو وەپشت گوێ دەخرێو بڵاوناکرێتەوەبۆیە دەبێ بمان بەخشیو، دووبارە سوپاست دەکەین .

● **کاکە ناصر حسن حمد خۆشناو لە گەرەکی خانەقای هەولێر :**

سوپاست دەکەین کە دووەم جارە نامەمان بۆ دەنێری؛ بەڵام دەبێ ببووری کە ئەو شیعرەی بەناوی «پاڵەوانێ»وە بۆت ناردووین زۆری ماوە ببێ بە شیعر، خۆزگە بە پەلە نەدەبووی لە بڵاوکردنەوەدا .

● **بۆ کاک «ن . ص . محمد» لە هەولێرەوە :**

کاکی برا ئەو کورتە چیرۆکەی بەناوی «کەسێکی وون بوو»موە بۆت ناردووین، بەداخەوە شیاویبڵاوکردنەوە نەبوو، بمان بەخشەو چاوەروانی بەرهەمی دیکەتانین ..

● **بۆ کاک «ن . احمد خۆشناو» لە گەرەکی تەیراوەی هەولێر..**

برای ئازیز پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ ئەو نامە پر سەرنجە جوانانەی تیایدا وەدەرت خستون ؛ بەڵام بۆ ئەو شیعرەی لەگەڵیا ناردووتە بەناوی «بێ ناونیشان» ببوورە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو.

● **کاکە « ئاوات حسن امین » لە پارێزگای نەینەوا...**

گیانەکەم ئەو شیعرەی بەناوی « تۆ ناونیشانی «دواین شیعریت » هێشتا زۆری ماوە ببێ بە شیعرێکی سەرکەوتوو ،

ببووره شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، خۆزگە زیاتر هەوڵت دەداو ، باشتر لە هونەری شیعر شارەزا دەبووی ، ئەوسا بۆت دەردەکەوت کە شیعری سەرکەوتوو چۆنەو ، چ جۆرە شیعرێکیش لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاو دەکرێتەوە .

**● بۆ خوشکە « ن » عەلی سەعید »**

خوشکی نازدار پێشەکی سوپاسێکی گەرمت دەکەین بەرامبەر بە هاوکاری کردنت لەگەڵ گۆڤارەکەماندا بۆ شیعرەکەیشت « بولبول و گوڵ » دەبێ ببووری چونکە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، چاوەروانی بەرهەمی دیکەتانین و ، هەربژیت .

**● بۆ ئەو نووسەرەی بەناوی « بێ‌لانە »**
**شیعری « منالەکان » ی بۆ ناردووین ..**

کاکی برا ، ئێمە گەلێ جاری دیکەش دووبارەمان کردۆتەوەو. گوتوومانە هەر بابەت و نووسینێك گەر ناوی نووسەرەکەو باوك باپیری بەسەرەوە نەبێ لەگەڵ ناونیشانی تەواودا ، ئەوە بێ سێ‌و دوو دەخرێتە لاوە ، ئیتر هیوادارین تۆش و هەموو برایەکی دیکە ئاگاداری ئەم لایەنە بن و ، لەمەودوا دووبارەی نەکەنەوە.

**●بۆ ئەو نووسەرانەی ئەم باسانەی خوارەوەیان بۆ ناردووین:**

« هەندێ حاڵەتی هەنگاوتنی چاو، صرخه من مهاباد، دوو بزن لەسەر گردەکە ، روونکردنەوەیەك دەربارەی چەوسانەوەی ئافرەت لە کوردەواری دا ، ماڵی هەتیو ، ئافرەت لە روانگەی کۆمەڵدا » .

برا ئازیزەکانم سوپاستان دەکەین بۆ ناردنی ئەم بەرهەمانەتان و ، هەوڵدانتان بۆ دەوڵەمەندکردنی گۆڤارەکەتان ؛ بەلام ئەوەی مایەی داخە ئەوەیە ، کە باسەکان و نووسینەکانتان گەلێ سادەو ساکار بوون و بۆ ئەوە نەشیان بڵاویان بکەینەوە ، بەهەر حاڵ چاوەروانی هەوڵ و کۆششی بەردەوامی هەموو لایەکتانین و هەربژین .

**●بۆ ئەو برا بەرێزەی ئەم شیعرانەی خوارەوەی بۆ ناردووین:**

**« سێ پارچە شیعر ، جیاوازییەکی دوور ، پێش سەرەتا »**

برای بەرێز : دەبێ بمان بووری کە هەرسێ بەرهەمەکەت بۆ ئەوە نەشیان لە « کاروان » دا بڵاویان بکەینەوە ، خۆزگە شیعری داهاتووت باشتر دەبوون .

**بۆ کاك « شیرزاد امین باغەوان »**
**لە شۆریجەی کەرکووکەوە ..**

براله سوپاست دەکەین بۆ ئەو تابلۆیەی بەدیاری بۆ « کاروان » ت ناردوو ؛ بەلام دەبێ ببوری کە نەمان توانی سوودی لێ وەربگرین بۆ بەرگی « کاروان » چونکە لە رووی هونەرییەوە سەرکەوتوو نەبوو ، دووبارە سوپاس ..

**● « خۆزگە » ؛ ناونیشانی شیعرێکە ، کاك جەعفەر حەمید بەرزنجی لە شاری کەرکووکەوە بۆی ناردووین ..**

کاکە گیان ؛ سوپاسی دڵسۆزیو وەفاداریت دەکەین ، پێشت رادەگەیەنین کە ئێمە هەردەم هەوڵی ئەوە دەدەین کە نەشیش بسووتێ‌و نە کەباب ؛ بەلام گەر شیش و کەبابەکە بەرلەوەی بگاتە دەستی ئێمە سووتابن ، دەبێ ئێمە چیمان بۆ بکرێ ، بەهەرحاڵ دەبێ بمان بەخشی کە شیعرەکەت شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، هیوادارین کۆششی زیاتر بکەیت بۆ ئەوەی لە دووا رۆژێکی نزیکدا بەرهەمی باشترمان بۆ بنێری.

**● بۆ کاك « سەرتیپ حمە نامۆ » لە کەرکووکەوە**

برای باش پێشنیارەکانی نێو نامەکەت گەلێ جوانن ؛ بەلام دەبێ خۆشت لەوە بە ئاگابی کە هەموو قسە ریزکردنێك بە شیعر لە قەڵەم نادرێ و ، ناچێتە نێو خانەی شیعرەوە ، بۆیە ناچارین پێت بڵێین ، ببوورە « شیعرەکەت » هێشتا لە سەرەتای رێگایەو، گەلێ قۆناغی ماوە ببێ بە شیعر ، ئەڵبەتە ئەمەشیان بە پەلەکردن نابێ ؛ بەڵکو دەبێ بەهێمنی و لەسەر خۆیی ئەو قۆناغانە ببری ؛ کە شارەزاییو خوێندنەوەی زۆر لە پێشەوەی هەموویانەوەیە .

**● بۆ خوشکە « ئەژین داماو » لە کەرکووکەوە ..**

خوشکی ئازیز لەگەڵ رێزو سوپاسماندا بۆ هاوکاری کردنت ، دەبێ ببووری کە شیعرەکەت تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو ، خۆزگە بابەتی سەرکەوتووترت بۆ دەناردین و ، ناوو ناونیشانی خۆشت بە تەواوی دەنووسی ئەمەیش کۆپلەیەکی شیعرەکەتە :

● من فرمێسکم ●

من فرمێسکم
لەگەڵ ژانا لە دایك بووم
لەگەڵ ژینا پەروەردە بووم
کاتێ نیگای دڵدارەکان
لەسەر پەڕەی خامەو ، دڵیان
خۆشەویستی دەنەخشێنن
لە بیلبیلەی چاوی عیشقا
منی فرمێسك ، دەخولقێنن
منی فرمێسك ، دەخولقێنن

★★★

**● بۆ ئەو نووسەرە بەڕێزەی ئەم بابەتەی بۆ ناردووین : «لە نێوان هۆنراوەی کلاسیکی و سەربەست دا» ..**

کاکی برا باسی لەم جۆرە بابەتە هی ئەوە نی‌یە بە « ۳ » لاپەرەی دەفتەر لە بارەیەوە بنووسرێت ، بەڵکو هێندە قوڵ و فراوانە بە سی و چل لاپەرەیش تەواو نابێ ، ئەمەیان لە لایەك ، لە لایەکی دیکەشەوە وادیارە زۆر بە پەلەبوویت تەنانەت بۆت نەکراوە ناوی خۆشت بنووسی ، ئیتر نازانین تۆ گلەیی لە ئێمە دەکەی ، ئایا ئێمە گلەیی لە تۆ بکەین کە نووسینەکەت شیاوی بڵاو کردنەوە نەبوو.

**● بۆ ئەو بەڕێزانەی ئەم چیرۆکانەیان بۆ ناردووین : «گرگرتنی لەشە قامیشیەکە ، ژیان ، دەنگێ بەرگوێت کەوت ، دوو شەریك ، تۆڵە ، بەلێ قوربان» ..**

برا خۆشەویستەکانم ، سوپاستان دەکەین بۆ بەشداری کردنتان لە پشتگیری کردنی گۆڤارەکەماندا ؛ بەلاّم دەبێ ببوورن کە چیرۆکەکانتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ؛ کاشکێ هەوڵی زیاترتان دەداو ، بەرهەم و بابەتی چاکترتان بۆ دەناردین تاوەکو بتوانین سوودیان لێ وەربگرین و ، بڵاویان بکەینەوە . دووبارە سوپاس ..

**● بۆ کاك « مهدی قەرەچوغی » لە هەولێرەوە**

ئەم برا ئازیزەمان شیعرێکی بەناونیشانی « پایزە عیشق » ەوە بۆ ناردووین ؛ بەلاّم بەداخەوە شیعرەکە گەلێ سادەو ساکار بوو، بۆیە داوای لێ بووردن لەم برا بەرێزە دەکەین و ، هیوا خوازین لە رۆژانی داهاتوودا شیعری چاکترمان بۆ بنێرێ تاوەکو بتوانین پێشکەشی خوێنەرانی « کاروان » ی بکەین و ، گۆڤارەکەمانی پێ دەوڵەمەندترو رازاوەتر بکەین ..

**● بۆ کاك «ع . ع . محمد» لە رانیەوە ..**

برای ئازیز بەخۆشحاڵی‌یەکی زۆرەوە شیعرەکەتمان خوێندەوە کە بە ناونیشانی «دوا هەوارگە» وەیە، بەلاّم ئەوەی راستی‌بێ شیعرەکە تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو، هیوادارین لەمەودوا بەرهەمی باشترو نایابترمان بۆ بنێری‌و، پێشەکیش سوپاست دەکەین ..

● دوا هەوارگە ●

بۆ نازانی ...؟
پەپوولەی هیواو ئاواتم
بەبێ تۆ کزو داماوە ...!
خۆشەویستە نازدارەکەم
دەسا وەرەو ..
وەك رێژنە بارانێکی بەهاری
بەسەر هەواری عەشقم دا
دابیارە ..

●★●★●

**● بۆ کاکە «ف . ص . صالح» لە شاری سلێمانی‌یەوە ..**

کاکە گیان ، ئەو شیعرە پێنج خشتەکی‌یەی لەسەر شیعرە ناودارەکەی «شاکاری گەردوون»ەوە بۆت ناردووین پر بەدڵ حەزمان دەکرد بڵاوی بکەینەوە ؛ بەلاّم دەبێ بمان بەخشی کە لەرووی هونەری‌یەوە سەرکەوتوو نەبوو ، بۆیە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو . خۆزگە هەوڵی ئەوەت دەدا شیعری بەپێزو سەرکەوتوترت بۆ دەناردین و، ئێمەیش پێشەکی سوپاست دەکەین ..

**● بۆ ئەو برا ئازیزەی پەخشانی «دوای مردنی تۆ»ی بۆ ناردووین ..**

برای بەرێز سوپاست دەکەین بۆ هاوکاری‌و دۆستایەتیت لەگەڵماندا ، بەتایبەتی کە بەردەوام نامەو نووسینمان بۆ

دەنێری ، بەڵام دەبێ ببووری کە ئەو پەخشانەی بۆت ناردووین سادەو ساکاری‌یەکی ئاشکرای بە سیماوە دیارە ، جگە لەوەی کە بابەتـەکـە لەگـەڵ ڕێبـازی بڵاوکردنەوە لەگۆڤارەکەماندا نەدەگونجا ، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و هەربژیت .

● **بۆ کاك «ئا . بابان» لە «قەڵادزێ»وە ..**

براکەم شیعری «گرەوی ئەوین» کە بۆ «کاروان»ت ناردووە ، زۆر لاوازە و هێشتا ماویەتی ببێ بە شیعرێکی کامڵ و خۆگرتوو، بۆیە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو هیواداریین زیاتر بخوێنیتەوە ، تاوەکـو باشتـر لە هونـەری شیعر نووسیندا شارەزا بیت و ، بەرهەمی ڕازاوە پێشکەش بە خوێنەرانی کورد بکەیت .

● **بۆ کاك «ا . علي . محمد» لە شاری سلێمانی‌یەوە ..**

برای ئازیزم ، لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستیمان بۆ هەوڵ و کۆششی دڵسـۆزانـەت لە بواری دەوڵەمـەنـد کردنی شیعـرو ئەدەبیـاتی نەتـەوەکـەمان و بەسەرکردنەوەی کەڵە شاعیرانی کورددا ؛ بەڵام داخمـان ناچێ کە ئەو شیعرەی بەناونیشانی «کـامەرانی مەزن»ەوە بۆت ناردووین نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ، خۆزگـە شیعـری چاکتـرت بۆ دەنـاردین تاوەکـو پێشکـەشی خوێنەرانی گۆڤارەکەمانی بکەین و ، سوپاست دەکەین .

● **بۆ «لالەی شەو» لە شاری سلێمانی‌یەوە :**

لالە گیـان ، پێشـەکی ئەو شیعرەی لەژێر ناوی «بڵێن پیرۆزبێ»وە ، بۆت ناردووین گەلێ سەرپێی‌یەو ، بۆ ئەوە ناشێ لە «کـاروان»دا بڵاوی بکەینەوە ، ئەمە جگە لەوەی کە دووەم جارە بەناوی «لالەی شەو»ەوە نامەمان بۆ دەنێری ، بێ ئەوەی ناوو ناونیشـانی جەنـابتان بزانین ، وەك بڵێی ئێمە وەکالەتی دایەرەی نفووسمان هەبێت و ، گورج ناوەکەت بزانین ، براگیان گەر نەختێ خۆت ئەزیـەت بدەیت و ، هەردوو ژمارەی «١٤ و ١٥»ی گۆڤارەکەمان بخوێنیتەوە ، بەچاکی لەو مەرجانە دەگەیت کە پێویستن بۆ بڵاوکردنەوە .. بەهەرحاڵ هیواداریین لەمەودوا ئاگاداری ئەم لایەنە بیت ..

● **بۆ کاك «رزگار علي عبدالرحمن» لە شاری کەرکووکەوە ..**

کاکـەگیـان ئەو بەرهـەمـەی بەزمانی عەرەبی‌یەوە بۆت ناردووین ، گەلێ ساکـار بوو ، جگە لەوەی کە لەگەڵ ڕێبازی بڵاوکـردنـەوە لە گۆڤارەکەماندا نەدەگونجا ، بۆیە دەبێ بمان بەخشی‌و سوپاست دەکەین ..

● **بۆ کاکـە «نـەوزاد عزیـز محـمـد أمـین» لە شاری سلێمانی‌یەوە ..**

براله ئەو باس و پێشنیارو سەرنجانەی بەناوی «چەند سەرنجێ لەمەڕ کاروان»ەوە بۆت ناردووین مایەی شانازی ئێمەن ، کە برایـەکی خوێنـدەواری وەکـو بەڕێـزتـان هێنـدە بەتـەنـگ «کاروان»ەوەیەوحەز بەوە دەکات زیاتر هەنگاوهەڵ نێ‌و ، باشتر بەرەو پێشـەوە بڕوات و گەشـەدارتـر بێ .. کاکـە گیـان سەرنجـەکانت بەدڵێکی فراوانەوە قەبووڵ دەکەین و ، ئەوەی بۆمـان ئەنجـام بدرێ دریغی ناکـەین و ، دووبـارە ڕێـزو خۆشەویستیمان بۆ هەموو براو خوشکێکی دڵسۆزە کە سەرنج و پێشنیـازی بەسـوودمـان بۆ دەنێرێ ، تاوەکو گۆڤارەکەمان دەوڵەمەندتر بێ‌و سەرکەوتووتر دیاربێ ..

● **بۆ ئەو دوو برا ئازیـزەی ئەم دوو شیعـرەیـان بۆ ناردووین : «نەکەی گیانە ، ڕازی بەندمیەك» ..**

براینـە پڕ بەدڵ سوپـاسـتـان دەکـەین کە بەم دوو شیعـرە گۆڤارەکەمانتان بەسەرکردۆتەوە ؛ بەڵام دەبێ بمان بەخشن کە هەردوو شیعـرەکـە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و ، هەربژین ..

● **دوا بابـەتی ئەم جارەی گۆشـەکـەمـان شیعـرێکە بە ناونیشـانی «ڕێگـای نیگـەرانی» کە کاك «سـتـار احمـد عبدالرحمن» لە شاری کەرکووکەوە بۆی ناردووین ..**

پێشـەکی سوپـاسی کاك ستار دەکەین و ، هیواداریین بەردەوام نامەو نووسینمان بۆ بنێرێ ؛ بەڵام بۆ ئەم شیعرەی ، ئەوە دەبێ بمان بووری کە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو .. خوزگە شیعری سەرکەوتووتری بۆ دەناردین ..

**لەکۆتایی گۆشەی ئەمجارەی «پۆستەی کاروان»دا دووبارە ڕێزو دڵسۆزی‌و خۆشەویستیمان بۆ هەموو ئەو براو خوشکـە ئازیـزانـەی بەردەوام گۆڤارەکەمان بەسەر دەکـەنـەوەو ، نامـەو نووسین و بەرهەمی خۆیانمان بۆ دەکەنە دیاری ، ئیتر تا ئێرەو ، تا گۆشەیەکی تری ژمارەی دادێ هەر شادو سەرفرازبن و ، هەربژین .**



# كاروان

مجلة ثقافية شهرية ، تصدرها الأمانة العامة لأدارة الثقافة والشباب باللغتين الكردية والعربية .

رئيس التحرير
محمدأمين محمد أحمد

نائب رئيس التحرير
حسين رشواني

٦٩
تشرين الاول والثاني
١٩٨٨

السنة السابعة

في هذا العدد



العنوان : اربيل الأمانة العامة للثقافة و الشباب ـ مجلة كاروان ـ تلفون « ٢٠٨٨٢ »

# متى يفيقون ؟

لاشك أن الأحداث الكبرى التي تخلف وراءها المآسي والفواجع في الحرث والنسل وبالرغم عما تحدث من اغوار عميقة من الآلام في النفوس وتهز الوجدان والمشاعر، وقد تمتد آثارها الى أجيال متعاقبة الا انها بجانب ذلك تفرز عبراً ودروساً قد تكون في فوائدها ونتائجها مايخفف مما تركتها الآلام والخسائر .

واذا طبقنا هذه البديهية على الخمينيين وموقفهم الطائش العدواني في فرضهم حرب الثماني سنوات على العراق المسالم المكافح، فاننا سوف نخرج بأستنتاج واحد فيما يخص الخمينيين وما يسلكونه من المناورات والتعنت والمغالطات وخلق المعوقات في المفاوضات المباشرة مع الجانب العراقي لكي لاتصل المفاوضات الى حل شامل عادل يؤدي الى علاقة جوار متسمة بالأحترام المتبادل بين الطرفين لكل مايخصهما حسب الاعراف الدولية .

وذلك الأستنتاج هو ان الجانب الايراني في تغابيه وركوبه موجة الأوهام يبدو كأنه قد إنطمست مواقع التفكير في دماغه فخلت من المنطق الصحيح والعقل المدرك للعلاقات الحتمية بين الأسباب والمسببات فتعشعشت فيها الأوهام المتوارثة والاحقاد المتراكمة وأحلام اليقظة المريضة ، فتعامت عن الواقع الماثل أمام العيون وركبت أمواج الغرور الطائش الطامح بالتوسع على حساب الغير المبنى على حسابات مغلوطة تدغدغ مطامعها في العراق والخليج العربي.

وفي كل ذلك كانت الخمينية متكئة على قوة خارجية شريرة عابثة بمقدرات الشعوب ومصالحها مخططة لضرب بعضها ببعض ليتسنى لها تكريس تخلف تلك الشعوب وإيقاف عجلة تطورها في ميادين الحياة ليبقى مجال إستثمار لها واستنزاف طاقاتها لمصالحها .

فكانت تلك القوة تدفع الخمينية حثيثة تمنيها بالانتصار على العراق وتعدها بمد أسباب القوة والدعم اللانهائي حتى النصر الاخير .

ولم تأل تلك القوى في رفد الخمينية بمستلزمات

الحرب جهداً سراً وعلناً طيلة سنوات الحرب ومع كل ذلك استطاع العراق القوي المقتدر بمخزونه اللانهائي الذي وفره القائد العبقري صدام حسين حفظه الله، بما يوفر مستلزمات الحرب وامتلاك أسباب القوة والأقتدار بما أذهل العالم وخيب الخمينيين ومن وراءهم من قوة الشر، حيث اناخ الخمينين على ركبهم في أوحال الهزيمة وأجبرهم على قبول قرار هيئة الامم المتحدة رقم (٥٩٨) بعدما تعنت الخمينييون في قبول القرار المذكور سنةً كاملة .

لو كان الخمينييون يحوزون قليلاً من البصر والبصيرة كان عليهم ان يراجعوا الصفحات السود، التي ملؤها بالخزي والعار وسجلوا فيها للشعوب الأيرانية الهلاك والدمار، وماحصدوا فيها غير الخذلان والأندحار وتجرع غصص الذل والخيبة والأحباط، وتهاوت قصور الأماني والأحلام الكاذبة على أرض الواقع فتهشمت وتبعثرت ، وان أسباب الدعم والقوة من مستلزمات الحرب التي تلقوها من القوى الشريرة الدافعة بهم الى هذا المهوى السحيق قد تحولت الى سراب لايطفئ الظما .

وكان عليهم أن يفيقوا على الواقع وان يبدأوا من الموقع الذي وصلوا اليه وأستقروا فيه بعد وقف اطلاق النار حين أجبروا على قبوله مرغمين مضطرين للأبقاء على حياتهم بعد ان فقدوا كل الأمكانيات والمستلزمات لأدامة النزال في ساحات الوغى وجبهات الحرب بفعل الضربات المتوالية المتصاعدة من أيدي القوات العراقية الباسلة .

وكان عليهم ان يقروا بأنهم حين يجالسون الوفد العراقي أنهم مهزومون والعراق منتصر ، ولو ان العراق لايريد ان يجعل موقفه هذا مسوغاً ومبرراً للكسب غير المشروع وادعاء حقوق ليست ثابتةً له، حيث ان العراق لايطمع في هذه المفاوضات سوى استرجاع حقوقه المهضومة تلك الحقوق التي تستند الى التاريخ والواقع والاعراف الدولية .

وكان على الخمينيين ان يتركوا الأساليب الملتوية وصيغ السفسطة والمناورة والمكابرة وان يتركوا الأنتفاخ الكاذب ويتعاملوا بحجمهم الحقيقي الذي وضعهم فيه العراق العظيم .

وان لاينساقوا مرةً أخرى وراء الاماني الكاذبة التي يزينها لهم الشياطين سواء كان شيطاناً اكبر او أصغر أو أصفر أو أحمر أو أسود، لأنهم أعجز من ان يؤثروا على العراق المنتصر وقائده الهمام الذي قاده في معركة قادسية صدام المجيدة بالأمكانيات العراقية الذاتية وهذه الأمكانيات لاتزال في ازدياد كما ونوعا، وقد يكون شياطين الخميني قد باشروا بما لديهم من الاحابيل سواء لأثارة الضجيج والصخب التي قامت بها امريكا ومن يسير في ركابها من بعض الدول، أو بتوقيت اطلاق القمر الصناعي الأسرائيلي اثناء المفاوضات المباشرة بين العراق وايران، أو بالتآمر السوري الأمريكي المشترك على لبنان أو بما تنشره وسائل الاعلام الواقعة تحت تأثير الصهيونية العالمية للتشويش على جو المفاوضات وصرف الأنظار عن الأنتصار العراقي الحاسم ان كل ذلك لايجدي لغرض التأثير على العراق وعلى تمسكه بحقوقه الشرعية الثابته وعلى اصراره على استخلاصها كاملة غير منقوصة ، وان وضع العصا امام عجلة سير المفاوضات ، ومحاولة عرقلتها أو دفعها الى الطريق المسدود لتعطيل لغة الكلام والحوار واضطرار العراق للبحث عن البديل والأختيار الآخر، فأن عاقبة ذلك تكون وخيمة على الايرانيين .



رئيس التحرير

قصة كردية

# عيد أرجواني

قصة

مصطفى صالح كريم



ترجمة

محمدصابر محمود

بقع السحاب ، كانت في طريقها إلى النصول، والأنقشاع . شيئاً، فشيئاً بدأت السماء الزرقاء ، تسفر عن وجهها المشرق الوضاء . كانا يقتعدان كرسيين ، أمام باحة دارهم . أما رفيقاهما الآخران ، فهما مازالا راقدين على فراشهما في الداخل هذه هي السنة الثالثة ، لهؤلاء الأربعة ، الذين قدر لهم أن يعيشوا سوية في هذه المدينة . غداً هو يوم (عرفات[1]) ، ولسوف يغادرون فيه هذه المدينة .. مصفقين بأجنحتهم ، عائدين إلى مدينتهم .

(شيْركو) الذي كان أصغر الأربعة سناً ، رفع رأسه ، وقد ارتسمت على شفتيه ابتسامة مجنحة !!

صديقه (آرام)، تنبه ـ بطرف من لاحظته ـ الى تلك الابتسامة .. غير أنه ، ومن دون أن يحرك ساكناً ـ نقل ناظريه ثانية إلى السطر الذي وقف عنده ،على إحدى صفحات الرواية التي بيده. كان يعرف جيداً ، كم هو مبلغ الغبطة التي تغمر قلب (شيْركو) ، لهذه السفرة التي ينوون القيام بها غداً .. «ليس ممن يلام على ذلك .. أنه لايزال عريساً ،حديث العهد بالزواج، ولم يهنأ بعروسته ، بمافيه الكفاية .. إنني لمتأكد من أنه ، سوف يبكر في النهوض غداً صباحاً .. وبعد أن يحلق ذقنه ، ويخدر لنا الشاي ، يبدأ بازاحة البطانيات من على أجسادنا ، واحداً بعد الآخر، وهو يحثنا على النهوض قائلاً :ـ أحبائي ،أدامكم الله .. أماكفاكم النوم .. استيقظوا .. فلنستعجل لئلا يفوتنا الوقت ، فنتأخر .» .

★ ★ ★

عندبدء السفرة ، كانت الأحاديث الحلوة ، والضحكات المرنة ، وما تبثه القلوب من لواعج الشوق ، والحنين تبدد هموم الطريق الطويل . غير أنه ـ بمرور الوقت ـ أخذت أحاديثهم تلك تفقد حرارتها ، شيئاً ، فشيئاً لتدب في حلاوة كلماتهم ، وطراوتها برودة الجفاف ، واليبس .. الى أن أطبق عليهم الصمت .

قال (هاوار) ، وهو يزفر زفرة حرّى عميقة :ـ

ـ بالله عليكم .. هل كنا بحاجة إلى أن نجشم أنفسنا عناء هذا السفر ؟ .

بعدما ران على وجه (شيركو) ظل تقطيبة ، فتقلصت على إثرها أساريره قليلاً ، أجابه :ـ

ـ سامحكم الله .. أو لا تريدون ، أن نعود إلى بيوتنا ، حتى في الأعياد !؟ .

ـ ياعزيزي .. أي عيد هذا الذي تتحدث عنه ؟ .. وأي مذاق يبقى للعيد ، إذا كانت القلوب مكلومة ، تسكنها الهموم !؟

(بايز) الذي كان مايزال ساكتاً ، إلى هذه اللحظة ، بادر قائلاً :ـ

ـ ولربما ـ نحن أيضاً ـ نبغي من وراء عودتنا تخدير أنفسنا ، مثل أولئك الذين يعانون من الأرق ، فتراهم يلجؤون إلى معاقرة الخمرة ، لتنعم أجفانهم بقليل من النوم .. وإلا ...

بتر (آرام) عليه كلامه :ـ

ـ وإلا ، فلسنا نبغي من وراء عودتنا أن نهنأ ، بالأكلات الشهية ، التي تزدان بها موائد العيد في ديارنا !! ..

وما لبث أن أردف مع نفسه :ـ «إن العيد الذي تكون هداياه المآتم ، والمناحات دوما ...» وقبل أن يكمل الشطر الثاني من

